تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
ENDESE
پرۆژەی نامە ئاکادیمییەکان
پەیوەندییە سیاسییەکانی
نێوان هەرێمی کوردستان و دەوڵەتانی دراوسێ
ئێران و تورکیا و سوریا
١٩٩١-٢٠٠٣
هێرش عەبدوڵڵا حەمە کەریم
Hekarî
Wurmê
Gever
Dihok
Mêrgesor
Pawe
HERÊMÎ
Rewandiz
Mûsil
Hewlêr
Ranye
Qeladzê
Hemam Elî
KURDISTA
Dûkan
Mexmûr
Tell Uweynat

# پەیوەندییە سیاسییەکانی
# نێوان هەرێمی کوردستان و دەوڵەتانی دراوسێ
# ئێران و تورکیا و سوریا
# ١٩٩١-٢٠٠٣

# پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و دەوڵەتانی دراوسێ ئێران و تورکیا و سوریا ۱۹۹۱-۲۰۰۳

ENDESE

هێرش عەبدوڵڵا حەمە کەریم

# پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و دەوڵەتانی دراوسێ ئێران و تورکیا و سوریا ١٩٩١-٢٠٠٣

هێرش عەبدوڵڵا حەمەکەریم

ناوی کتێب: پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو دەوڵەتانی دراوسێ ئێرانو تورکیاو سوریا ١٩٩١-٢٠٠٣

بابەت: سیاسی

نوسەر: هێرش عەبدوڵڵا حەمەکەریم

دیزاینی بەرگ: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە–باسم رەسام

دیزاینی تێکست: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە–دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٣

چاپخانە: تاران–ئێران

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: (٧٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (٢٧١٨)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی–شەقامی مەولەوی–تەلاری سیروانی نوێ–نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org • andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

# سوپاس و پێزانین

سوپاسی بێپایانم بۆ مامۆستای سەرپەرشتیارم پرۆفیسۆر دکتۆر خەلیل عەلی موراد لە بەرامبەر ماندوبوون و سەرنج و تێبینیە وردە ئەکادیمیەکانی، کە بەئەم توێژینەوەی بەخشی لە پلانی بابەتەکەوە تا ئەنجامی کۆتایی.

سوپاس بۆ هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانەی، کە لە قۆناغی خوێندنی دکتۆرادا، وانەیان پێوتوم.

سوپاس بۆ بنکەی ژین، کە لە پێدانی بەڵگەنامەی مێژووی تایبەت بەم بابەتە دەستکراوە بوون.

سوپاس بۆ سەنتەری ستراتیجی کوردستان کە چەندین پەرتوکی سودبەخشیان خستە بەردەستم.

سوپاسی مامۆستاکانی هاورێم دەکەم، کە هەریەکەو بەجۆرێك یارمەتیداوم.

سوپاسی خانەوادەکەم دەکەم، کە یارمەتیدەرو هاندەرم بوون بۆ تەواوکردنی ئەم بابەتە.

# کورتکراوەکان

١. ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی لە عێراق: ئ.ب.ش.ئ.ع

٢. رێکخراوی موجاهدینی خەلق: ر.م.خ

٣. کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی: ك.ن.ع

٤. یەکێتی نیشتمانی کوردستان: ی.ن.ك

٥. پارتی دیموکراتی کوردستان: پ.د.ك

٦. حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران: ح.د.ك.ا

٧. حزبی سۆسیالیستی کوردستان: ح.س.ك

٨. رێکخراوی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران:کۆمەڵە

٩. بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق: (ب.ئ.ك)

١٠. ترجمە: ت

١١. MERIA :Middle East Review of International Affairs

# پێرست

پێشەکی................................................ ١١

بەشی یەکەم: مێژووی سیاسی هەرێمی کوردستان لە ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٢).... ١٩

دەروازە.................................................. ٢١

تەوەری یەکەم: فاکتەرەکانی دامەزراندنی دەسەڵات لە هەرێمی کوردستان ..... ٢٨

تەوەری دووەم: باری کۆمەڵایەتی و ئابووری هەرێمی کوردستان.............. ٣٨

تەوەری سێیەم: پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمی کودستان................ ٤٨

بەشی دووەم: پەیوەندییەکانی ئێران و هەرێمی کوردستان.................. ٦٥

تەوەری یەکەم: پەیوەندییەکانی عێراق و ئێران.......................... ٦٧

تەوەری دووەم: تێروانینی ئێران بۆ هەرێمی کوردستان.................... ٨٥

تەوەری سێیەم: پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ئێران............ ٩١

تەوەری چوارەم:کاریگەری پەیوەندییەکانی ئێران و هەرێمی کوردستان لەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی رۆژهەڵاتی کوردستان.......................... ١١٧

بەشی سێیەم: پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان و تورکیا.................. ١٢٥

تەوەری یەکەم: تورکیا لە کۆتایی سەدەی بیستدا......................... ١٢٧

تەوەری دووەم: پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و تورکیا .................. ١٣٣

تەوەری سێیەم:کێشەی کورد لە تورکیا................................ ١٥٢

تەوەری چوارەم: پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ هەرێمی کوردستان.......... ١٦٢

بەشی چوارەم: پەیوەندییەکانی سوریاو هەرێمی کوردستان............ ١٩٣
تەوەری یەکەم: سوریا لە ساڵانی نەوەدەکاندا.............................. ١٩٥
تەوەری دووەم: پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و سوریا...................... ٢٠٢
تەوەری سێیەم: سیاسەتی سوریا بەرامبەر بە کێشەی کورد.................. ٢١٠
تەوەری چوارەم: پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو هەرێمی کوردستان........... ٢٢٤

بەشی پێنجەم: هەرێمی کوردستان لە نێوان ململانێو رێکەوتنەکانی تورکیاو سوریاو ئێراندا:............................................................ ٢٤٥
تەوەری یەکەم: کاریگەریی ململانێ ناوچەییەکان لەسەر هەرێمی کوردستان.... ٢٤٧
تەوەری دووەم: سیاسەتی هاوبەشی ناوچەیی بەرامبەر هەرێمی کوردستان..... ٢٧٥
ئەنجام.................................................................. ٢٩٥
سەرچاوەکان............................................................. ٢٩٩
پاشکۆکان............................................................... ٣٣١

# پێشەکی

سالآنی نەوەدەکان بە سالآنی گۆڕانکاری لە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دادەنرێت. بۆ یەکەمجار لە مێژووی هاوچەرخی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا جیهان بە قۆناغی تاکجەمسەریدا گوزەری کرد. کێشەی کورد لە سایەی ئەم گۆڕانەدا شێوەو قەبارەیەکی بەخۆوە بینی کە تەواو جیاوز بوو لە قۆناغی فرە جەمسەری (١٩١٩-١٩٣٩)و جوت جەمسەری (١٩٤٥-١٩٩٠) لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. سەرەتای تێکەڵبونی کێشەی کورد بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەگەرێتەوە بۆ کۆنگرەی ئاشتی پاریس لە ساڵ ١٩١٩. ئەم کۆنگرەیە لە دوای تەواوبونی یەکەمین جەنگی جیهانی سازکرا لە نێوان کۆمەڵێك جەمسەری وەك بریتانیاو فەرەنساو ئەمریکاو ئیتاڵیاو یابان، کە ئامانج تیایدا دارشتنەوی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بوو لە سایەی سەرکەوتنی ئەو دەوڵەتانە لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا بەسەر ئەڵمانیاو نەمساو دەوڵەتی عوسمانیو بولگاریا. چارەنوسی کێشەی کورد لە سایەی فرە جەمسەریدا بریتی بوو لە دابەشکردنی کوردستان بە پێی بەرژەوەندییەکانی ئەو دەوڵەتانە بەسەر هەریەك لە عێراقو ئێرانو تورکیاو سوریادا. ئەم دابەشبوونە کاریگەرییەکی نەرێنی ئەوتۆی بەسەر کێشەی کوردەوە هەبوو کە گۆرانکارییەکانی دوای دووەمین جەنگی جیهانیو دارشتنەوی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە سەر بنەمای جوت جەمسەر، نەیتوانی خۆی لە کۆتو بەندەکانی فرەجەمسەری دەربکاتو کێشەکەش بە پارچەبونیشی بەسەر دەوڵەتانی رۆژهەلآتی ناوەڕاست، پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە نەبینی. ئەم کێشەیە لە دەسپێکی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە سایەی تاکجەمسەریدا بازدانێکی گەورەی بەخۆوە بینی کە لە

پەیدابونی هەرێمی کوردستانی عێراق لە ساڵی ۱۹۹۱و پەرەسەندنی کێشەی کورد لە تورکیادا بەرجەستە بوو.

هەرێمی کوردستان ئەگەر چی بەشێك بوو لە دەوڵەتی عێراقی، بەڵام بەهۆی ئەوەی ئەو دەوڵەتە لە ئۆکتۆبەری ۱۹۹۱ دامودەزگا کارگێڕیو سەربازییەکانی خۆی کشاندەوە، هاوکات لە لایەن هێزی هاوپەیمانان دەپارێزرا، ئەمە هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی بەرەو دامەزراندنی دامودەزاگای خۆماڵی خۆی هەنگاو بنێت. لەگەڵ تێبینی زۆر لەسەر پێکهاتەی دەسەلاتو شێوازی بەرێوەبردنی، بەلام سەرچاوەی بریاردانی ئاشتیو شەرو پەیوەندییەکانی جۆرێك سەربەخۆییو شێوازێکی تایبەتی کوردیی پێوە دیار بوو. بەواتایەکی تر دروستکردنی بریار بە پلەی یەکەم لە دەستی هەرێمەکەدا بوو ئەمەش جۆرێکی تایبەتی لە پەیوەندی دەرەکی بۆ هێنابووە کایەوە کە سەرکردەکانی لەگەڵ ئەوەی هیچ سیفەتێکی فەرمی نێودەوڵەتییان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە بەردەوامی بە درێژای سالآنی (۱۹۹۱–۲۰۰۳)، لە لایەن گەورەترین بەرپرسی دەوڵەتە هەرێمییەکانەوە پیشوازیو کۆبونەوەیان لەگەڵ ساز دەکرا. لێرەوە گرنگی ئەم بابەتە دەردەکەوێت.

بۆ باسکردنی مێژووی پەیوەندیی نێوان دوو دەوڵەت دەگەڕێینەوە بۆ مێژووی دانپێدانانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە. پاشان رێکەوتنە فرە چەشنەکانی نێوانیانو هەوڵی هەر لایەك بۆ رێزگرتن یان لادان لەو رێکەوتنانە باس دەکرێت. بەلام کاتێك باس لە پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێی وەك ئێرانو تورکیاو سوریا دەکرێت، دەبینین ئەم هەرێمە لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە دانپیانراو نەبووە، چونکە سیفەتی یاسایی نێودەوڵەتی نەبووەو سنورەکانی دانپیانراو نەبووەو نوێنەری دپلۆماتی نەبووە، بەڵام هەریەك لەو دەوڵەتانە بە شێوازی تایبەتی خۆی گرنگی پێداوەو پەیوەندیی لەگەڵ پەیدا کردووە. هاوکات هەر سێ دەوڵەت بەیەکەوە هەڵوێستی دیاریکراویان بەرامبەری هەبووە. لە بەرامبەردا هەرێمی کوردستان بوو بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی ململانێیو پەیوەندییەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، کە هەرێمەکە وەك پێگەیەکی جوگرافیو گۆڕانکارییو پەرەسەندنە ناوخۆییەکانی بە شێوازێك کاریگەر بوو لە ناوچەکەدا، کە هیچی لە دەوڵەتێکی سەربەخۆ کەمتر نەبوو. ئەمەش ئامانجی نوسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە. یان

دەتوانین بڵێین ئامانج لە نوسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە باسکردنی سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو ئەو دەوڵەتانەیە پاشان سیاسەتی تایبەتو پێکەوەیی ئەو دەوڵەتانە بەرامبەر بە هەرێمەکە، دواتر کاریگەریی هەرێمی کوردستان لە سەر کێشەی کورد لەو دەوڵەتانە، هەروەها پەیوەندیو هاوکاری پێکەوەییان لەسەر خاڵی هاوبەشی پەیوەندییەکانی نێوانیان، کە هەرێمی کوردستانو کێشەی کورد بووە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا پەیوەندییەکانی سێ دەوڵەت باسکراوە، لەگەڵ هەرێمی کوردستان ئەوانیش ئێرانو تورکیاو سوریایە. هەڵبژاردنی ئەم سێ دەوڵەتە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە دراوسێی هەرێمی کوردستانن‌و هەرێمەکە سنوری دیاریکراوی بە تەنها لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە هەیە. هاوکات دەستنیشانکردنی هەر سێ دەوڵەتی دراوسێ لە توێژینەوەکەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سروشتی پرسی کوردی لە رۆژهەلاتی ناوەرستدا وەك زنجیرێکی چوار ئەڵقەیی بازنەیی وایە، کە گەشەکردنو بەرەو پێشچونی هەریەکێکیان جوڵەو پێشڤەچون لەوانی تر دروست دەکات، بۆیە هەرێمی کوردستان چەند چارەسەر بوو بۆ پرسی کورد لە باشوری کوردستان، هاوکات کێشە بوو بۆ ئەو دەوڵەتانەی، کە پارچەکانی تری کوردستانیان بەسەردا دابەش بووە، چونکە لەژێر کاریگەری هەرێمدا پرسی کورد لەو دەوڵەتانە پەرە سەندنی بەخۆوە بینیوە.

هەرچەندە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە بەردەوامی باس لە کاریگەری دەوڵەتی عێراقی لەسەر پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان باسکراوە، بەلام بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخان نەکراوە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەرێمی کوردستان لەڕوی یاساییەوە بەشێك بووە لە دەوڵەتی عێراقی. هاوکات هەرێمی کوردستان لە ماوەی ئەم توێژینەوەیەدا (١٩٩١-٢٠٠٣)، ئەوەندەی لە ململانێدا بووە لەگەڵ بەغداد، زۆر کەمتر لە پەیوەندیدا بووە. هاوکات هەرچەندە هەرێمی کوردستانو سەرکردەکانی سیفەتێکی فەرمیو شەرعی نەبووە لە لایەن دەوڵەتانی دراوسێ، لەگەڵ ئەوەشدا وەك بارێکی دیفاکتۆ (defacto) لە لایەن ئێرانو سوریاو تورکیاوە پەیوەندیو مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە. بەلام دەوڵەتی عێراقی هاوشێوەی دەوڵەتانی دراوسێ، پەیوەندیی لەگەڵ هەرێمەکەدا نەبووە. ئەوە وایکردووە بەشێکی تایبەتی لە سنوری ئەم بابەتەی ئێمەدا بۆ دیاری نەکرێت.

ئەو ڕێبازەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا گیراوەتە بەر ڕێبازێکی مێژووییە نەك یاسایی یان سیاسی. بە واتایەکی تر هەرێمی کوردستان، چونکە سیفەتێکی یاسایی نەبووە، هاوکات پەیوەندییەکانی ناچێتە ناو سنوری یاسایی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانو نوێنەرانو شاندو سەرکردەکانی هەرێمەکە هیچ سیفەتێکی دیپلۆماسسیان نەبووە لە پەیوەندییەکانو بگرە بارێکی تایبەت بووە، کە هاوشێوەی لە جیهانی پەیوەندیەکاندا دەگمەنە. بۆیە میتۆدی ئەم لێکۆلینەوەیە ئەوەندەی پشتی بە ڕووداوە مێژوییەکان بەستووە ئەوندە پشتی بە دەقو نەریتە دیپلۆماسییە نێودەوڵەتییەکان نەبەستووە. شێوازی نوسینی لێکۆڵینەوەکە وایە، کە لە هەر بەشێکدا هەوڵدراوە بۆ زیاتر بەرچاوروونی پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ، هەوڵبدرێت باسی بارودۆخی ئەو دەوڵەتە بکرێت لە نەوەدەکان، پاشان پرسی کورد لە نەوەدەکاندا لەو دەوڵەتە چۆن بووە، ئەمە وەك پێشەکییەك دانراوە بۆ تێگەیشتن لە تێڕوانینو چۆنییەتی مامەڵەکردنی ئەو دەوڵەتانە لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا. بەڵام لەم پێشەکیانەدا زۆر نەگەڕاوینەتەوە بۆ مێژووی ئەو دەوڵەتانەو مێژووی پرسی کورد لەو دەوڵەتانەدا، ئەمەش بۆ دوورکەوتنەوەی توێژینەوەکە بووە لە مێژوویەکی درێژخایەنو هەروەها بۆ جەخت کردنەوەی تایبەتی بووە لەسەر پرسی کوردو هەرێمی کوردستان لە نەوەدەکانی سەدەی پێشوودا.

گرفتی سەرەکی ئەم توێژینەوەیە لەوەدابوو، کە بەڵگەنامەی پێویست لەبەر دەستدا نەبووە بۆ باسکردنی ئەو پەیوەندیانە، ئەمەش بەڕای ئێمە بۆ نافەرمی بوونی ئەو پەیوەندیانە دەگەڕێتەوە، کە وایکردووە ڕێکەوتنو لێکتێگەیشتنی نێوان هەرێمی کوردستانو ئەو دەوڵەتانە شێوەیەکی روونو ئاشکرا وەرنەگرێت. ئەمە وایکردووە، کە بەڵگە نامەی ڕێکەوتنو لێکتێگەیشتن، ئەگەر هەشبووبێت، ئەوا لە دەزگا فەرمییەکانی ئەو دەوڵەتانە بلاو نەکرێتەوە. ئەمە لە لایەك، هاوکات بەشێکی زۆری پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەستگای سەربازیو هەواڵگری ئەو دەوڵەتانەدا بووە، کە سروشتی ئەم دەزگایانە شاردنەوەی بەڵگە نامەکانە. وێڕای ئەوەی پێکهاتەی دەوڵەتانی دراوسێ دەولەتی تۆتالیتارین (جگە لە تورکیا)و شەفافیەت لە پەیوەندیەکانیان نەك لەگەڵ هەرێمی کوردستان، بەڵکو لە پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکانیشیان بە تەواوی دیارو بەرچاو نییە.

هەروەها لایەنە بەرپرسەکانی پەیوندیە دەرەکییەکان لە هەرێمی کوردستان یاریدەدەری ئەم توێژینەوەیە نەبوون. هەموو ئەمانە وایانکردووە بەڵگەنامەکانی ئەم توێژینەوەیە کەم بێت.

لە لایەکی تر نەبوونی توێژینەوەو کتێبی تایبەتی پێشوەخت بوو لەسەر ئەم توێژینەوەیە. عێراق بەهۆی ئەوەی لە سالآنی (١٩٩١-٢٠٠٣) لە ئاستی پەیوەندییە نێودەولەتییەکان کەنارگیر کەوتبوو، بۆیە دەبینین توێژینەوەی پێویست لەسەر پەیوەندییەکانی عێراق بەتایبەت لەگەڵ دەولەتە دراوسێکان لەم ماوەیەدا لەبەر دەستدا نەبووە. ئەگەر ئەمە دۆخی پەیوەندییەکانی عێراق بێت، ئەوا پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان بە تایبەت لەگەڵ ئێران‌و سوریادا هیچ تێزێکی ئەکادیمی لەسەر نییە. لەم سۆنگەیەوە توێژەری ئەم بابەتە بە پشتن لە روانگەی سەرچاوەکان‌و بە پشتبەستن بە راوبۆچوونی تایبەتی خۆی بنەمای پەیوەندییەکان‌و گرفتەکان‌و مێژوی ئەو پەیوەندیانەی باس کردووە.

گرنگترین ئەو سەرچاوانەی سودییان لێوەرگیراوە بریتین لە چەند بەڵگەنامەیەك، کە لە بنکەی ژین دەستمان کەوتووە. بەڵگەنامەکان، بریتین لە نامەی سەرکردە سیاسییەکان‌و چەند راپۆرتێکی ناوخۆیی پارتەکانی هەرێمی کوردستان، کە باسی لە لە شێوازو جۆری پەیوەندییەکان نزیکمان دەکاتەوە. هاوکات سود لە بلاوکراوەی (الانصات المرکزی) سەر بە نوسینگەی راگەیاندنی (ی.ن.ك) وەرگیراوە. گرنگی ئەم سەرچاوە لەوەدایە، کە رۆژانە راپۆرتە هەواڵییەکانی لە دەزگاو راگەیاندنە جیهانییەکانەوە بلاو دەکردەوە لە کاتێکدا ئەو بلاوکراوانە بەهۆی بارودۆخی ئابوری‌و سیاسی هەرێمی کوردستان نەدەگەیشتنە دەست هاولاتی. سەرچاوەیەکی تر کە لەم توێژینەوەیە بە شێوەی سەرەکی پشتی پێبەستراوە، گۆڤاری سەرچاوەی رۆژهەلاتی ناوەراست بۆ کاروباری نێودەولەتی Middle East Review of International Affairs، کە تیایدا توێژینەوە ئەکادیمی‌و سیاسییەکانی جیهان بلاو دەکاتەوەو ئێمە لە رێگەی ئەنتەرنێتەوە دەستمان کەوتووە. لەم گۆڤارەدا توێژەرە ئەکادیمییەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست بابەت بلاو دەکەنەوە. ئەم توێژینەوانە جگە لەوەی بایەخی ئەکادیمی هەیە، هاوکات بایەخێکی مێژوییی هەیە، کە بە بیروبۆچوون‌و

ڕووداوە سیاسییەکانی ئەو کاتانە ئاشنامان دەکات. لە ناوسەرچاوە فارسیەکانیشدا گۆڤاری (سیاست دفاعی) بایەخی تایبەتی هەبووە لەم توێژینەوەیەدا. ئەم گۆڤارە لەلایەن سوپای پاسدارانی ئێرانەوە دەردەچێت، کە ڕۆڵی سەرەکییان لە نەخشکردنی پەیوەندییە جۆراوجۆرەکانی ئێران هەیە. هاوکات بەهۆی ئەم گۆڤارەوە توانیومانە لە بیروڕای سەرکردە باڵاکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بەرامبەر هەرێمی کوردستان نزیک ببینەوە. لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا سود لە نوسینەکانی دکتۆر (محمد نورالدین) وەرگیراوە، کە وەك کتێب.یان لە گۆڤارەکان بلاوی کردووەتەوە. ئەم نوسەرە جگە لەوەی کە پسپۆرە لە کاروباری سیاسی تورکیادا، هاوکات سەر بە ئاینزای شیعەیەو هاولاتییەکی لوبنانییە. هەموو ئەمانە وایکردووە کە لە نوسینەکانیدا بایەخی تایبەتی بدرێت بە گرفتی نەتەوایەتیو ئاینیو ڕێکخراوە سیاسیو چەکدارییەکان لە پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ دەولەتانی دراوسێدا.

پێکهاتەی توێژینەوەکەش پێنج بەشی لەخۆ گرتووە. بەشی یەکەم لەسەر "مێژووی سیاسی هەرێمی کوردستانە لە ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٣)". ئەم بەشە وەك پێشەکییەك وایە لەسەر هەرێمی کوردستانو پەیوەندییە دەرەکییەکانی بە گشتی. لە دەروازەی بەشەکەدا باس لە گرنگی جوگرافیای هەرێمەکە کراوە. پاشان کورتەی مێژووی ئەم هەرێمە وەك بەشێك لە دەوڵەتی عێراقی تا ساڵی ١٩٩١ باس کراوە. تەوەری دووەم بە ناوی "فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی دەسەلات لە هەرێمی کوردستان" لە گرنگترین ئەو هۆکارانە دەکۆڵێتەوە، کە بووە هۆی سەرهەڵدانی دەسەلاتی سیاسی لە هەرێمەکە لە ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٢). تەوەری سێیەم بریتییە لە باسکردنی "باری کۆمەلایەتیو ئابوری هەرێمی کوردستان"، کە تیایدا تیشك خراوەتە سەر ئەو گرفتە ناوخۆییە کۆمەلایەتیو ئابووریانەی هەرێمی کوردستان کە بەهۆیەوە کاریگەریی لەسەر پەیوەندییە دەرەکییەکان پەیدا کردووە. تەوەری چوارەم لەژێر ناوی "پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمی کودستان"ە. لەم تەوەرەدا بە شێوەیەکی گشتی باس لە پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئەم هەرێمە کراوە.

ناونیشانی بەشی دووەم بریتییە لە سیاسەتی ئێران بەرامبەر هەرێمی کوردستان. لە تەوەری یەکەمدا لەژێر ناوی "پەیوەندیەکانی نێوان عێراقو ئێران"، جگە لەوەی گرفتو

ململانــێ مێژوویــەکانی نێــوان ئــەم دوو دەوڵەتــە دەرخــراوە، هاوکــات پەرەســەندنی پەیوەندییکانی نێوانیان لە ماوەی توێژینەوەکەی ئێمەدا تیشکی خراوەتە سەر. تـەوەری دووەم، "تێروانینی ئێران بـۆ هـەرێمی کوردسـتان" لـە رووی ئـاینیو ئاسایشـی نەتـەوەیی ئێرانەوە خراوەتـە بـەر باسو لێکۆڵینـەوە. "پەیوەندیـەکانی نێوان هـەرێمی کوردسـتانو ئێران" تەوەری سێیەمە، کە لەبەر رۆشنای سەرهەڵدانی هەرێمەکەو پەیوندی نێوان عێراقو ئێران، پەیوەندی ئێرانو هەێمی کوردستان باس کراوە. تـەوەری چـوارەم لـە "کاریگـەری پەیوەندیـەکانی ئێـران و هـەرێمی کوردسـتان لەسـەر پارتـە بەرهەڵسـتکارەکانی ئێـران" دەدوێت.

بەشی سێیەم بەناوی "پەیوەندیەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا"یـە. تـەوەری یەکەم گرنگی داوە بە پێگەو رۆڵی نوێی "تورکیا لـە کۆتـایی سـەدەی بیسـتدا" لـە ئاسـتی ناوچـەییدا. تـەوەری دووەم بـۆ "پـەیوەندییـەکانی نێـوان عێـراقو تورکیـا (١٩٩١-٢٠٠٣)" تــەرخان کــراوە کــە تێکچــوونی پەییوەنــدییانو پاشــان ئــەو هەڵانــەی هــەردوولا بــۆ ئاسـایکردنەوەی پەیوەندییـەکان باسـی لێـوە کـراوە. تـەوەری سـێیەم بـە کـورتی تیشـك خراوەتە سەر "کێشەی کورد لە تورکیا". پاشان لە روانگەی ئەو سـێ نـەگۆرەی سـەرەوە "پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستانو تورکیا" لە تەوەری چوارەم، دەستنیشان کراوە.

بەشی چوارەم، کە "پەیوەندییەکانی نێـوان سـوریاو هـەرێمی کوردسـتان"ە، لـە چـوار تەوەر پێکهاتووە. لە یەکەمیاندا "سوریا لە ساڵانی نەوەدەکاندا" راڤەی بۆ کراوە. پاشـان لـە دووەم تـەوەردا کورتـەی "پەیوەندییـەکانی نێـوان سـوریاو عێـراق"و خاڵـە جیـاوازو هاوبەشەکانیان نوسراوە. لە سێیەمدا "سیاسەتی سوریا بەرامبەر بە کورد" بە شـێوەیەکی گشتی نوسراوە. دوا تەوەر لەسەر "پەیوەندییـەکانی سـوریاو هـەرێمی کوردسـتان"ە، کـە سەرەتای دەسپێکردنو پاشان رایەڵەکانی ئەو پەیوەندییە دیاریکراوە.

کۆتا بەش، بەشی پێنجەمە لەژێر سـەردێری "هـەرێمی کوردسـتان لـە نێـوان ململانـێو رێکەوتنەکانی تورکیاو سوریاو ئێراندا" جێگەی کراوەتەوە، کە بـۆ دوو تـەوەری سـەرەکی دابەش کراوە لە یەکەمیان لەسەر بابەتی "کاریگەری ململانێ ناوچەییەکان لەسەر هـەرێمی کوردستان"ە کە تیایدا پێگەی هەرێمەکـە لـە کێشـمە کێشـمی ناوچـەیدا خراوەتـە روو. لـە

دووەمیاندا "سیاسەتی هاوبەشی ناوچەیی بەرامبەر هەرێمی کوردستان" باس کراوە، کە بۆ دیاریکردنی خاڵو بەرژەوەندی هاوبەشی ئەو دەوڵەتانە لە دژایەتی کردنی هەرێمەکە تەرخان کراوە.

لە کۆتایدا ئەم توێژینەوەیە بە گرنگترین ئەنجامەکان تەواو دەبێت، لەگەڵ لیستی سەرچاوەو پاشکۆکان.

توێژەری ئەم بابەتی هەوڵی داوە لە روانگەی سەرچاوەکانی بەردەستی، بەدواداچونو هەڵسەنگاندنی هەبێت بۆ پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستانو دەوڵەتانی دراوسێ، لە ماوەی ساڵانی(١٩٩١-٢٠٠٣). بێگومان توێژینەوەکە لەکەموکوری بەدەر نییە، بۆیە هیوادارم کەلێنەکانی ئەم توێژینەوەیە پڕبکرێتەوە، لە رێگای تێبینی ئەندامانی بەرێزی لیژنەی گفتوگۆکە. لەگەڵ رێزو پێزانین بۆ هەوڵو ماندوبونتان.

# بەشی یەکەم

## مێژووی سیاسی هەرێمی کوردستان

## لە ساڵانی ١٩٩١-٢٠٠٣

- دەروازە
- تـــەوەری یەکــەم-فاکتــەرەکانی دامەزرانــدنی دەســەڵات لــە هــەرێمی کوردستان
- تەوەری دووەم-باری کۆمەڵایەتی و ئابووری هەرێمی کوردستان
- تەوەری سێیەم- پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان

# دەروازە

هەرێمی کوردستان، چەمکێکی جوگرافیو سیاسیە، بە باشووری کوردستان دەوترێت کە ڕووبەرەکەی (٧٣.٦١٨ کم²)[1]. لەساڵی١٩٢٦ دا بەفەرمی بەدەوڵەتی عێراقەوە لێکێنراوە ، بەڵام هەرێمی کوردستان وەك چەمکێکی سیاسی لە دوای راپەڕینو کۆڕەوی مارتی ١٩٩١و هەروەها لە دا دوای کشانەوەی دامودەزگاکانی حکومەتی بەغداد، نیمچە سەربەخۆییەکی بەدەستهێنا، لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی کوردییەوە بەڕێوە براوەو ڕوبەرەکەی (٤١.٩٣٩ کم٢) بووە، واتە هەموو سنووری جوگرافی باشوری کوردستانی نەگرتووەتەوە[2]. ئەم هەرێمە لە(٩٠٪)ی خاکی عێراقە[3]، بەپێی نەخشەی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی (UNICEF) کە لەساڵی ١٩٩٧ کێشاویەتی، کەوتووەتە نێوان بازنەی پانی (٣٨)و (٣٤)و هێڵی درێژی (٤٠)و (٤٧). ئەم هەرێمە پارێزگاکانی هەولێر (پایتەختی

---

[1] جزا توفیق طالب : المقومات الجيوبولتيكيه للامن القومي فى أقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجيه، السليمانيه، ٢٠٠٥، ص٢٠

[2] كوردستان نبذة تأريخية جغرافية اقتصادية، مكتب الدراسات والبحوث المركزى، مطبعة وزارة التربية، أربيل، ١٩٩٨، ص٦٣.

[3] Carole A. O'Leary: THE KURDS OF IRAQ: RECENT HISTORY, FUTURE PROSPECTS. Middle East Review of International Affairs. Volume 6, No. 4 - December 2002. .www.meria.idc.icil

هـەرێم)و سـلێمانیو دهـۆك، قـەزای ئـاکرێو شـێخانو ناحیـەی ئـەتروشو بـەردەڕەش لەپارێزگای موسڵ، قەزای کفریو ناوچـەی سـەرقەڵاو پشـتقەڵا لـەپارێزگای دیالـەو هەنـدێ ناوچەی بچوك لەپارێزگای کەرکوکی دەگرتەوە [1].

لــە رووی پێگــەی جوگرافییــەوە، فــەیروز حەســەن وەك توێــژەرێکی کــورد، لــە هەڵسەنگاندنی پێگەی سیاسیو جوگرافیی باشـوری کوردسـتاندا نوسـیویەتی کـە لـە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی، باشوری کوردسـتان هـەرێمێکی داخـراو Landloked بـووە، کـە هیچ سنورێکی ئاوی لەسەر دەریا نەبووە. بۆیـە سـنووره داخراوەکـانی هەمیشـە لـە لایـەن دەوڵەتانی دراوسێوە جێگای هەڕەشـە بـووەو هاوکـات رۆڵـی لـە دیاریکردنی چارەنوسـیدا هەبووە. لەبەرئەوە هەرێمەکە هەمیشە قوربانی دەستی پێگەکەی بوو، کە وایکردبوو نە لـە ئاستی ناوچەییو نە لە ئاستی نێودەوڵەتی هاورێو دۆستی نـەبێت. بـەڕای هـەمان توێـژەر پێگەی جوگرافی گۆرانی بەسەردا دێت بـە پێـی گۆرانـە سیاسسیەکان. بـە جۆریك لەگـەڵ داخراوی هەرێمەکـەدا، بـەڵام باشـووری کوردسـتان هەمیشـە ناوچـەیەکی زینـدوو بـووە بـۆ ململانێی ناوچەییو نێودەوڵەتیەکان. بە تایبەت لە نێوان دەوڵەتە دراوسێکاندا ئەمـەش بـۆ ئەو جیاوازییە قوڵە گەڕاوەتــەوە، کـە لـە پەیوەنـدی ئـەو دەوڵەتانـەدا هـەبوو، هاوکـات بـۆ تێکهەڵکێشی ئەتنیکی نەتەوەی کورد دەگەرێتەوە، کـە لـەنێوان تورکیـاو سـوریاو عێـراقو ئێران دابەش بووە کە کێشەیەکی ئەتنیکیو جیۆپۆلەتیکی لە ناوچەکەدا پەیدا کردووە. کە وایکردووە باشووری کوردستان بەشێك بێت لە ناوچەیەکی بەرفراوانی زیندوی نێودەوڵەتی، کـە پێکـدادانو ململانێـی تونـد لـە نێـوان دەوڵـەتانی دراوســێ بەخۆیـەوە ببـینێ. بـە لەبەرچاوگرتنی ئەم دۆخە نالەبارەو هاوکـات زۆری فشـاری گـەورە هێزەکـان بـۆ سـەر ئـەم دەوڵەتانـە، هۆکـار بـووە بـۆ ئـەوەی ئـەو سـنورە داخراوانـەی باشـوری کوردسـتان بـە

---

[1] بروانە نەخشەی ژمارە (١). ئەم نەخشەیە لەساڵی ١٩٩٧ کێشراوە، بەڵام پێش ئەم مێژووە، سنوری هەرێمەکە لـەگەڵ عێراق، بەپێی بارودۆخی سیاسی ناوچەکە لەگۆڕانـدا بـووەو بـارێکی جـێگیری نـەبووە. .UNICEF. 10.April. 1997

شێوەیەکی ئاسان ببەزێنرێت [1]. ئەم وەسفەی توێژەر بۆ پێگەی باشووری کوردستان بووبێت لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی، ئەوا هەمان هەڵسەنگاندن بۆ پێگەی هەرێمی کوردستان راست دەردەچێت لە دوای دووەمین جەنگی کەنداو. هەرێمی کوردستان کۆتاییی ئەو هێڵی فشارە ئەمریکییە بوو کە لە سنووری هاوپەیمانی ناتۆوە بە ناو تورکیادا دەستی پێدەکردو بە ناو هەرێمی کوردستانو لە نێوان سنورەکانی ئێرانو سوریادا فشاری دەخستە سەر رژێمی عێراقی، بە تایبەتی لە رێگای (ناوچەی دژەفڕین– No-fly Zoon)ەوە. بە واتایەکی تر هەرێمی کوردستان بۆ یەکەم جار لە مێژوودا لەسەر هەمان هێڵی بەرژەوەندیی گەورە هێزەکان بوو بە تایبەتی ئەمریکا، نەك بە پێچەوانەی ئەو هێڵە.

باشووری کوردستان بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانیو دوای ئەوەی ئەم دەوڵەتە لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا (١٩١٤–١٩١٨) بە دۆڕاویی چووە دەرەوە، سەرکردە کوردییەکان لە سەرو هەموویانەوە شێخ مەحمودی حەفید، لەم ناوچەیەدا هەوڵەکانی لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی خستە گەڕ. ئەم هەوڵانە سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، چونکە بریتانیا پشگیری لێنەدەکردو پرۆژەی بریتانیا لە پێناو بنیاتنانی دەوڵەتێکی بەهێزی عێراقیدا بوو. هاوکات مستەفا کەمال ئەتاتورك لە هەناوی دەوڵەتی عوسمانیدا، کۆماری تورکیای دامەزراندو بەپێی رێکەوتنامەی لۆزان لە ٢٤یۆلیۆی ١٩٢٣، هاوپەیمانەکان دانیان بە دەوڵەتی تورکیدا نا [2]. لێرەوە چارەنووسی باشووری کوردستان لە نێوان تورکیاو عێراقدا بە هەڵواسراوی مایەوە تا کۆمەڵەی گەلان بریاریدا لە ساڵی ١٩٢٦، ببێت بە

---

[1] فیروز حسن حمه عزیز: الاهمية الجيوستراتيجية لكردستان الجنوبية وتاثيرها على السياسة البريطانية (١٩١٤–١٩٢٤). مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٨، ص ص١٢٠–١٢٤.

[2] جليلي جليل واخرون: الحركة الكردية في العصر الحديث، ت: عبدي حاجي، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٠ ص ص ١١٩–١٣٠. سعد بشير اسكندر: من تخطيط الى تجزئة، سياسة بريطانيا العظمى تجاة مستقبل كردستان، بنكەی ژین، سلیمانی، ٢٠٠٧. ص ص ٣١٥–٣٢٢.

پارچەیەك لە دەوڵەتی عێراقی، بەمەرجێك رەچاوی مافی پەروەردەو فێرکردن و دامەزراندن لە دامودەزگا فەرمییەکانی دەوڵەت بۆ کورد بکات[1].

بە پشت بەستن بەو بریارەی سەرەوە، کورد لە عێراقدا توانی رۆژنامەو بلاوکراوە بە زمانی خۆی دەربکات، بەمەش بوژاندنەوەیەکی بیری نەتەوەیی لەناو ئەم پارچەیەی کوردستاندا سەری هەڵدا، کە کورد لە ئێران و تورکیا بە تەواوی لێی بێبەش بوون، ئەمەش رێگای خۆشکرد بۆ گەشەسەندنی بیرو چالاکیی سیاسی کورد لەم پارچەیەی عێراقدا، بەجۆرێك کە هەرچەند دەوڵەتی پاشایەتی لە عێراق نکۆڵی لە مافی سیاسی بۆ کورد دەکرد، بەلأم نەیاندەتوانی کورد وەك نەتەوەیەکی سەرەکی لە عێراقدا پشتگوێ بخەن. هەر بۆیە لە دوای روخانی رژێمی پاشایەتی و سەرهەڵدانی رژێمی کۆماری لە ١٤ی یۆلیۆی ١٩٥٨، لە عێراق، دەوڵەت لە دەستوری نوێدا، هاوبەشبونی کوردی لە پاڵ عەرەبدا، بە فەرمی ناساند[2].

هەرچەندە ئەمەی سەرەوە دانپیانانێکی یاسایی بوو، بەلأم رێکەوتنێك لە نێوان بزاڤی سیاسی کوردی لەگەڵ دەوڵەتدا بۆ چۆنییەتی هاوبەشبونی کورد لە بریاری سیاسی عێراقدا نەبوو. ئەمە وایکرد جیاوازیی لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا، بە درێژایی سالأنی(١٩٦١–١٩٧٥)سەر هەڵبدات. لە نێو ئەم ململانێیەدا لە لایەن هەردولایەنەوە پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ باشوری کوردستان لە ١١ی مارسی ١٩٧٠دا گەلاڵە بوو، بەلأم دووبارە دەوڵەت و بزوتنەوەی کوردی لەسەر سەرجەم خاڵەکانی نەگەیشتبونە رێکەوتنی کۆتایی، ئەوە بوو لە ١١ی مارسی ١٩٧٤، بەغداد یەکلایەنە دەستی کرد بە جێبەجێکردنی پرۆژەکەو لێرەوە

[1] احمد رفيق: العلاقات السياسية بين العراق و بريطانيا، ١٩٢٢–١٩٣٢،دار الطليعة، بغداد، ١٩٨٠، ص٢٠٧.

[2] حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية في الشرق الاوسط.من بدايتها حتى سنة ١٩٩١. مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٢ ص٧٣

ململانێیەکی توند سەری هەڵدا، کە لە ئەنجامدا دەوڵەتی عێراقی بە هاریکاری ئێران لە ساڵی ١٩٧٥توانی کۆتایی بەو بزوتنەوە چەکدارییەی کوردی بهێنێت[١].

دوابەدوای ئەم رووداوە، بزوتنەوەی کوردی خۆی رێکخستەوەو توانی خەباتی چەکداری خۆی هەستێنێتەوە سەرپێ. ئەوەی زیاتر چالاکترو کاریگەرتری کرد، جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراقو ئێران بوو لە ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨). دەوڵەتی عێراقی لە جەنگێکی ناوخۆیی توندا بوو لەگەڵ ئەم بزوتنەوەیە، ئەم بزوتنەوەیەش بە پشتبەستن بە کۆمەڵگەی کوردی لە شارو شارۆچکەو دێهاتەکان، سەرسەختانە دژی دەوڵەت دەجەنگا. بۆ کۆتاییهێنان بەم رەوشە، بەغداد بریاری دا بنکە سەرەکییەکانی ئەو بزوتنەوەیە لەناو بەرێتو هاوکات ئەو بزوتنەوەیە لە کۆمەڵگای کوردی دابڕێت. بۆ ئەم مەبەستەش چەکی کۆمەڵکوژی بەکارهێنا، لە شارۆچکەو دێهاتەکانی کە بنکەی سەرکردایەتی بوون، لەوانە شاری هەڵەبجە لە ١٦ی مارتی ١٩٨٨، کە زیانە مرۆییەکانی لە یەك رۆژدا بە پێنج هەزار سڤیل خەملێنرا، هاوکات ناوچە دێهاتییەکانی باشووری کوردستانی لە پرۆسەیەکدا بە ناوی ئەنفال، خاپور کرد، کە قوربانییەکانی بە ١٨٢ هەزار کەس مەزەندە کرا[٢].

ئەم پرۆسەیە هەڵەیەکی گەورەی دەوڵەتی عێراقی بوو کە نەتەوەی کوردی بە تەواوی لە ناو دەوڵەتی عێراقیدا نامۆ کرد، بۆیە لە نێو دووەمین جەنگی کەنداو، لە ١٩٩١، شارو شارۆچکە کوردییەکان راپەرینیان لە مانگی ئازاری ١٩٩١دا بەرپاکردو بوو بە سەرەتایەك بۆ دامەزرانی دەسەلاتی کوردی.

تەریب لەگەڵ ئەم روداوانە، ململانێی مێژوویەکانی نێوان پارتە سیاسییەکان لە پێش هاتنەکایەی هەرێمی کوردستان، کاریگەریی زۆری لەسەر رووداوەکانی دوای بنیاتنانی دەسەلات لە هەرێمەکە هەبوو.سەرەکیترین ئەو پارتانەش، کە ململانێکەیان بەرێوە دەبرد،

---

[١] عبدالوهاب حمید رشید: مستقبل العراق الفرص الضائعة والخيارات المتاحة، دار المدى، بيروت، ١٩٩٧، ص ٧٣

[٢] دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێرانی، ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی دووەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥. ل ل ٥٧٨-٥٩٢

(پ.د.ك)[1] و (ی.ن.ك)[2] بوو. ئەم دوو پارتە مێژووی سیاسی باشووری کوردستانیان لە دوای دووەمین جەنگی جیهانییەوە بەلای خەبات و ململانێکانی خۆیان راپێچ کردبوو. ئەگەرچی (پ.د.ك) لە ساڵی ١٩٤٦ دامەزرابوو. هەروەها (ی.ن.ك) لە ساڵی ١٩٧٥ دامەزرا. واتا (پ.د.ك) ٢٩ ساڵ پێش (ی.ن.ك) دامەزرا بوو، بەڵام سەرەکیترین ئەو ئەندامانەی، کە (ی.ن.ك)یان دامەزراند هەمان ئەو ئەندامانە بوون کە سەرکردایەتی بەشێکی گرنگی ململانێ ناوخۆییەکانی (پ.د.ك)یان کرد بەدرێژایی ساڵانی(١٩٤٦-١٩٧٥). لەئەنجامی ئەو ململانێیدا چەندین روداوی خوێناوی و رێکەوتن کەوتووەتە نێوانیان، لەوانە جیابونەوەی کۆمەڵێك لە سەرکردایەتی داهاتوی (ی.ن.ك) لە ساڵی ١٩٦٤، هەروەها رێکەوتنی ئەو ئەندامانە بۆ دووبارە گەڕاندنەوە ناو (پ.د.ك) لە ساڵی ١٩٧٠[3]. دوای دروستبونی

---

[1] لە ١٦ی ئۆگستۆسی ١٩٤٦ دامەزراوە. بە شێوەی نهێنی کاری کردووە تا شۆرشی ١٤یۆلیۆی عێراق لە ١٩٥٨. پاشان بە ئاشکرا خەباتی سیاسی دەسپێکردووە. لە ساڵی ١٩٦١ دەستی کردووە بە خەباتی چەکداری و سەرکردایەتی بزوتنەوی رزگاریخوازی کوردی کردووو بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانی . ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٧٥ توشی شکستێکی گەورە بوو لە ئەنجامی رێکەوتنامەی نێوان عێراق و ئێران، کە بەهۆیەوە مستەفا بارزانی دەسبەرداری سەرکردایەتیی بزوتنەوەی کوری و پارتەکە بوو. پاشان کورەکانی سەرکردایەتی ئەو پارتەیان کرد لە هەموویان دیارتر مەسعود بارزانی، کە تا ئێستاش سەرۆکی ئەو پارتەیە. تا ئێستا ١٣ کۆنگرەی بەستووە. ارکان حمه امين الزرداوی، نشاة و تطور الجمعيات والاحزاب والتيارات السياسية الكوردية في العراق، دار جيا للطباعة والنشر، بغداد، ٢٠٠٩، ص ص ٥١-٨٢.

[2] لە ١ی یۆنیۆی ١٩٧٥ خۆی راگەیاندووە وەك پارتێکی سیاسی بە سەرکردایەتی جەلال تالەبانی . لە ساڵی ١٩٧٦ دەستی کردووە بە خەباتی چەکداری بە شێوەی پارتیزانی. رۆڵێکی گەورەی بینیوە لە ساڵانی هەشتاکان لە دژایەتیی رژێمی عێراقی لە هەرێمی کوردستان. ئەم پارتە سەرەتا لە ژێر کاریگەری رێبازی مارکسیدا بوو بە لام لە کۆنگرەی یەکەمیان لە ساڵی ١٩٩٢ وەك پارتێکی سۆسیال دیموکرات خۆیان ناساند. تا ئێستا سێ کۆنگرەی ئەنجام داوە. سوزان إبراهيم حاجي أمين: التجربة الديمقراطية في كوردستان العراق، رسالة دكتوراه، كلية القانون والعلوم السياسية / قسم في الأكاديمية العربية في الدنمارك، ٢٠٠١. ص ص ١١١-١١٦

[3] بڕوانە:گەراس ئار. ڤی. ستانسفیلد: کوردستانی عێراق (پەرەسەندنی سیاسی و پشکوتنی دیموکراسی)، و: یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ١٧٢-١٨٥

(ی.ن.ك) بە درێژایی ساڵانی ١٩٧٦-١٩٨٦ شەر لەنێوانیاندا هەبوو، کە لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولا کوژران. دواتر لە ساڵی ١٩٨٦ ڕێکەوتنیان ئەنجامدا[1] و لە ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ چەند پارتێکی تر بەرەی کوردستانییان پێکهێنا[2]. ئەم ململانێیە دوای دامەزراندنی سیستەمی دەسەڵات لە هەرێمدا، ڕاستەوخۆ گواسترایەوە ناو دامودەزگا فەرمیو ڕێکخراوە مەدەنییەکانو کە پاشان پەلی کێشا بۆ سەرجەم ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوری لە هەرێمی کوردستاندا.

---

[1] نەوشیروان مستەفا ئەمین: خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی ڕوداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٨٤-١٩٨٨. چاپو بڵاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان، ١٩٩٩، ل ٢٠١-٢٠٢

[2] ئەم بەرەیە لە کۆبونەوەیەکی پارتە کوردییەکان لە چیای خواکورك لە ٦ی یۆنیۆی ١٩٨٨ پێکهات لەژێر کاریگەری پرۆسەی ئەنفالو کیمیابارانی ناوچە کوردییەکانی کە لەژێر دەسەڵاتی هێزە کوردییەکاندا بوون. ئەو شەش پارتە بریتی بوون لە (پ.د.ك)، (ی.ن.ك)، (ح.س.ك)، پارتی کۆمۆنیستی عێراق، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان، پارتی سۆسیالیستی کورد (پاسۆك). فاتح رسول: بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی ، ٢٠٠٥، ل ٣٦٦.

# تەوەری یەکەم
# فاکتەرەکانی دامەزراندنی دەسەڵات لە هەرێمی کوردستاندا

ئەو فاکتەرانەی، کە بوونە هێنانە کایەی هەرێمی کوردستان وەك پێگەیەکی جوگرافیو وەك دەسەلاتێکی سیاسی بەسەر سێ فاکتەری ناوخۆییو ناوچەییو نێودەوڵەتی پۆلێنمان کردوون، بەم شێوەیەی خوارەوە.

## یەکەم: فاکتەری ناوخۆیی:

ئەم فاکتەرە، ئەو پاڵنەرە ناوخۆییانەی ناو کوردستان دەگرێتەوە، کە بوون بە هۆکارێك بۆ دامەزراندنی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان. ئەوانەش خۆی لە سێ روداوی گرنگی ساڵی ١٩٩١ دەبینێتەوە کە بریتین لە راپەرینو کۆڕەو، بزوتنەوەی چەکداری پارێزگای سلێمانیو ناوچەی گەرمیان لە هەمان ساڵدا.

لە بەرواری ٥ی مارتی ١٩٩١دا لە شارۆچکەی رانییەوە راپەرینێکی جەماوەری دژی سوپاو دەزگا ئەمنییەکانی حکومەت عێراقی بەرپا کرا، لێرەوە راپەرین تەشەنەی کردو پارێزگای سلێمانی لە ٧-١٠ی مارتی ١٩٩١دا تەواوی ئازاد کراو تا ٢١ی مارت پارێزگاکانی

هەولێرو دهۆکو ناو شاری کەرکوکی گرتەوەو هێزەکانی حکومەتی عێراقی لێ دەرکرا[1]. گرنگترین ئەنجامی ئەم راپەرینە، کە پاشان دەبێتە هۆکارێك بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بریتیی بوو لەوەی دانیشتوانی باشوری کوردستان، ماوەی نزیك مانگێك ژیانیان لە ئازادیدا بە سەر برد، کە ئەم ماوەیە بوو بە هەوێنێك بۆ دوانزە ساڵی دواتر، کە توانیان دوور لە رژێمی بەغداد حوکمی خۆ بەخۆی خۆیان بکەن.

رووداوی دووەم کۆڕەو بوو. لە کۆتایی مانگی مارتو سەرەتای مانگی ئەپریلی ١٩٩١دا حکومەتی عێراقی بە هەموو توانایەکی سەربازییەوە کەوتە سەرکوتکردنی راپەرین. دانیشتوانی ناوچە رزگارکراوەکان لەو باوەڕەدا بوون، کە دەوڵەتی عێراقی هیچ باکی لە دووبارەکردنەوەی پرۆسەی ئەنفالو کیمیابارانی ساڵی ١٩٨٨ نییە. بۆیە لەژێر ئەم کاریگەرییەداو بۆ هەڵهاتن لەدەستی سوپای عێراق، رویانکردنە ناوچە سنورییەکان. ئەوە بوو زیاتر لە یەك ملیۆنو پێنج سەد هەزار روویان کردە سنورەکانی ئێران، نزیکەی نیو ملیۆن کەسیش روویان کردە سنورەکانی تورکیا[2]. پەیوەندیی کۆرەو بە دامەزراندنی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە چەند لایەنێکی لەخۆ گرتبوو. کۆڕەو لە سەردەمی شۆڕشی راگەیاندندا نامەیەکی بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیو بڕیاربەدەستانی جیهان گەیاند، کە میدیاکان سەرکەوتووانە ئەو نامەیەی بڵاو کردەوە، کە بە هیچ شێوەیەك متمانە لە نێوان نەتەوەی کوردو رژێمی سەدام حسێن[3]، نەماوەو لێرە بەدواوە کوردو بەغداد دوو

---

[1] بروانە عەبدولرەزاق مەرزەنگ: راپەرین بەهاری ئازادی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٦٢-٦٨

[2] Human Rights Watch :The 1991 uprising in Iraq and its aftermath, copyright June 1992 Number: 92-72351 ، www.hrw.org.

[3] سەدام حسین (١٩٣٧-٢٠٠٧) لە پارێزگای تکریت لە بنەماڵەیەکی جوتیار لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٥٧ پەیوەندیی بە حزبی بەعس کردووە. لە ساڵی ١٩٥٩بەشداری هەوڵێکی شکستخواردوی تیرۆرکردنی سەرۆك وەزیرانی عێراق عەبدولکەریم قاسم کردووە. لە دوای کودەتای حزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٨، دەسەڵاتی خۆیو پارتەکەی بەسەر سوپای عێراقیدا سەپاندووە. لە ساڵی ١٩٦٩ بووە بە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش. لە ساڵی ١٩٧٩ بووە بە سەرۆك کۆماری عێراق تا

جەستەی تەواو لەیەك پچڕاون. هاوکات هەر ئەو میدیا جیهانیانە پەیامێکی تریان گەیاندە خاوەن بریارە جیهانییەکان، ناوەڕۆکەکەی ئەوە بوو، کە کورد جگە لە چیاکان، دۆستێکی تریشی بۆ پەیدا بووە ئەویش رای گشتی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە کە پێشتر دەوڵەتان بەسەریدا زاڵ بوون، ئێستا بەهۆی میدیاکانەوە رای گشتی جیهانی دوور لە دەسەڵاتی دەوڵەت هێما لە بیرو بۆچونەکانی خۆی دەکات. هاوکات ئەگەر راپەرین ویستێکی پارتە کوردییەکانی لە پشتەوە بوو بۆ دەرکردنی دامودەزگاکانی حکومەتی بەغداد، ئەوا کۆڕەو بە تەواوی ویستێکی جەماوەری بوو بۆ هەڵهاتن لە دەستی ئەو دامودەزگایانە. وێرای ئەمە راپەرین نە ئەو پیشگیرییە نێودەوڵەتییەی بەدەست هێنا کە کۆڕەو بۆ کوردی بەدەست هێنا. بۆیە لەژێر کاریگەری ئەو کۆرەوەدا بوو، کاتێك، کە دەسەڵات لە هەرێمی کوردستان لە رێگای هەڵبژاردنو پەرلەمانو حکومەت کەوتە سەر پێو لەبری پرۆتێست، پشگیریەکی نێودەوڵەتی بۆخۆی بەدەستهێنا[1].

رووداوی سێییەم، بریتی بوو لەقوڵبونەوەی ململانێکانی نێوان کوردو بەغداد. لە مانگی ئەپریلی ١٩٩١دا سەرکردایەتی کورد وەلامێکی داواکاریەکانی سەدام حسینی دایەوە بۆ دانوستان لەسەر چارەسەر کردنی کێشەی کورد. ئەم داواکارییەی بەغداد لە کۆتایی مانگی مارسدا بوو. واتە لەکاتێکدا خرایە بەردەم سەرکردایەتی کورد، کە ناو شاری کەرکوكو تەواوی پارێزگاکانی هەولێرو سلێمانیو دهۆکی بەدەستەوە بوو. بەلام لە کاتێکدا کورد وەلامی بەغدای دایەوە کە لەسەر سنوری ئێرانو تورکیا بە ئاوەرەیی ژیانی بەسەر

سالی ٢٠٠٣. کەسایەتییەکی دکتاتۆری بووە، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتیدا عێراقی توشی سێ جەنگی گەورە کردووە، کە یەکەمین جەنگی کەنداو (١٩٨٠-١٩٨٨). دووەمین جەنگی کەنداو (١٩٩١). جەنگی عێراقو ئەمریکا (٢٠٠٣). الان غريش و دومينيك ڤيدال: الابواب المائية للشرق الاوسط، ت: ميشال كرم، دار الفارابي، بيروت، ٢٠١٠، ص ص ٢٩٥-٢٩٨.

[1] شەوکەت حاجی مشیر: چیوەرۆ دەروازەیەك بەرەو کەرکوك، چاپخانەی قانع، سلێمانی،٢٠٠٣، ل ل١٤٥-١٤٧. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر رۆڵی میدیاکان لە کارەساتی کۆڕەو، بڕوانە: عومەر نورەدینی: سیستەمی نوێی جیهانو دۆزی کورد، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ل ١٥١-١٦٣.

دەبرد[1]. لە کاتی دانوستاندا، جەماوەری کوردستان وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ ناو شارەکان. ئەو شارانەی، کە حکومەتی بەغداد بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاوارە گەڕاوەکان، هەڵبژاردەی پیاوە سەرسەختەکانی بواری سەربازی‌و ئاسایششی تیدا دامەزراندبوو. گەڕانەوەی ئاوارەکان لە هەبوونی دەزگا سەرکوتکارییەکانی بەغداد، بە بەردەوامی‌و لێرەو لەوێ، بوو بە هۆی سەرهەڵدانی راپەڕینی لۆکاڵی‌و پێکدادانی چەکداری[2]. دوا بەدوای ئەم جولآنەوەیە، لە سلێمانی‌و سنووری شارۆچکەی کەلارو چەمچەماڵدا هێزەکانی (ی.ن.ک) لە مانگی یۆلیۆدا، لە دژی سوپای عێراقی کەوتنە شەڕی روو بە رووەوە. ئەوە بوو چەندین کەسیان لێکوشتن‌و ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرو سەرباز بەدیل گیرا. کە بە رای یەکێك لە سەرکردە سەربازی‌و سیاسییەکانی ئەو راپەرینە، دامەزراندنی دەسەلآتی هەرێمی کوردستان بۆ ئەو چالاکییە جاماوری‌و چەکداریانە دەگەڕێتەوە[3]. لەم سۆنگەیەوە حکومەت گەیشتە ئەو ئەنجامەی، کە چیتر سوپاو دەزگا ئەمنییەکانی لە هەرێمی کوردستان لە بارێکی نائارامدان. ئەوە بوو دامودەزگا کارگێری‌و سوپایی‌و ئاسایشییەکانی بۆ پارێزگای کەرکوك کشانەوە لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٩١[4]. لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا، دانوستاندن هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوەو لە ١٤ی ئۆگستۆسی ١٩٩١ پرۆژەی دانوستانی

---

[1] نەوشیروان مستەفا: مفاوەزاتی بەرەی کوردستانی-بەعس(١٩٩١): چاپخانەی جەمالی عەلی باپیر، سلێمانی، ٢٠٠٩،ل١٥-٢١. مام جەلال: راپۆرتی سیاسی،چاپی دووەم، ئۆفیسێتی رۆناکبیری، سلێمانی،٢٠٠٠،ل٥٢.

[2] نەوشیروان مستەفا: مفاوەزاتی بەرەی کوردستای، ل٨١-٨٢

[3] چاوپێکەوتنی رۆژنامەنوس مەگدید سەپان لەگەڵ جەبار فەرمان: بەرپرسانی حکومەتی هەرێمی کوردستان،ستۆکهۆلم، ١٩٩٤، ل٤٧-٤٨. نادر ئینتسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کورد: وەرگێرانی: عەتا قەرەداغی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣١٧.

[4] فرسەت ئەحمەد عبداللهو ئەوانی تر: کوردستان دیموکراتی سیاسەت، چاپی سێیەم، چاپخانەی خەبات، هەولێر، ساڵی ٢٦٩٩ی کوردی. ل ٥٦.

نێوان بەغدادو هەولێر بەبن بەست گەیشت[1]. ئەمە بۆشایی دەسەڵاتی لە هەرسێ پارێزگای دهۆکو هەولێرو سلێمانی دروستکرد. بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە، هەروەها بۆ دیاریکردنی چارەنوسی پەیوەندی نێوان بەغدادو ناوچە رزگارکراوەکان بە جۆرێك جەماوەری کوردستانو سەرجەم پارتەکان لایان پەسەند بێت، بەرەی کوردستانی بریاری یاسای هەڵبژاردنەکانی دەرکرد. ئەوە بوو لە ١٩ی مەی ١٩٩٢ هەڵبژاردن کراو لە ٤ی یۆنیۆدا یەکەم دانیشتنی خۆی سازداو لێرەوە دەسەلات لە هەرێمی کوردستان شەرعییەتی ناوخۆیی بەدەست هێنا[2].

## دووەم: فاکتەری ناوچەیی:

مەبەستمان لە فاکتەری ناوچەیی، روداوەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستو کاریگەرییەتی لەسەر دامەزراندنی هەرێمی کوردستان، کە دابەش دەبن بەسەر چەند رووداوێکدا، لەوانە دووەمین جەنگی کەنداو ١٩٩٠، کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە لە بەرە بەیانی ٢ی ئۆگستۆسی١٩٩٠. دەستبەجێو هەمان رۆژ، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری (٦٦٠)ی پەسەندکرد بۆ کشانەوەی سوپای عێراقی لە کوەیت بەبێ هیچ مەرجێك[3]. دواتر بڕیاری (٦٧٨) دەرکرا لە نۆڤەمبەری١٩٩٠، بە پێی بڕیارەکە، ئەنجومەنی ئاسایش هەموو ڕێگایەکی بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت بەڕەوا لەقەڵەم دا. لەم سۆنگەیەوە هاوپەیمانییەك بە سەرکردایەتی ئەمریکاو بە بەشداربونی (٣٠) دەوڵەت پێکهات. ئەم هاوپەیمانییە ١٧یەنایر–٢٤ی فەبرایری١٩٩١ لەگەڵ عێراق کەوتنە

[1] نەوشیروان مستەفا: مفوەزاتی بەرەی کوردستانی–بەعس(١٩٩١، ل١١٨–١١٩

[2] فرسەت ئەحمەد عەبدولاو ئەوانی تر: هەمان سەرچاوە، ل٥٦–٥٧.

[3] ریاض السندی: قراءة فی القرارات مجلس الأمن، الحلقة الاولی، مجلة (متین)، عدد(٧٠)، ١٩٩٧، ص٨٢.

جەنگی سەربازییەوە، کە بە دووەمین جەنگی کەنداو ناسرا[1]. لە ئەنجامدا عێراق لەو جەنگەدا شکستی خواردو سوپاکەی لە کوەیت دەرکراو بڕیاری (٦٨٧)ی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەسەندکرد. دوای ئەوەی (١٥٠) هەزار کوژراو لە سەربازو سڤیل‌و (١٧٠)ملیار دۆلار زیانی لێکەوت[2]. بە سەیرکردنی کاریگەرییەکانی جەنگ لەسەر عێراق، دەبینین، کە عێراق لێرە بەدواوە ئەو هێزە مەزنەی لەدەستدا کە هەرێمی کوردستانی پێ کۆنترۆڵ کردبوو. هەر بۆیە لە کاتێکدا جەنگ بەرەو کۆتایی دەچوو، راپەرینی جەماوەری لە هەرێمەکە دەستی پێکرد، کە بوو بە سەرەتاییەك بۆ دامەزراندنی دەسەلاتی کوردی لە هەرێمی کوردستان.

رووداوی دووەم، کە لەسەر ئاستی ناوچەیی کاریگەریی لەسەر هەرێمی کوردستان هەبوو هەڵوێستی دەوڵەتانی دراوسێی هەرێمەکە بوو، کە هاندەر بوو بۆ هاتنەکایەی هەرێمەکە. ئێران‌و تورکیا ژمارەیەکی زۆر ئاوارە روی تێ کردبوون، هەربۆیە ئاوارەکان لەرووی ماددیەوە ئەرکێکی گرانیان لەسەر شانی ئەو دوو دەوڵەتە دانابوو، لە لایەکی تر ئەو دوو دەوڵەتە لەوە دەترسان، کە ئەو ئاوارە کوردانە ئاسایشی وڵاتەکانیان بشێوێنن، لەم سۆنگەیەوە هەردوولا یاداشتێکیان گەیاندە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە ناوەڕۆکەکەی باسی لەوە دەکرد، پێویستە ئەو ئاوارانە بگەڕێنەوەو دەسدرێژییەکانی رژێمی عێراقیشیان لەسەر هەڵبگیرێت تا ئارامی‌و ئاسایشی ناوچەیی نەشێوێنن[3]. سوریا وەك دەوڵەتێکی ناوچەیی دژایەتی ئەم هەوڵەی تورکیاو ئێرانی نەکرد، چونکە سوریا لەو کاتەدا یەکێك بوو لەو (٣٠) دەوڵەتەی کە هاوپەیمانی ئەمریکا بوو لە دووەمین جەنگی کەنداو، هەروەها رکەبەری

---

[1] یەکەمین جەنگی کەنداو، لە نێوان عێراق‌و ئێراندا بوو کە لە ١٩٨٠ دەستی پێکردوو لە ٨ی ئۆگستۆسی ١٩٨٨ کۆتایی هات. ئەم جەنگە هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەدا جگە لە زەرەرو زیانی مرۆیی‌و مادی کە هەردوو دەوڵەتەکەی گرتەوە.

[2] ماریون فارووق سلوغلت و بیتر سلوغلیت: من الثورة الی الدیکتاتوریة، العراق منذ ١٩٥٨، ترجمة مالك النبراسی، منشورات الجمل، ألمانیا، ٢٠٠٣، ص٣٧١.

[3] بڕوانە باشکۆی ژمارە (٢)، ژمارە (٣).

سەرسەختی عێراق بوو[1]. ئەم هەڵوێستانە وەك رازیبوونێکی ناوچەیی بوو بۆ پاراستنی کورد لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. هەروەها کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ئەمەی بە گڵۆپێکی سەوزی ناوچەیی زانی بۆ پاراستنی کوردەکان کە دواتر بریاری(٦٨٨)[2] یان بۆ دەرکرا، کە کورد لە سایەیدا دەسەڵاتێکی بۆخۆی پێکهێنا.

## سێیەم: فاکتەری نێودەوڵەتی:

مەبەستمان لەم فاکتەرە کاریگەریی رووداوە جیهانیەکانە لەسەر دامەزراندنی دەسەڵات لە هەرێمی کوردستاندا، کە ئەوانەش رووخانی یەکێتیی سۆڤیەت و پێکهێنانی ناوچەی دژە فرینە. یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩٠ دەستوری نوێی راگەیاند، کە کۆتایی بە رژێمی تاکە پارتی لە سۆڤیەت هێنا. بەو پێیە لە یۆلیۆی ١٩٩١ سیستەمی کۆنفدراڵی جێگای سیستەمی فیدراڵی ساڵی ١٩٢٢ی گرتەوە. لە رووی ئابورییەوە دەوڵەت دەستی کرد بە پەیرەویکردنی ئابوری ئازادو کەرتی گشتی کەوتە بەردەم شاڵاوی بە تایبەتمەندی بوون (الخصخصە). هەموو ئەمانە لە لایەن حزبی شیوعی دژایەتی کرا، لەم کاتەدا (بۆریس یەڵسن) وەك سەرۆکی کۆماری روسیا، دژایەتی ئەو پارتەی کردو لە روسیادا کاری سیاسی لێقەدەغە کرد. ئەمە وایکرد یەکێتی سۆڤییەت هەردوو سیستەمی (یەکێتی-فدراڵی)، (سۆڤییەت-شیوعی) لەدەستدا. میخائیل گۆرباچۆڤ وەك سکرتێری گشتی ئەو پارتەو هەروەها وەك سەرۆکی یەکێتی سۆڤییەت، پارتەکەی هەڵوەشاندەوەو دەسبەرداری

[1] بروانە بەشی چوارەم،تەوەری دووەم، ل ١٤٦-١٤٧.

[2] گرنگترین خاڵی ناو ئەم بریارە (٦٨٨)، ئەوە بوو کە سەرکوتکردنی دانیشتوانی عێراق بەتایبەت لە "ناوچە کوردنشینەکان" هەرەشە لە ئاشتیو ئاسایشی ناوچەییو نێودەوڵەتی دەکات. پێویستە عێراق دەستبەجێ سەرکوتکردن بوەستێنێت. هەروەها یارمەتی مرۆیی لە رێگای رێکخراوە نێودەوڵەتیو ناحکومیەکان بگەیەنرێتە دەستی ئەوانەی زەرەرمەندی ئەو ستەمکاریە بوون لە "ناوچە کوردیەکان". بۆ زانیاری زیارت لەسەر دەقی بریارەکە بروانە: الحرب علی العراق، یومیات-وثائق-تقاریر، ١٩٩٠-٢٠٠٥، مرکز دراسات الوحدة العربية، بیروت ٢٠٠٧. ص٤٩٨.

پۆستی سکرتێر بوو. هەروەها لە ٢٥ی سێپتەمبەری ١٩٩١دا نەمانی یەکێتی سۆڤیەتی لەسەر نەخشەی جیهان راگەیاند. هەمان رۆژ جۆرج بۆشی باوك وەك سەرۆکی ئەمریکا سیستەمەی نوێی جیهانی راگەیاند، کە وەك راگەیاندنی کۆتایی هێنان بوو بە سیستەمی دوو جەمسەری‌و دەستپێکردنی سیستەمی تاکجەمسەری[1]

لە سایەی سیستەمی نوێی جیهانیدا، کێشەی کورد کرانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی. ئیدی رۆژئاوا ئەو ترسەی نەما، کە یەکێتیی سۆڤیەت کوردو کێشەکەی بەکار بهێنێت بۆ پەیدا کردنی نفوز لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا. لێرەدا کاتێك دانانی بەردی بناغەی دەسەلات لە هەرێمی کوردستان ببووە باس‌و خواسی سیاسی‌و یاساییەکان، ئەمریکاو رۆژئاوا لەبری دژایەتی، پشگیری کورد بوو لە بەرِیوەبردنی خۆبەخۆدا. ولایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا وەك سەرکردەی هێزە هاوپەیمانەکان لە دووەمین جەنگی کەنداو دوای یەك رۆژ لە هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان بەم شێوەیە هەڵوێستی خۆی دەربری: بۆ دیاریکردنی ستراتیجی کاری ئەمریکا لەبەرامبەر هەرێم، کۆنگرێس یاسایی ژمارە (٢٩٩) لە(٢٠ی مایۆی ١٩٩٢) دەرکرد بریتی بوو لە: مانەوەی سوپای ئەمریکی لەخاکی تورکیا درێژبکرێتەوە لە دوای ماوەی تەواوبوونیان، کە مانگی (یۆنیۆ ١٩٩٢) بە مەبەستی (ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی–Operation Provide Comfort). کاری نەتەوەیەکگرتووەکان لە هەرێمی کوردستان "باکوری عێراق"، بەردوامی پێبدرێت. یارمەتی مرۆیی بۆ "کوردی عێراق" دابین بکرێت. ئەمریکا پێویستە تەواوی هەولّی بخاتە گەڕ لە پێناو هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری عێراق لە سەر هەرێمی کوردستان[2].

دووەم ڕووداوی جیهانی بریتی بوو لە پێکهێنانی ناوچەی دژە فرین. لە کۆرِەودا، کە رۆژانە (١٠٠–٢٠٠) کەس دەبوونە قوربانی‌و لەمیدیاکانەوە پەخشدەکرا، وایکرد فەرەنسا پرۆژە بریاری (٦٨٨) گەلالّە بکات‌و پێشکەش بەئەنجومەنی ئاسایش بکرێت‌و لەلایەن ئەم

---

[1] محمد سليم سيد: تطورات السياسة الدولية، مطبعة مدبولي ، القاهرة، ٢٠٠٨، ص ٦٤٣–٦٤٦.

[2] EXPRESSING SENSE OF CONGRESS REGARDING KURDS IN NORTHERN IRAQ (House of Representatives – June 02، 1992 .thomas.loc.gov\hower\rlo2query.htm

ئەنجومەنە پەسەند بکرێت لە ٥ی ئەپریلی ١٩٩١. گرنگی ئەم بڕیارە لەوەدابوو، بۆ یەکەمجار کورد وەك نەتەوەیەکی ستەمدیدە ناوی چووە ناو بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان[١]. لەم سۆنگەیەوە فەرەنساو پاشان بەریتانیاو دواتر ئەمریکا، لەبەر ئەنجامی کۆمەڵێك بۆچوون و پرۆژە بۆ پاراستنی ئاوارەکان لە هەڕەشەی برسیەتی و ئاوارەیی و مەترسی عیراق، لەبەر ڕۆشنایی بڕیاری (٦٨٨) لە لایەن سەرەك وەزیرانی بەریتانیا جۆن مێجەر، پێشنیاری بیرۆکەی (ناوچەی پارێزراو–Safe Haven) کرا، لەلایەن ئەمریکاوە لەژێر ناوی ناوچەی دژەفڕین–No-fly Zoon) چووە باری جێبەجێکردن. لە بنکەی ئەنجەرلیك لە باشوری ڕۆژئاوای تورکیا فڕۆکە ئەمریکیەکان ئاسمانی هەرێمی کوردستانیان کۆنترۆڵ کرد، دواتر (ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی–Operation Provide Comfort) بۆ ئاوارەکان دەستپێکرا لەلایەن سوپایەکی نێودەوڵەتی فرەڕەگەز*، کە (٩٤٩٣) سەرباز پێکهاتبوون[٢]، بۆ فەراهەمهێنانی ناوچەیەکی ئارامو ئاسایش، تا ئاوارەکان بە دڵنیایی لەژیانیان و دوور لە مەترسی سوپای عێراق بۆ شارو شارۆچکەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. ئەم هێزە تا مانگی سێپتەمبەری ١٩٩١ لەناوچە سنوریەکانی هەرێمی کوردستاندا بوون. دوای گەڕانەوەی زۆرینەی ئاوارەکان، پاشەکشەیان بۆ ناو بنکەی ئەنجەرلیك کرد لە ناو خاکی تورکیاو لە قەزای زاخۆ سەر بەپارێزگای دهۆك نوسینگەیەکیان دامەزراند بە ناوی (سەنتەری هەماهانگی سەربازی–Military Co-ordination Center) کۆکراوەکەی (MCC) بوو[٣]. هەرچەندە

---

[١] رواء محمد ملا: سياسة التدخل الامريكي دراسة الحالة في شمال العراق، رسالة ماجستير، غير منشورة، كلية العلوم السياسة، جامعة بغداد ،١٩٩٨، ص ١٢٣ .

* ئەم سوپایە پێکهاتبوو لە سەربازانی :ئەمریکا،بەریتانیا،فەرەنسا،ئەڵمانیا،کەنەدا،ئیسپانیا،ئیتالیا.

[٢] بۆ زانیاری زیارت بڕوانە: عبدالرحمن سليمان الزيباري: الوضع القانوني لأقليم كوردستان العراق في ظل قواعد القانون الدولي، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠. ص ٢٨٦– ٢٩٦.

[٣] ئەرەکی ئەم نوسینگەیە بریتی بوو لە پاراستنی پرۆسە مرۆییەکان لە هەرێمی کوردستان. ئەندامانی ئەم نوسینگەیە لە حەوت ئەفسەرو چوار فەرمانبەر پێکهاتبوو لە هێزەکانی بریتانیاو فەرەنساو تورکیا بەسەرکردایەتی ئەمریکا، کە تا ئۆگستۆسی ١٩٩٦ کاریان بەردەوام بوو.

بڕیاری ٦٨٨ بە هێچ شێوەیەك باسی دەسوەردانی سەربازی نەکردبوو، بەلآم ئەمریکا بە پشت بەستن بەو چەمکە یاساییەی، کە لە بڕیارەکەدا هاتووە " گێڕانەوەی ئاشتی جیهانیو ئاسایش"، ئەو کارەی ئەنجامدا. بە مانایەکی تر ئامانجی بڕیارەکە بریتی نەبوو لە پاشەکشە پێکردنی دەسەلآتی سەدام لە هەرێمی کوردستان، بەڵکو بریتی بوو لەوەی، کە هەرێمەکە نەبێتە بنکەیەك بۆ تێکچوونی ئاسایشو سەقامگیری ناوچەکە[1]. بەلآم ئەمریکا سودی لێوەرگرت بۆ چاودێری کردنی ڕژێمی بەغداد، هاوکات کورد لە سایەی ئەو چاودێرییەدا کە ماوەی ١٢ساڵی خایاند، دەسەلآتی هەرێمی کوردستانی بەڕێوەبرد.

---

Evelyn N. Farkas, Fractured states and U.S. Foreigy: Iraq, Ethiopia and Bosnia in the 1990s. (NewYork Palgrave Macmilan-2003), pp 30-31.

[1] İdris DEMİR THE NORTHERN IRAQ: 1990-2000 ZKÜ Sosyal Bilimler Dergisi, Cilt 3, Sayı 5, 2007, ss. 193-207

# تەوەری دووەم

## باری کۆمەڵایەتی و ئابووری هەرێمی کوردستان

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ نیشتەجێکردنی مرۆیی (Habitat)، لە ساڵی١٩٩٩، ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی بە (٣.٥١٥.٩٢١) کەس خەملاندووە. زۆرینەی پێکهاتەی دانیشتوانەکەی لە نەتەوەی کوردە، بەجۆرێك بەپێی ئاماری (١٩٨٧)ی حکومەتی عێراقی، ڕێژەی کورد لەپارێزگای دهۆك (٨٣.٣ ٪)، هەولێر(٧٨.٨٪)و سلێمانی نزیکەی(١٠٠٪) پێکدەهێنێت[1]. ئەوی تری لە ڕەگەزی تورکمان‌و ئاشوری‌و عەرەب بووە. دابەشبوونی دانیشتوان پەشێوییەکی زۆری پێوە دیار بوو ئەمەش لەژێر کاریگەری دوو فاکتەردا بوو. یەکەمیان، لە بەرئەنجامی سیاسەتە جۆراوجۆرەکانی ڕژێمی عێراقی بوو لە بەرامبەر کورد بە تایبەت لە دوای ساڵی ١٩٧٥–٢٠٠٣. فاکتەری دووەمیان لە جەنگە ناوخۆییەکانی هەرێمی کوردستانەوە لە ساڵی (١٩٩١–٢٠٠٣) سەرچاوەی گرتبوو. بە جۆرێك دەتوانین بڵێین هەرێمی کوردستان لە دوای ساڵی ١٩٩١ بریتی بوو لە هەرێمی قوربانییەکان. یان نیشتمانی ئاوارەکان. لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠دا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ

---

[1] IDP sit and family survey final fetor ,2001 www.VNHABITTAT.ORG /IRAQ/ DOCVMENNTS/IDP SVRVEYST.DOC. ، خليل إسماعيل محمد: أقليم كوردستان العراق، دراسات في تكوين القومي للسكان، مطبعة أوفسيت كريستال، أربيل ١٩٩٨، ص٥٨.

نیشتەجێکردنی مرۆیی (Habitat)، زیانلێکەوتوانی ناو هەرێمەکەی کردووە بە نۆ بەش بەم شێوەی خوارەوە:

1. راگوازراوەکانی حەفتاکان‌و هەشتاکان تا ساڵی ١٩٨٧، بریتی بوون لە ٢٧٢.٣٤٧ کەس.
2. قوربانییەکانی هەڵەبجەو ئەنفال لە ساڵی ١٩٨٨، بریتی بوون لە ٢٢٢,٨٣٩ کەس.
3. قوربانییەکانی پاکتاوی رەگەزی. واتە لە پارێزگای کەرکوك‌و ناوچە کوردییەکانی بن دەستی حکومەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٩١ بەدواوە. ٥٨,٧٠٦ کەس.
4. قوربانی جەنگی ناوخۆی هەرێمی کوردستان ٧٧,٠٠٤ کەس.
5. گەڕاوەکانی ئێران ٤٠,١٤٥ کەس.
6. ئاوارەکانی ئێران٤٩١ کەس.
7. ئاوارەکانی تورکیا ٢,٥٥٢ کەس.
8. قوربانییەکانی ململانێی (پ.ك.ك) ١٥.٣٣٥ کەس.
9. هی تر ١٦,٠٨٦ کەس.

کۆی گشتی دەکاتە ٨٠٥,٥٠٥. بێجگە لە ٥ هەزار ئاوارەی تورکمانی، کە لە پارێزگای کەرکوکەوە روویان کردبووە هەرێمەکە، هەروەها ٣٠٠ خێزانی ئەنجامی شەری (ی.ن.ك) لەگەڵ ئیسلامییە توندرەوکانی نزیك شارۆچکەی هەڵەبجە[1]. ئەم کۆمەڵانە زۆرینەیان بەسەر ئۆردوگا زۆرە ملێکاندا نیشتەجێبوون، کە ژمارەیان ١٠١ ئۆردوگا بوو[2]، کە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی بریتی بوو لە بێکاری‌و کێشەی خێلایەتی‌و نەبوونی خزمەتگوزاری.

لە لایەکی تر هەرێمەکە بەردەوام لەژێر ئابلۆقەی ئابوری نێودەوڵەتی‌و ناوچەیی‌و هەندێك جار ناوخۆیشدا بوو. نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاری (٦٦١) لە(٦ی ئۆگستۆسی١٩٩٠) دەرکرد، کەهەموو مامەڵەیەکی دارایی‌و بازرگانی نێودەوڵەتی لەگەڵ عێراق قەدەغەکرد، لەرێکەوتی (٢٥)ی هەمان مانگدا، بەپێی بڕیاری (٦٦٩) گەمارۆی ئابووری بەسەر عێراق

1 John Fawcett and Victor Tanner: The Internally Displaced People of Iraq: THE BROOKINGS INSTITUTION – SAIS PROJECT ON INTERNAL DISPLACEMENT October 2002, P16

2 گەراس ئار. ڤی. ستانسفیلد: سەرچاوەی پیشوو، ل ٤١٧

سەپا[١]، گەورەترین کاریگەری پەیدابوونی دیاردەی هەڵئاوسان بوو، لەساڵی (١٩٩٣) رێژەکەی (٣٠٧.٦٪) بوو، لەساڵی (١٩٩٥)دا بۆ (١٥٩٣.١٪) بەرزبووەوە[٢]. بۆ نموونە نرخی یەك لیتر بەنزین لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ بوو بە ٨ دینار لە کۆتایی ١٩٩٥ بوو بە ٣٥ دیناری عێراقی[٣]. ئەم بارودۆخەی سەرەوە، هەرێمی کوردستانیشی گرتەوە، بە نموونە هەڵئاوسان لەپارێزگای سلێمانی ساڵی (١٩٩٤)، (٣٤٪) بووە، لەساڵی(١٩٩٧) بۆ رێژەی (٦٥٪)* بەرز بووەتەوە.[٤].

هەرێمی کوردستان وەك بەشێك لە عێراق لەو ئابلۆقە ئابورریەدا هاوبەش بوو. لە لایەکی تر ئابلۆقەیەکی تریشی لەسەر بوو، کە لە ٢٦ی ئۆکتۆبرەی ١٩٩١، حکومەتی عێراقی بەسەر هەرێمدا سەپاندی. جگە لەوە گورزێکی تری لە ئابوری هەرێمەکە دا بە کێشکردنەوەی پارەی (٢٥) دیناری چاپی سویسرا، کە زیانی هەرێمەکە بە (٢٠)ملیۆن دۆلار خەمڵێنرا[٥]. حکومەتی بەغداد، ٢٥ دیناری چاپی سویسرای کێشایەوە لە بازارو بە ٢٥٠ دیناری کۆپی کراو گۆرییەوە. بەهۆی داخستنی سنورەکانی لەگەڵ هەرێم، کوردی لەو گۆرینەوەیە بێبەش

---

[١]تیم نبلوك: العقوبات والمنبوذون في الشرق الاوسط، العراق، ليبيا،السودان، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت،٢٠٠١، ص٣٢-٣٣.

[٢]مجموعة الباحثين: الاقتصاد العراقي ومتغيرات البيئة العربية والدولية، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢، ص٤١٨-٤٢٠.

[3] Firat Bozcali: Managing oil in Kurdistan-Iraq: 1991-2003.International Association of Contemporary Iraqi Studies (IACIS).16-17 July 2008 SOAS, University of London, P3

* ئەم رێژەیە بەپێی پارەی چاپی سویسری دەرکراوە.

[٤]اسماعيل مصطفى عبدالرحمن: واقع البطالة في اقليم كوردستان، مع تركيز خاص على محافظة السليمانية (١٩٩٠-٢٠٠١)، گۆڤاری سەنتەری ستراتیجی کوردستان، ژمارە(٣)، ساڵی سیانزەهەم، ٢٠٠٥، ل٢٣٩-٢٤٠.

[٥] جيهانگير كرمي: گزارش از تحولات شمال عراق در هة١٩٩٠ (٧٦-١٣٦٩)، مجلة (سياست دفاعى)، شمارة ٢١-٢٠، ١٣٧٦، ل٢٠٥-٢٠٦.

کرد ئەمەش وایکرد، کە نرخ لە بازاردا بەرز بێتەوە. خواردەمەنی ٢٥٪ۆ بەنزین، ٣٠٪و گازوایل، ٥٧٪ . ئامانجی بەغداد لەم کارانە ئەوە بوو کە وەك سەدام حسین ڕایگەیاند، بۆ هاندانی جەماوەری کورد بوو لە دژی دەسەلأتدارانی هەرێم[1] . هەروەها ئەمەش وەك فشار بوو لەسەر کورد بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆو گەرانەوە بۆ بەغداد. هەروەها بۆ هەلگرتنی سزا ئابورییەکان بوو لایەن ئەنجومەنی ئاسایش، کە عێراق دەیویست لە ڕێگای فشارخستنە سەر هەرێم، کۆمەلگای نێودەولەتی بە هەلگرتنی سزاکان لەسەر ، ناچار بکات[2] .

وێرای ئەمە لە کاتی شەری نێوان لایەنە کوردییەکاندا گەمارۆی ئابوری وەك چەك لە دژی یەکتر بەکار دەهات. لە شەری حکومەتی هەرێم لەگەڵ (پ.ك.ك) دوو جار (پ.ك.ك) ڕێگای سنوری نێوان هەرێمو تورکیای گرت لە ئۆگستۆسو سێپتەمبەری ١٩٩٢ گرت. کە بە ڕێژەی ٣٠٠٪ نرخی خواردەمەنیو دەرمانی لە هەرێمەکە بەرزکردەوە[3] . هەمان شێواز لە جەنگی ناوخۆی (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) لە دژی یەکتر بەکار دەهات، کە بە زیانی هاولأتی تەواو دەبوو.

کەرتی کشتوکاڵی یەکێك لە کەرتەخراپەکانی هەریمەکە بوو. ئەمەش لە ژێرکاریگەری کەمی ئامێرە کشتوکاڵیەکانو گرانبونی پەینی کیمیاییدا بوو. ئامێرەکانی کەرتی گشتی لەدوای ١٩٩١، بەرەو لەناوچوون دەچوون. ئەم ئامێرانە سەرچاوەی داهاتی پارتەکان بوون، دوای ئەوەی دەستیان بەسەردا دەگرتو لەسەر سنوری ئێران دەیانفرۆشتن. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠، ژمارەی تراکتۆرە کشتوکاڵییەکان لە سلێمانی، ٣٧٨٣ دانە بووە. لە هاوینی ١٩٩١، تەنها ٢٦٣٩ دانەی ماوەتەوە ئەمەش بەهۆی سەرهەڵدانی دیاردەی بە تالأنبردنی ئامێرو مەکینەکانی کەرتی گشتی بوو .کە کاریگەری هەبوو بۆ سەر کەمبونەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی، لەگەڵ ئەوەی زەوییە کشتوکالییەکانیش لە زیادبوندا بووە. بە جۆرێك لە ساڵی ١٩٩٠ ، زەوییە کشتوکاڵییەکان لە ٤٨٪ بووە. بەلأم لە ساڵی ١٩٩٣ بۆ ٦٨٪ زیادی

---

[1] خطاب (صدام حسین ) بمناسبة بیان ازار، جریدة(الجمهوریة)، العدد(٨١٤٠)، ١٢\١٠\١٩٩٢،.

[2] مراد خۆشەڤی حەسۆ: گۆرانکارییەکانی کوردستانی عێراقو پەیوەندییەکانی تورکیاو عێراق ١٩٩٠-٢٠٠٥. چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨،ل ٩٤-٩٥.

[3] Firat Bozcali: op. cit. P7.

کردووە. هاوکات رێژەی لادێنشین لە هەرێمدا لە ساڵی ١٩٩٠-١٩٩٣ بەرێژەی ٣٪ بەرز بووەتەوە[1]، بەلاّم لەگەڵ زیادبونی رێژەی لادێنشینو زەوی کشتوکاڵی، کەچی رێژەی بەرهەمهێنان لە دابەزیندا بووە. بۆ نموونە بەرهەمی یەك غەلەی گەنم (کغم/دۆنم)، لە ساڵی ١٩٩٠ (٢٨٥,٦) بووە. بەلاّم لە ساڵی ١٩٩٤ دابەزیوە بۆ (٢٢٢,٧) . هاوکات لەگەڵ دابەزینی رێژەی بەرهەمهێنان، نرخەکان لە بەرزبونەوەدا بوون. نرخی فەرمی یەك تەن گەنم لە ساڵی ١٩٩١، (١٨٥٠) دینار بوو. بەلاّم لە ساڵی ١٩٩٢، (٢٩٥٠) دینار بوو. ئەمەش بەرزبونەوەی نرخ بوو بە رێژەی (٥٩٪)[2]. لە کاتێکدا ئەم بەرهەمە ئیکتفای زاتی ٥٩,٢٥٪ کۆمەڵگەی هەرێمی کوردستانی کردووە[3]. بە واتایەکی تر نزیکەی ٤٠٪ هەرێمەکە خۆراکی پێویستی دەست نەکەوتووە.

لەبەرامبەر لاوازی کەرتی کشتوکاڵیدا هەرێمی کوردستان گومرگ داهاتی سەرەکی هەرێمی کوردستان بوو. بە جۆرێك ساڵی (١٩٩٤) رێژەی (٩٢٪)ی داهاتی حکومەتی پێکدەهێنا[4]. گومرگ، ئەو کەلوپەلانەی دەگرتەوە، کە لە ئێرانو تورکیاو عێراق دەهاتنە ناو هەرێمەوە، بەلاّم ئەم داهاتە بەشێوەیەکی سەرەکی لەرێگای (تورکیا-هەرێمی کوردستان) دەستدەکەوت. ئەم رێگەیە لەپێش راپەرینی (١٩٩١)، سەرەکیترین رێگای

---

[1] ئالان ممتاز نوری: مشكلات الملكية الزراعية ودورها في اعاقة التنمية الزراعية فی اقليم كوردستان العراق للسنوات ١٩٩١-١٩٩٥ (محافظة السليمانية نموزجا). رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة السليمانية كلية الادارة والاقتصاد، ١٩٩٦. ل١٣٠

[2] محسن ابراهيم احمد: واقع القطاع الزراعي في اقليم كوردستان اعراق، وسبل تنميته خلال ١٩٧٤-١٩٩٣. ، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الددين، ١٩٩٤، ص ١١١-١١٣.

[3] نفس المصدر السابق، ص ١٢٨.

[4] گوڵدران عبدالرحيم عزيز: واقع النشاط التجاری فی اقليم كوردستان-عراق، (١٩٩٣-١٩٩٨)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة دهوك، ١٩٩٩، ل١٤١.

پەیوەندیی زەمینی نێوان عێراق و تورکیا بوو[1]. لەدوای ساڵی (١٩٩١) ئەم ڕێگایە کەوتە ژێر دەستەڵاتی هەرێمی کوردستان. گرنگی ئەم ڕێگەیە لەرووی ئابووری بۆ هەرێمی کوردستان لەوەدابوو، کە دەستی بەسەر هەموو جۆرە پەیوەندییەکی زەمینی ڕاستەوخۆی نێوان عێراق و تورکیا گرتبوو، بەتایبەت هەناردەو هاوردەی نێوان هەردوو دەوڵەت پێویستبوو لەم ڕێگایەوە بێت، هاوکات گرنگترین ڕێگای بازرگانی دەرەوەی هەرێم بوو، هەموو شمەك و پێداویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی لەم ڕێگایەوە دابیندەبوو، دواجار بەهۆی ئەم ڕێگایە بازرگانیەکی ناڕاستەوخۆ لەنێوان تورکیاو ئێران پەیدابوو، بەتایبەت بۆ کەلوپەلەکانی وەك جگەرەو خواردنەوەی سەرخۆشکەر. بەڵام خاڵی نەرێنی ئەم ڕێگەیە ئەوەبوو، تورکیا دەسەڵاتی تەواوی بەسەردا هەبوو، کە کردبوویە گرنگترین کارتی فشار بەسەر هەرێمی کوردستانەوەو لەکاتی پێویستدا بەکاری دەهێنا، بەتایبەت لەناجێگیرکردنی نرخی دۆلار بەرامبەر دینار لەسەر بازاڕی هەرێمی کوردستان. بۆ نموونە لە میانی ئاڵۆزبونی پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ هەرێم، تورکیا لە کۆتایی ٢٠٠١-کۆتایی ٢٠٠٢ سێ جار ڕێگەکەی داخست[2].

خاڵی گومرگی ئیبراهیم خەلیل ڕۆڵی گەورەی لە کرانەوەی بازارو پەیوەندییە هەمەلایەنەکانی هەرێم لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا بینی، هاوکات داهاتی گومرگی ئەم خاڵە، یەکێك لە سەرەکیترین هۆکارەکانی جەنگی ناوخۆیی هەرێمی کوردستان بوو لە نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك). ئەم خاڵە سنورییە کەوتبووە ناوچەی بن دەستی (پ.د.ك)، بە هۆیەوە دەسەڵاتی خۆی پێجێگیر کردبوو، لە کاتێکدا (ی.ن.ك) بەهۆی بێبەشبونی لەو داهاتە، لە قەیرانێکی دارایی دژواردا بوو. زۆرینەی داهاتی گومرگەکەش لە ڕێگەی گواستنەوی سوتەمەنی عێراقی بوو بۆ تورکیا بە شێوەیەکی نافەرمی. داهاتی ئەم خاڵە گومرگییە روون وئاشکرا نەبوو. بە پێی سەرچاوەیەك، لە ساڵی ١٩٩٦، ڕۆژانە داهاتەکەی، ٨٠٠ هەزار

---

[1] نصيف جاسم المطلبي: موقع تركيا الجيوستراتيجي وأهميته للعراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة، قسم الجغرافيا، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٦. ص٣٥-٣٦.

[2] Firat Bozcali: op. cit. P12

دۆلاری لە بەرهەمە نەوتییەکانو ٢٥٠ هەزار دۆلاری لە گومرگی کاڵا بازرگانییەکان بوو[١].

هەروەها لە سەردانێکی فەرمانبەرانی کۆنگرێسی ئەمریکا بۆ هەرێم لە ساڵی ٢٠٠٠، داهاتی ڕۆژانەی ئەو خاڵە گومرگییەیان لە نێوان یەك بۆ دوو ملیۆن دۆلار خەملاندبوو[٢].

توێژەرێکی تورکیا سەبارەت بە هەناردەکردنی نەوتی هەرێمی کوردستان بۆ دەرەوە لە ساڵانی نەوەدەکان، وردەکاری زیاتری لەم بارەیەوە دەرخستووە. خاوەن ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرە تورکییەکان دوای داگرتنی بارەکانییان لە شارۆچکەی زاخۆ یان موسڵ، جۆرەکانی نەوتییان.لە ناو هەرێمدا دەکری. لە یۆلیۆی ١٩٩٢ ژمارەی بارهەڵگرەکانی لە سنوور دەپەڕینەوە ڕۆژانە٥٠٠ بارهەڵگر بوون لە کۆتایی نەوەدەکان، بۆ ١٥٠٠ زیادی کرد. بەمەش ڕۆژانە ٢٠–٢٥ هەزار بەرمیل سوتەمەنی بە نافەرمی لە هەرێمی کوردستان چووەتە تورکیاوە. تورکیا گرنگی بەم پرۆسەیەدا، چونکە جگە لە سودگرتنی لەو سوتەمەنییە لە بازارەکانی ناوخۆ، هاوکات بۆ بوژاندنەوەی باکوری کوردستان سودی زۆری لێوەرگرت. بوژاندنەوەکە، بەشێکی پەیوەندی بە وەگەڕخستنی بازاری سوتەمەنییەوە هەبوو لە ناوچەکە، بەشێکی تری پەیوەندی بە وەگەڕخستنی کارگەو دەستی کارو سەرمایەوە هەبوو کە بە سود وەرگرتن لە بازارەکانی هەرێم، چالاکی لە ناوچە کوردییەکانی تورکیا زیاتر کردبوو. وێڕای ئەمە کاریکردبوو سەر کەمبونەوەی بێکاری، کە بەهۆیەوە (پ.ك.ك) ی لە گەریلای نوێ بێبەش کردبوو. لە ئۆگستۆسی ١٩٩٧ (ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی تورکیا (Milli Guvenlik Kurulu – MGK)[٣]، لەسەر ئەم پرسە گفتوگۆی کرد. دەرکەوت، کە تەنها لە ساڵی ١٩٩٦،نزیکەی ١.٥ ملیۆن تەن نەوتی عێراق هاتووەتە تورکیا.

---

[١] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٥

[٢] تیم نبلوك: المصدر السابق، ص ١١١

[٣] ئەم ئەنجومەنە پێکدێت لە سەرۆك کۆمارو سەرۆکی وەزیرانو وەزیرانی دەرەوەو ناوخۆو بەرگری، سەرۆکی ئەرکانی گشتی سوپاو سەرکردەی بەشە تایبەتییەکانی سوپا. کۆبونەوەکانیان مانگانەیەو پرسی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا دەخرێتە گفتوگۆوە. لەم کۆبونەوانەدا پێشنیاری بریار بۆ حکومەت دەکرێتو حکومەتیش بە گرنگییەوە لەبەرچاوی دەگرێت. جلال عبدالله معوض: صناعة القرار فی ترکیا والعلاقات العربیة الترکیة، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، ١٩٩٨، ص ٢١.

تورکیا بە هۆی وەرنەگرتنی باجی ئەو سوتەمەنییە، یەك ملیار دۆلاری زیان لێکەوتووە. ئەوە بوو دوای ئەم کۆبونەوەیە تورکیا بریاری لەسەر رێکخستنی هاوردەی نەوتی قاچاخ لە سنوری براهیم خەلیلەوە دەسپێکرد. بۆ یەك بارهەڵگر، ٤ هەزار لیتر بۆ دەستنیشانکرد، ئەگەر راکێشەری پاشکۆی هەبوایە، دەیتوانی ٨ هەزار لیتر باربکات.هەروەها کۆگایەکی نەوتی لە پشت سنور بە قەبارەی ١٥ هەزارتەن دروستکرا کە لە سێپتەمبەری ١٩٩٩ بە تەواوی کەوتە گەر. ئەم کۆگایە راستەوخۆ سوتەمەنییەکانی تیادا خاڵی دەکرایەوەو پاشان لە رێگای بریکاری تایبەتەوە بەسەر هەموو تورکیادا دابەشدەکراو دەفرۆشرا[1].

جگە لەم قەیرانە، کەرتی بازرگانیش لە هەرێمەکەدا لە بارێکی ئاڵۆزدا بوو. لە جەنگی ناوخۆدا (پ.د.ك) بە هۆی پێگەی ئابوری ناوچەی بن دەستی، هەندێك جار ناردنی شتومەکی بۆ سنوری (ی.ن.ك) قەدەغە دەکرد، کە کاریگەریی لەسەر بەرزبونەوەی نرخو پەشێوی بازارەکانی بن دەستی (پ.د.ك) پەیدا دەکرد. هەروەها لە ساڵی (١٩٩٦-٢٠٠٣)، لە نێوان سنوری (پ.د.ك)و(ی.ن.ك)، هەموو کالایەك گومرگی چونە دەرەوەو هاتنە ژورەوەی لە لایەن هەردوو پارتەوە لێوەردەگیرا. ئەگەر کاڵایەك لە تورکیاوە بەناو هەرێمدا بەرەو ئێران بڕۆشتایە، (پ.د.ك) گومرگی هاتنەناوەوەی لەسەر دادەناو کە دەچووە دەرەوەی سنوری (پ.د.ك) بەهەمان شێوە گومرگی چوونەوە دەرەوە لێوەردەگرت. هاوکات (ی.ن.ك) بە هەمان شێوە گومرگی هاتنەو ناوەوەو چونەو دەرەوەی ژێر دەسەلاتی خۆی لێوەردەگرت. ئەمەش وایکردبوو ئەو کاڵایە لە سنوری هەرێمی کوردستاندا زۆرترین باجی دەچووە سەر، کە لە لایەك کاریگەری لەسەر دیاردەی هەڵاوسانی شمەکە دەرەکییەکان هەبوو، لە لایەکی تر رێگرییەکی گەورە بوو بۆ سەر چالاکییە بازرگانییەکانی هەرێمەکە.

بۆیە دەتوانین بلێین لە ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٦ رەوشی ئابووریو کۆمەڵایەتی هەرێمی کوردستان لەوپەری خراپیدا بوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو سیاسەتی نێودەوڵەتیش بەرامبەر بە هەرێمەکە لە سنوری یارمەتییە مرۆییەکان تێپەری نەدەکردو بارودۆخی ئابووریش بە هەموو

---

[1] Firat Bozcali: op. cit. P11-12

شێوەیەك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خراپتر دەبوو. بارزانی لەم بارەیەوە بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە هەوڵی کورد بۆ کۆکردنەوی پشگیریو یارمەتی بۆ کورد لە ئەوروپاو ئەمریکا شکستی هێناوەو ووتی: کورد دوو ڕێگای لەبەردەمدایە "یان دەبێت دیسان ببین بە پەنابەر لە ئێرانو تورکیا یان دەبێت خۆمان بدەینەوە دەست سەدام حسێنو پەنای بۆ ببەین"[1].

ئەم ڕەوشە لە دوای جێبەجێکردنی بریاری (٩٨٦) گۆڕانی گەورەی بەخۆوە بینی. نەتەوە یەکگرتووەکان لە١٤ی ئەپریلی١٩٩٥ ئەم بڕیارەی دەرکرد، بەو پێیە عێراق توانی هەر شەش مانگ تا نرخی (٢) ملیار دۆلار نەوت بفرۆشێت. لە ٢٠ی مایوی١٩٩٦ عێراقو نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بارەیەوە گەیشتنە ڕێکەوتنێك، بەجۆرێك ڕۆژانە لەبەندەری (ئەلبەکر) لەباشوری عێراق (١.١٩) ملیۆن بەرمیلو لەبەندەری یورموتالیکی تورکیا بڕی (٩١٤.٧٦٨) بەرمیل نەوت هەناردە دەکرا. لە ٢٠ی فەبرایری ١٩٩٨نەتەوە یەکگرتووەکان، بەپێی بریاری ١١٥٣بری فرۆشی نەوتی عێراقی، تا نرخی ٥.٢٦ ملیار بەرز کردەوە[2]. بە پێی هەردوو بڕیارەکە داهاتی نەوتی عێراقی، (١٢.٤٪) بەسەرپەرشتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەهەرێمی کوردستان جێبەجێکرا، تا (٣١ی یەنایری٢٠٠٠) بری بڕی (١.٥٦٢.٧٠٠) دۆلار لە هەرێمەکە سەرفکرا[3]. تا مارتی ٢٠٠٣، سێ ملیار دۆلاری بۆ هەرێم دابین کرد کە بەشێکی بۆ خۆراكو بەشەکەی تری بۆ پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی بواری کشتوکاڵو فێرکردنو تەندروستیو نیشتەجێبوون سەرف کرا[4].

گرنگترین کاریگەری ئەم بریارە لەروی ئابورییەوە بریتی بو لە بوژاندنەوی ئابوری هەرێمەکە بۆ نمونە ژمارەی ئەو خێزانانەی کە یارمەتی خۆراکییان جگە لە فۆرمی خۆراك

---

[1] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٥.

[2] تیم نبلوك: العقوبات والمنبوذون، ص٥١-٥٥.

[3] للمزید من العلومات، انظر، نفس المصدر، ص١٠٥-١١١.

[4] Maggy Zanger: Post 11 September jitters for Iraqi Kurds. www.db.idpproject.org/Sites/IdpProjectDb/idp Survey.nsf/wCountries/Iraq

وەردەگرت لە نێوان قۆناغی چوارەم و شەشەمی بریارەکە، لە ۲٥۸۹۹٥ بۆ ۸۰٥۷٥ کەمی کرد. رێژەی بەدەستگەیشتنی ئاوی خواردنەوە لە ٦۳٪ بۆ ۷۲٪ زیادی کرد. بەکارهێنەری ئاو لە لادێکان لە ۲۰-۳۰ زیادی کرد بۆ ٤۰-٥۰ لتر بۆ یەك کەس. لەرووی سیاسیشەوە هەستی پاشکۆبوونی هەرێمی کوردستانی بۆ عێراق لاوازکرد. دوای ئەوەی لە ئەنجامی گەمارۆی دەوڵەتی عێراقیو جەنگی ناوخۆ ئەو هەستە سەری هەڵدابوو، لە دوای جێبەجێکردنی بریارەکەو تەواوبونی جەنگی ناوخۆ، هەستی سەربەخۆبون لە هەرێمکە بەرەو بالا رۆیشت[١].

لەگەڵ جێبەجێکردنی بریارەکە قەیرانە کۆمەلایەتیو ئابوررییەکان کەمتر بونەوە، بەلام هێشتا دۆخەکە نەگەیشتە ئاستی باشبون. تا ساڵی ۲۰۰۰، تەنها ۱٥ هەزار کەس دەیانتوانی باج بە حکومەت بدەن. خێزانە موچە خۆرەکان، داهاتیان لە خوار ۱٥۰۰ دینار بوو، کە رێکخراوی یونیسێف بۆ هەر خێزانێکی ٥ کەسی ئەو برە پارەیەی بە لەبار دانا بوو. ۲۰٪ دانیشتوان لەکۆمەڵگا زۆرە ملێکاندا بوون. زۆرینەی دانیشتوانی هەرێمەکەش لە ئاوو کارەباو خزمەتگوزاریی تەواوەتی بێبەش بوون. کرێکارە شارەزاکانو خوێنەوارەکان بەردەوام دەچوونە دەرەوەی هەرێم. ئابووری هەرێمیش بازاری رەش بەرێوەی دەبرد. کە وایکردبوو دابەشبونی فراوان لە نێوان بازرگانە زۆر دەوڵەمەندە کەمینەکانو زۆرینەی خەڵك پەیدا ببێت[٢].

---

[١] تیم نبلوك: العقوبات والمنبوذون، ص١٠٦-١٠٧.

[2] Matan Chorev: Iraqi Kurdistan: The Internal Dynamics and Statecraft of a Semi-state. The Fletcher School Online Journal for issues related to Southwest Asia and Islamic Civilization. 2007 © The Fletcher School – Al Nakhlah – Tufts University. P2.

# تەوەری سێیەم
# پەیوەندییە دەرەكییەكانی هەرێمی كودستان

دوای هەڵبژاردنــەكانی مــایۆی ١٩٩٢، بزوتنــەوەی نەتەوایــەتی كــوردی لــە قۆنــاغی چـەكدارییەوە بـەرەو قۆنـاغی دەسـەلاتی سیاسـیو بـەڕێوەبردن هـەنگاوی هاویشـت. ئـەم پرۆسەیە لە لایەن پارتە سیاسییەكانەوە پرۆسەیەكی نەخشە بۆ داڕێژراو نەبوو، بەڵكو لـەژێر كاریگـەری گۆڕانكارییـە نـاوخۆییو دەرەكییەكانـدا، ئـەم پرۆسـەیە پـەرەی سـەند. پارتـە سیاسییەكان لەگەڵ ئەوەی كە هەڵگری بیرۆكەی رزگاركردنی ناوچە كوردییەكان بوون، بەلام هێنـدەی خۆیـان بـۆ دامەزراندنـەوەی دەوڵـەتـی عێـراق ئامـادە كردبـوو، هێنـدە خۆیـان بـۆ بەڕێوەبردنی هەرێمی كوردسـتان بـە شـێوەیەكی سـەربەخۆ ئامادە نـەكردبوو. راسـتی ئـەم وتەیـەش لـە بەیاننامـەی ١١ی مـارتی ١٩٧٠دا، پـرۆژەی ئۆتۆنـۆمی دانوسـتانەكانی ١٩٩١، دواجار راگەیەندنی فیـدراڵی ١٩٩٢ی پەرلـەمانی هـەرێمی كوردسـتان، بـە رونـی دیـارە. لـەم بڕیـارو پرۆژانـەدا بـەهیچ جۆرێـك ئامـاژە بـە بـەڕێوەبردنی سـەربەخۆی ناوچـە كوردییـەكان نـەكراوە، بـەڵكو هەرێمەكـە وەك بەشـێكی عێـراق باسـی لێـوە كـراوە. هاوكـات پەیوەندییـە دەرەكییەكانی هەرێمەكەش لە سنوری سیاسـەتی دەرەكـی عێـراق جێگـەی كراوەتـەوە[1].

لێرەوە ئەو بۆچوونە خۆی دەسەپێنێت كـە پـرۆژەی پارتـە سیاسـییەكان لـە دوای راپـەڕین بریتی بوو لە دانوسـتان لەگـەڵ بەغـداد نـەك بـەڕێوەبردنی هـەرێمێك بـە سـەربەخۆیی. بۆیـە

---

[1] مشروع قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان، ١٩٩١.

کاتێك، کە هەرێمی کوردستان بە خەڵکو خاکەوە کەوتە بەردەستی پارتە سیاسییەکان، هەرێمەکە توشی قەیرانی بەرێوەبردنی دامودەزگاکانو ململانێی دەسەلأتی پارتە سیاسیەکان بوو. بە واتایەی تر هۆکاری سەرەکی قەیرانی هەرێم، پارتە سەرەکییەکان بوو، کە لە رووالەتدا بەرپرسی خاكو خەڵکی هەرێم بوون، بەلأم لە بنەرەتدا قۆناغی بزوتنەوەی چەکدارییان تێپەر نەکردبوو، بە جۆرێك کێشەکانی قۆناغی چەکداریان لەگەڵ قەیرانی نوێی بەرێوەبردنی دەسەلأت ئاوێتە کرد. هەموو ئەمانەش رەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندییە دەرەکییەکانیان هەبوو، کە لە بری ئامانجی نەتەوەییو خۆ نواندن وەك هەرێمێکی سەربەخۆ، سروشتی پارتایەتیو کەمئەزمونی تیایدا بەرونی دیار بوو.

ململانێ ئەم دوو پارتە لە ساتە وەختی دانوستانەکانی ساڵی ١٩٩١دا سەری هەڵدا. جەلال تاڵەبانی[1] لە کاتێکدا، کە سەرکردایەتی دانوستانی ئەپریلی ١٩٩١ کرد، درکی بەوە کرد، کە سەرکردایەتیی دەوڵەتی عێراق، تاکرەوانە دەروانە دانوستانو مەبەستیان دووبارە بەهێزکردنەوەی عێراقە، بە بێ ئەوەی کێشەی کورد لەعیراقدا هەنگاوێك بەرەوپێش بروات. لەگەڵ ئەوەشدا خودی تاڵەبانی ئەو بۆچونەی لا گەلاڵە بوو کە بەرەی کوردستانی، بێ ئەوەی بارودۆخی ناوخۆو دەرەوەی کورد هەڵسەنگێنێت، دانوستانیان پەسەندکردووە. بەتایبەت لەکاتێکدا کێشەی کورد بەهۆی ئاوارەبوونەوە رەهەندێکی نێودەولەتی وەرگرتووە[2].لێرەوە تاڵەبانی گەیشتە ئەو بروایەی پێویستە بەرێوەچونی دانوستانەکان بە سەرپەرشتیاری نەتەوەیەکگرتوەکانو لەژێر سایەی بریاری ٦٨٨ بێت تا عیراق بە

---

[1] جەلال حسامەدین تاڵەبانی لە شارۆچکەی کۆیە سەر بە پارێزگای هەولێر لەدایك بووە لە ساڵی١٩٣٣ . هەڵگری بروانامەی بەکالۆریوسە لە کۆلیجی ماف لە زانکۆی بەغداد لە ساڵی ١٩٥٩. لە ساڵی ١٩٤٧ بووە بە ئەندامی (پ.د.ك). پاشان لە ساڵی ١٩٥١ بووە بە ئەندامی سەرکردایەتی ئەو پارتە. لە دوای هەرەسی شۆرشی ئەیلول لەگەڵ چەند کەسێکی تر (ی.ن.ك) پێکهێناوە لە ساڵی ١٩٧٥. لەهەڵبژاردنی (رابەری بزوزتنەوەی رزگاری خوازی کورد) لە ساڵی ١٩٩٢ لە هەرێمی کوردستان رێژەی (٤٤.٩٣٪)ی بەدەستهێنا.سەرۆك کۆماری عێراقە لە ساڵی ٢٠٠٥. جێگری سەرۆکی رێکخراوی سۆسیال ئینتەرناشناڵە لە ساڵی ٢٠١٠. http://ar.wikipedia.org

[2] مام جەلال: راپۆرتی سیاسی،چاپی دووەم، ئۆفیسێتی روناکبیری، سلێمانی،٢٠٠٠، ل٤٩-٥٠.

جێبەجێکردنی پابەند بکات. وێڕای ئەمە لە نێو سەردانی تاڵەبانی بۆ ئەورووپاو ئەمریکا، لە ناوەڕاستی ١٩٩١دا، ئەوەیان بۆ ڕوونکردەوە، ڕژێمی عیراقی ئەگەری ڕوخانی هەیەو نەتەوەی کورد هەڵە دەکات کە لە دیکتاتۆرێکی وەك سەدام حسین دڵنیابێت، لەلایەکی تر پەیمانی ئەوەی وەرگرتبوو، کە یارمەتی کورد دەدرێت لەو هەرێمەی، کە لە دوای مانگی نۆڤەمبەر١٩٩١ بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی بەرەی کوردستانیدا بوو[1]. لە بەرامبەردا مەسعود بارزانی[2]، کە لە مانگی مایۆی١٩٩١دا سەرۆکی شاندی بەرەی کوردستانی بوو، هەموو هەوڵەکانی بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ حکومەتی عیراقی خستبووەگەڕ، چونکە گومانی هەبوو لە هەڵوێستی نەتەوە یەکگرتووەکانو هاوپەیمانان بەتایبەت ئەمریکا، ئەو لەو کلاوڕۆژنەوە دەیڕوانی، کە چاوپۆشی لە ئاست کێشەی کوردو نسکۆی ١٩٧٥و جینۆسایدی ساڵی ١٩٨٨و ڕاپەڕینی١٩٩١، بە بەڵگە دەزانی، کە کۆمەڵی نێودەوڵەتی لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نەبووە، جگە لەوە پێیوابوو کە چیتر کورد ناتوانێت خۆبگرێت لە بەردەم ڕەشەکوژیو ئاوارەییدا، هەموو ئەمانە وایکردبوو کە (بارزانی) باوەڕی بە چارەسەری ناوخۆیی کێشەی کورد لەناو عیراقدا بە بەهێزتر بزانێت لە بەرامبەر چارەسەر لە دەرەوەی عیراق[3]. ئەوەی ئەم گومانەی بەلای ڕاستیدا برد، دیاریکردنی بازنەی (٣٦) بوو بۆ ناوچەی دژەفڕین، کە بەشێك لە پارێزگاکانی سلێمانیو تەواوی پارێزگای کەرکوکی نەدەگرتەوە، هەروەها کشانەوەی هێزی هاوپەیمانەکان بوو لە مانگی یۆلیۆی ١٩٩١، دواجار ڕێگەپێدانی تورکیا بوو بۆ

---

[1] کریس کۆچێرا: بوتنەوەی نەتەوایەتی کورد، ل١٢٥.

[2] مەسعود مستەفا بارزانی، لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری مهاباد لە ئێران لەدایك بووە. پاشان لەدوای ڕوخانی ئەو کۆمارە باوکی پەنا دەباتە بەر یەکێتی سۆڤیەتو لەگەڵ بنەماڵەکەی دەگەڕێنەوە عێراق. لە دوای ئەوەی مستەفا بارزانی دەگەڕێتەوە بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٥٨و پاشان شۆڕشی چەکداری سەرهەڵئەدات، مەسعود بارزانی، پەیوەندی بەو شۆڕشەوە دەکات. لە دوای مردنی مستەفا بارزانی لە ساڵی ١٩٧٩، مەسعود بارزانی دەبێتە سەرۆکی (پ.د.ك). لەهەڵبژاردنی (ڕابەری بزوزتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد) لە هەرێمی کوردستان ڕێژەی (٤٧.٥١٪)ی دەنگەکانی بەدەستهێنا، لە ساڵی ٢٠٠٥ وەك سەرۆکی هەرێمی کوردستان هەڵدەبژێردرێت. http://rudem.elaphblog.com

[3] دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل ٦١٩ .

مانەوەی هێزە هاوپەیمانەکان تەنها بۆ ماوەی شەش مانگ. ئەم هۆکارانە وایکرد لە ٢٢ی ئەپرڵی ١٩٩١دا، لەگەڵ حکومەتی عیراقی بگاتە گەلاڵەکردنی پرۆژە بڕیارێك لە ژێر ناوی "پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستان"[1]. ئەم هەوڵەی بارزانیدا چەند ئاستەنگێکی هاتە بەردەم، گرنگترینیان وەك توێژەرێك دەنوسێت، "هەوڵی حکومەتی عیراقی بوو بۆ ئەوەی بڕیاری ٦٨٨و دەستێوەردانی مرۆیی هێزە فرەڕەگەزەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان شکست پێکبهێنێت"[2]. کێشەی (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)و لە میانەی دانوستانی ١٩٩١دا، ئەوە بوو کە بێجگە لەوەی کە دوو رای جیاواز یان لەسەر دانوستان هەبوو بەلاّم نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی جەماوەر بکەن ، بەتایبەت کاتێك جەماوەر دەستیان بە کوشتنی پیاوەکانی رژێمی بەغداد راهاتبوو بەشێوەیەك رۆژانە لێیان دەکوژرا. لەم کاتەدا بەحوکمی ئەوەی کە بارزانی سەرکردایەتی زۆرترین ماوەی دانوستانی دەکرد بەگومان بوو لەوەی کە ئەو کوشتن‌و بڕینانەی روو دەدەن، (ی.ن.ك) لە پشتەوەیە، بۆ ئەوەی هەوڵەکانی (پ.د.ك) لە دانوستاندا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت[3]. بۆیە دەتوانین بڵێین، دانوستانەکانی کورد لەگەڵ بەغداد سەرەتای ناکۆکی نێوان ئەو دوو پارتە بوو کە پاشان هەردولا گەیشتنە ئەو رایەی کە راپرسی لەسەر پرۆژەی دانوستان لەگەڵ بەغداد بکرێت. پاشان پرۆژەی راپرسی گۆڕدرا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی‌و پرسی بڕیاردان لەسەر پرۆژەی داخوازی کورد لە عێراقدا بۆ پەرلەمانی کوردستان جێهێڵرا[4]. ئەوە بوو پرۆسەی هەڵبژاردن لە ١٩ی مایۆی ١٩٩٢ بەڕێوە چوو. هەرچەندە هەڵبژادن کەم تا زۆر چارەنوسی کوردی لە عێراقدا دەستنیشان کرد ئەویش دوای ئەوەی، کە پەرلەمان کۆبوونەوەی خۆی کردو لە ٤ی ئۆکتۆبەری١٩٩٢ بڕیاری هەڵبژاردنی فیدراڵی دا ، بەلاّم هەڵبژاردن بە دیوێکی تردا بوو بەهۆی

---

[1] مشروع قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان، ١٩٩١/٧/٢٢.

[2] سعد ناجي جواد: اكراد العراق وازمة الهوية، www.aljazeere.net

[3] مراد خۆشەڤی حەسۆ: هەمان سەرچاوە، ل٣٢.

[4] نەوشیروان مستەفا: مفاوەزاتی بەرەی کوردستانی-بەعس، ل١١٨-١١٩.

قوڵکردنەوەی کێشە ناوخۆکان، کە ڕەنگدانەوەی بەسەر پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمەکەدا پەیداکرد.

دەکرێت لێرەدا پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەش بکەین:

## یەکەم: پەیوەندییە دەرەکییەکان لە ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٤:

پارتەکانی هەرێمی کوردستان تێڕوانینیان بۆ پەیوەندییەکان وەك یەك نەبوو، هەروەها لەسەر ئامانجەکانی ئەو پەیوەندییانە کۆك نەبوون. پەیوەندییەکانی ئەم پارتانە تا پێش دووەمین جەنگی کەنداو پەیوەندییەکی ناوچەیی و لە ژێر کاریگەریی بەرژەوەندیی دەوڵەتانی دراوسێی عێراقدا بوو. سوریاو ئێران لە ماوەی ململانێ مێژوویەکانیان لەگەڵ عێراقدا، (بە تایبەت لە هەشتاکاندا)، ڕێگەیان بە پارتە کوردییەکان دابوو بۆ کردنەوەی نوسینگە، لە دوای تەواوبونی دووەمین جەنگی کەنداویش، تورکیا مۆڵەتی کردنەوە نوسینگەی بە (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)دا. هەرچی نوسینگەکانی ئەو پارتانە بوو لە دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، جێگای بایەخی ئەوتۆ نەبوون، چونکە تا دووەمین جەنگی کەنداو ئەو دەوڵەتانە گرنگییان بە پارتە کوردییەکان نەدەدا، ئەمەش بۆ گرنگی نەدانی ئەو دەوڵەتانە دەگەڕێتەوە بە کێشەی کورد، هەروەها بۆ ڕەچاوکردنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ عێراقدا. پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان ڕەنگدانەوی ململانێی سیاسییەکانی نێوان(پ.د.ك)و (ی.ن.ك) بە ڕوونی پێوە دیار بوو. ئەم ململانێیە لە دوای ١٩ی مایۆ، قوڵتر بۆوە بە جۆرێك ڕەنگدانەوەی بەسەر بارودۆخی هەرێمی کوردستانەوە هەبوو، تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢.

دەستەی باڵای سەرپەرشتیاری هەڵبژاردنەکان کە هەڵبژاردنەکەی بەڕێوە برد،، هەرێمی کوردستانی بۆ چوار مەڵبەند دابەش کردبوو. مەڵبەندی یەك (هەولێر)، مەڵبەندی دوو (سلێمانی)، مەڵبەندی سێ (دهۆك)، مەڵبەندی چوار (کەرکوك)، کە لە دەربەندیخان و چەمچەماڵ و کفری و کەلار پێکهاتووە. گەورەترین ئەو کێشانەی، کە بەرەوڕووی هەڵبژاردنەکان بووەوە، وەك لە ڕاپۆرتی کۆتایی ئەو دەستەیەدا دەردەکەوێت، کە لە ٢٣ی مایۆی ١٩٩٢ نوسیویەتی گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

- کاڵبونەوەی ئەو مرەکەبەی، کە دەنگدەر پەنجەی پێ مۆر دەکرد، ئەمەش ڕێگای بۆ دووبارە دەنگدانی کەسێك خۆشکردبوو.
- کەمی بنکەی هەڵبژاردن وایکرد، کە هەرچەندە ماوەی دەنگدان بۆ کاتژمێر ١٢ ی شەو درێژکرایەوە، بەلاّم هێشتا خەلکێکی زۆر بێبەش بوون لە مافی دەنگدان.
- نەبونی نهێنی لەدەنگداندا.
- گەورەترین کێشە بریتی بووە لەوەی، کە هەولێرو سلێمانیو کەرکوك ژمارەی مەزەندەکراوی دەستە لە ژمارەی دەنگدەرانی ڕاستەقینە زیاتر بووە، بەلاّم لە دهۆکدا، کە مەڵبەنی سێ بووە ژمارەی مەزەندەکراو لە ژمارەی دەنگدەران کەمتر بووە. لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە "مەڵبەندی (٣)ی دهۆك (ئاکرێو شێخانو پارێزگای دهۆك) ژمارەی تەخمینی دەستەی بالاّ (١٧٨٠٠٠) بووە بەلاّم (١٩٨٣٥٢) کەس دەنگی داوە جگە لە (٧٨٨٢) کەس، کە دەنگیان داوە بە لیستەی کەمە نەتەوەییە ئاشورییەکان. واتە (٢٨٢٣٤) کەس زیاتر دەنگی داوە. لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە: " ئێمە وەکو دەستەی بالاّ ئەم ئەنجامانەمان، لا ئاسایی نەبوو، بۆیە بەیانی ١٩٩٢/٥/٢١ ئاگاداری سەرکردایەتی سیاسیمان کرد...... ئەم ئەنجامەش بووە هۆی گیروگرفتی توند لە نێوان یەکێتیو پارتی بەتایبەت یەکێتی، پارتی تاوانبار کرد بە تەزویرکردنی (٢٨٢٣٤) دەنگ لە مەڵبەندی سێی دهۆك کە لە ژمارەی تەخمینی دەستەی بالاّ زۆرتر دەنگ درابوو.....بۆیە وەلاّمی یەکێتیو پارتی بۆ دەستەی بالاّ بریتیە لەوەی کە بەرژەوەندی گەلی کورد لەوەدایە، کە چاوپۆشی لە خروقاتەکانی دهۆك بکرێ هەروەها ڕێژەی بەشداری ئەم دوو لایەنە وەك یەك بێت، واتە پەنجا بە پەنجا تا هەڵبژاردنی داهاتوو کە ١٩٩٥/١٠/١٥ ئەکرێت[1]. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی شێوازی پەنجا بە پەنجا، لە کۆبونەوەی نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) لە ٢٣ی ئۆگستۆسی ١٩٩٢، بریار لەسەر دابەشکردنی پۆستی پارێزگاکان بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەدەن کە پارێزگاری دهۆكو هەولێر بدرێتە (پ.د.ك)، پارێزگاری سلێمانیو کەرکوك بدرێتە (ی.ن.ك). پارێزگار لە چ لایەك بوو جێگرو یاریدەدەرەکەی لە لاکەی تر دائەنرێ، بەڕێوەبەری ئاسایش (مدیر الامن) و

---

[1] بروانە پاشکۆی ژمارە (٤).

قائیمقام لە لاکەی تر ئەبێ"[1]. لە لایەکی تر لە کۆبونەوەی ٨ یۆلیۆی ١٩٩٣، بەم شێوەیەی لای خوارەوە پێناسەی باوەری شەراکەت کە پەنجا بە پەنجا دەگەیەنێت، باس دەکەن:

" أ- لە پەرلەمان گەر فرکسیونێکیان موافق نەبوو لەسەر باسکردنی مەسەلەیەك لەسەر ئەو تەصەورەی، کە لە فراکسیۆنەکەی تر هەیە بەرامبەر بەو مەسەلەی لە پەرلەمان باسی لێوە دەکرێت... سەرۆکایەتی پەرلەمان ئەم مەسەلەیە دوا دەخات، تا بیرو بۆچونی هەردولا لێکنزیك دەبنەوە.

ب-هەردوولا پێکەوە بریارەکانی حکومەت دەردەکەنو گەر بە لایەنێك لەسەری موافق نەبوو، ئەوا بریارەکە دەوەستێت.

ج- دەرەجە تایبەتەکانو لێپرسراوی وەحدە ئیدارییەکانو ئەفسەرەکان چ لە وەزارەتی کاروباری پێشمەرگەو چ لە وەزارەتی ناوخۆو چ لێپرسراوانی مەکتەبەکانی پەیوەندی دەرەوەو لێپرسراوانی وەزارەتی دارایی بە رێکەوتنی هەردولا دەبێت بە شێوەیەکی تایبەتی، چ بۆ دانانی پالێوراوانی خۆیان بۆ ئەم پۆستانە یا خەڵکانی تری سەر بە لایەنەکانی تر یانە خەڵکانی سەربەخۆ.

د- دامەزراندنی نوێ لە رێگای دەزگایەك دەبێت کە بۆ ئەم مەبەستە دادەنرێت بە پێی کەفائەتو مەرجەکانی دامەزراندن"[2]. شێوازی پەنجا بە پەنجا یان (فیفتی بە فیفتی)، بو بە هێنانە کایەی دوو دەسەلاتو دوو سەرچاوەی بریار لە ناو دامو دەزگاکانی دەسەلات لە هەرێمەکە. بە جۆرێك خودی سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە لێی ناڕازی بوون. لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنوس مەگدید سەپان لەگەڵ زیاتر لە ١٩ بەرپرسی بالای حکومەتی هەرێم، کە سەرۆکی وەزیرانو وەزیرەکانیشی دەگرێتەوە هیچ کەسێکیان دانیان بە ئەرێنی ئەو شێوازەی دەسەلاتدا نەناوە. ئەم دابەشبونە پەیوەندیە دەرەکییەکانیشی گرتەوە بە جۆرێك بەرپرسی نوسینگەکانی حکومەت هەرێم لە نێوان ئەو دوو پارتە دابەشکرا. ئەم

---

[1] بروانە پاشکۆی ژمارە (٥)

[2] بروانە پاشکۆی ژمارە (٦).

نوسینگانە سەر بە وەزارەتی یارمەتی مرۆڤایەتیو هاوکاری بوون. کە ئەرکی نوسینگەکانی دیاری کردبوو، کە بریتی بوو لە پەیوەندییبەستن بوو، لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە ئامادەن یارمەتی کورد بدەن، بە تایبەت لە رووی بازرگانی، کشتوکاڵ، پەروەردە، تەندروستی، ئاوەدانکردنەوە، پیشەسازی. هەروەها پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەو رێکخراوە حکومیو نا حکومیانەی کە دەیانەوێت لە کوردستاندا لە بواری یارمەتیە مرۆییەکان کار بکەن. لە لایەکی تر ئەم وەزارەتە هەوڵەکانی خستبووە گەر بۆ داخستنی نوسینگەی حزبییەکانو جێگرتنەوەی لە لایەن نوسینگەکانی حکومەتەوە[1]. ئەم هەوڵە لە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەلام لە دەوڵەتە دراوسێکانی هەرێمی کوردستان توشی شکست بوو، چونکە ئەو دوڵەتانە لە کۆبونەوە سێ قۆڵیەکاندا بریاریان لەسەر مامەڵە نەکردنی فەرمی ئەو دەوڵەتانە لەگەڵ حکومەتی هەرێم دابوو، بۆیە رێگەیان بە کردنەوەی نوسینگەی حکومەتی هەرێم لە سوریاو تورکیاو ئێران نەدا. شێوازی پەیوەندیکردنیشییان بە هەرێمی کوردستانەوە لە رێگەی نوسینگەی پارتەکانی هەرێم بوو. یان لە رێگای پەیوەندی راستەوخۆ بوو بە سەرکردایەتی ئەو دوو پارتەوە، بەتایبەت تاڵەبانیو بارزانی. ئەم دوو سەرکردەیە لەهەڵبژاردنی (ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد) هەریەکەو بە جیا دەنگی پێویستی بەدەست هێنا بوو. لەم سۆنگەیەوە مافی نوێنەرایەتی جەماوەری کوردستانی بەخۆ دابوو[2]. ئەوەی جێگای سەرنجە لەم قۆناغەدا ئامانجە نیشتمانییەکان کە بە شێوەیەکی سەرەکی بریتی بوو لە بەدەستهێنانی پشگیری مادیو مرۆیی بۆ هەرێمی کوردستان، کە باڵی بەسەر پەیوەندیە ناوچەییو نێودەوڵەتییەکانی هەرێمی کوردستان کێشابوو. هەروەها ئاراستەی پەیوەندییە هەرێمییەکان هێندەی رووەو دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بوو، هێندە بە لای پەیوەندییە ناوچەییەکاندا نەدەچوو، ئەمەش لە گرنگی

---

[1] وەزیرە یارمەتی مرۆڤایەتیو هاواکاری بۆ کوردستانی نوێ دەدوێت. رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە (٥٣)، ٣١/٧/ ١٩٩٢.

[2] مایکل میدوکروفت و مارتن لون: أنتخابات البرلمان الكوردي في العراق وأنتخابات قائد الحركة التحررية الكردية، ترجمة ونشر مكتب الدراسات والبحوث المركزي للحزب الديمقراطي الكوردستاني، ١٩٩٧. ص ٣٦.

پێدانی ئەو دەوڵەتانەوە سەرچاوەی گرتبوو بۆ هەرێمی کوردستانو لە لایەکی تر پەراوێزخستنی دەوڵەتە ناوچەییەکانو نەبوونی نوسینگەی حکومەتی هەرێم لە دەوڵەتانی دراوسێ، پەیوەندی هەرێمو دراوسێی خستبووە پلەیەکی نزمتر.

## دووەم: جەنگی ناوَخۆ ١٩٩٤-١٩٩٨:

هەرێمی کوردستان لە ١ی مایۆی١٩٩٤ کەوتە شەڕێکی ناوخۆوە. وێرای ئەوەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی لێکەوتەوە، بەڵام خاکی هەرێمی کوردستانی لە نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) دابەشکرد. بەدیوێکی تردا بە هۆی خەباتی پێش ساڵی ١٩٩٠، کە ناوچە شاخاویو دێهاتەکانی لە نێوان خۆیاندا جیاکردبووە، بەڵام دوای ساڵی١٩٩٢ بەهۆی هەڵبژاردنو ڕێژەی دەنگەکان، شارە گەورەکانی هەرێمی کوردستانیان بەشکردو پارێزگای دهۆكو ناوچەی بادینان لەلایەن (پ.د.ك) بەڕێوە دەچوو، هەرچی پارێزگای سلێمانیو ناوچە ڕزگارکراوەکانی سەر بەپارێزگای کەرکوکە وەك قەزای چەمچەماڵو کەلار، (ی.ن.ك) بەڕێوەی دەبرد، لەم نێوانەدا پارێزگای هەولێر بەهۆی نزیکی ڕێژەی دەنگەکان لەیەکدیەوە، حکومەتی هەرێمی کوردستانی تێدا دەسەڵاتداربوو[1].

لەلایەکی تر ئەنجامی هەڵبژاردنەکان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)ی کرد بە خاوەن دەسەڵاتو ئەو هێزانەی تر، کە بەهۆی ڕێژەی کەمی دەنگدانەوە نەچوونە ناو پەرلەمان، لە دەسەڵات دوورکەوتنەوە. کە بوو بە هۆی دروستبونی شەڕو پێکدادان لە نێوان پارتەکانی دەرەوەی دەسەڵات لەگەڵ پارتەکانی ناو دەسەڵات نەبوو. (ح.س.د.ك)[2]، لەگەڵ (پ.د.ك) لە کانونی

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، مایکل میدو کروفتو مارتن لون:المصدر السابق، ٣٢-٣٣.

[2] ئەم پارتە لە ١ی یۆنیۆی ١٩٧٦ دامەزراوە لەژێر ناوی بزوتنەوی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان بە سەرکردایەتی ساڵح یوسفی. پاشان لە ئۆگستۆسی چونەتە ناو (ی.ن.ك)، بەلام لە ساڵی ١٩٧٩ جیابونەتەوە. لە ساڵی ١٩٨١ یەکەم کۆنگرەی خۆی لە مایۆی ١٩٨١ بەستووەو پەیرەوی ڕێبازی مارکسی کردووە بەلام لە کۆنگرەی دووەمی پارتەکە لە ساڵی ١٩٩٤ ڕێبازی سۆسیال دیموکراتی هەڵبژاردووەو محەمەد حاجی مەحمود بە سکرتێری ئەو پارتە هەڵبژێردراوە. ارکان حمە ئەمین الزرداوی: المصدر السابق، ص ١٣٣-١٤٠.

یەکەمی ١٩٩٣ کەوتنە شەڕەوە. هەروەها (ب.ئ.ك)[1] لەگەڵ (ی.ن.ك) کەوتنەشەڕەوە[2].
ئەمە وایکرد (ح.س.د.ك) زیاتر لە (ی.ن.ك) نزیك بێتـەوەو (ب.ئ.ك) لـە (پ.د.ك). بۆیـە دوا بـەدوای دابەشـکردنی دەسـەلاّتو دارایـیو بڕیـار، دابەشـبونی هێـزە بچـووکەکان بەسـەر (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) ململانێکەی قوڵتر کردەوە، بەجۆرێك لە ئەنجامی روداوێکی کۆمەلاّیەتی لە ناوچەی قەلاّدزێ زۆر بـە خێرایـی سـەرجەم هەرێمەکـەی گرتـەوەو بـوو بـە هـۆی جـەنگی ناوخۆو دابەشکردنی پراکتیکی هەرێمی کوردستان بۆ ناوچەی (پ.د.ك)و ناوچەی (ی.ن.ك).

(ی.ن.ك) لە سەرەتای یەنایری١٩٩٥ دەستیگرت بەسەر تەواوی شاری سلێمانیو ناوچە ڕزگارکراوەکانی کەرکوكو قەزای کۆیە، هاوکات (پ.د.ك) لە جێگە پێـی لـە پارێزگـای دهـۆك زۆرینـەی قەزاو ناحییەکانی هەولێر قـایم کـرد، سـەنتەری شـاری هـەولێریش بـوو بـە جێگـای ململانێی سیاسیو سەربازی. لەم کاتەدا چـەندین هـەوڵی نـاوخۆییو دەرەکـی بـۆ ڕاگـرتنو ڕێکەوتنی ئەو دوو هێزە درا. لە گرنگترینیشیان، ڕێکەوتنی پاریسو ڕێکەوتنی درۆهیدا بـوو. ڕێکەوتنی پـاریس لـە ١٦– ٢٣ی یۆلیـۆی ١٩٩٥ی خایانـد، بـە سەرپـەرشـتی فەرەنسـاو بـە ئامـادەبونی نوێنــەرانی ئــەمریکاو بریتانیـاو بـەڕێوە چـوو. تیایـدا پــرۆژەی دەسـەلاّتێکی دیموکراسی بە پشتبەسـتن بـە هەڵبـژاردنو سـەرژمێری بڕیـاری لەسـەر درا بـە واتایـەکی تـر میکانیزمی هەڵبژاردنی نوێ گرنگترین تەوەری ڕێکەوتنەکە بوو. بەلاّم ڕێکەوتنەکە لە کاتێکدا بوو، کە لە ناوخۆی هەرێمەکە گەرمەی شەڕ بوو، بۆیە ئەم ڕێکەوتنـە نەگەیشـتە ئـەنجامێکی

---

[1] بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، لە مایۆی ١٩٨٧ دامەزراوە . هەرچەندە ڕێکەوتنی سیاسی لەگەڵ (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)دا هەبووە بەلاّم بەشدار نەبووە لە بەرەی کوردستانی لە سـاڵی ١٩٨٨ ئەمـەش بەهۆی جیاوازیی بیروباوەڕی ئەو بەرەیە کە عەلمانی بووەو لەگەڵ بیروڕای بزوتنەوەی ئیسلامیدا نەگونجاوە. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ کەمتر لە ٧٪ی هێنا بۆیـە نـەیتوانی بەشـداری پەرلـەمان بکـات. لـە سـاڵی ١٩٩٣–١٩٩٧ لـەگەڵ (ی.ن.ك) لە شەردا بوون. تا بە پێی ڕێکەتنامەی تاران ئەو شەرە وەستا. لـە سـاڵی ١٩٩٩ لـەگەڵ بزوتنەوەی ڕاپەرینی ئیسـلامی یەکیان گرتو ناوەکەی گۆردرا بۆ بزوتنەو یـەکبونی ئیسـلامی لە کوردستان. سەلام عەبدولکەریم: گوتـاری ئیسـلامیو گرفتـی ئۆپۆزسـیۆنی سیاسـی، چـاپخانەی سـیڤا، سلێمانی، ٢٠٠٩.ل ل ٦١–٦٦.

[2] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو،ل ١٠٥–١٠٦

ئـەوتۆ. (ی.ن.ك) دەسـتی گـرت بەسـەر نـاو شـاری هـەولێر. بەمـەش (ی.ن.ك) دەسـەلاتی سیاسی لە زۆرینەی هـەرێمی کوردسـتان گرتەدەسـت. زۆرتـرین دەسـەلاتی ئـابوریش کەوتـە دەستی (پ.د.ك) چونکە خـاڵی گـومرگی ئیـبراهیم خـەلیل کـە دەرچـەی سـەرەکی و رێگـای نێودەوڵەتی هەرێمی کوردستان و عێراق بوو لە ژێر دەسەلاتی (پ.د.ك)دا بوو. لێـرە بـەدواوە تەوەرە دانوستانەکان گۆرا. مەرجی (پ.د.ك) کشانەوەی (ی.ن.ك) بوو لە هـەولێرو مـەرجی (ی.ن.ك) دابەشکردنی داهات بوو لە نێوان هەردولا بە یەکسانی. دوای رێکەوتنامـەی پـاریس رێکەوتنی درۆهیدا دەستی پێکـرد بـە سەرپەرشـتی ئـەمریکا لـە ٩-١١ی ئۆگستۆسـی١٩٩٥. (درۆهیدا ناوچەیەکی نزیك دبلنی پیتەختی ئیرلەندا بوو). گرنگترین خـاڵی رێکەوتنەکـە چـەك داماڵینی هەولێرو پاشان رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانی تورکیا کرابووسەبارەت بە دژایـەتی کردنـی (پ.ك.ك). ئـەم دوو خاڵـە جێگـای نـاکۆکی بـوو، چـونکە (پ.د.ك) دەیویسـت بـۆ بەهێزکردنەوەی دەسەلاتی سیاسی خۆی، بە هەر شێوازێك بێت بچێتەوە هـەولێر. (ی.ن.ك) خواستی ئەوەی هەبوو بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی، چنگی لـە داهـاتی ئیـبراهیم خـەلیل گیر ببێت. خاڵێکی تر (پ.ك.ك) بوو کە هەردولا لەسەر رێوشوێنی سنوردارکردنی ئـەو هێـزە ناکۆك بوون. (پ.ك.ك) لای خۆیەوە دژی رێکەوتنەکە بوو. ئەوە بوو لـە کۆتـایی ئـابی ١٩٩٥ هێرشی کـردە سـەر بارەگـانی (پ.د.ك)و کـە کاریگـەریی لەسـەر سـەرنەگرتنی رێکەوتنەکـە دروست کرد. بەمەش (پ.ك.ك) زیاتر لە یەکێتی نزیك بووەوەو (پ.د.ك) لە تورکیا[١].

لـە مانگـەکانی یۆلیـۆو ئۆگستۆسـی ١٩٩٦ هێزەکـانی (ی.ن.ك) لەبـەرەکانی جەنگـدا سـەرکەوتنی بەرچـاوییان بەدەسـتهێنا[٢]. (پ.د.ك) ئـەم سـەرکەوتنانەی (ی.ن.ك) بـۆ پاڵپشتیو پشگیری ئێران گەراندەوە. بەدوایدا بارزانی لەنامەیەکدا بۆ سەرۆك کۆمـار سـەدام حسین، داوای یارمەتیکردو بانگێشتی سوپای عێراقی کـرد، لـە وەلامـدا سـوپای عێراقـی ٣١ ئۆگستۆسـی ١٩٩٦ هێرشـیان کـردە سـەر پارێزگـای هـەولێر، لـە ئەنجامـدا ئـەو شـارەی

[١] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو،ل ١٠٨-١٠٩.

[٢] رۆژنامەی کوردستانی نووێ، ژمارە(١٣٦٥)، ١٩٩٨/٨/٢١.

داگیرکرد[1]. دوابەدوای ئەم روداوە، هێزەکانی (ی.ن.ك) لە پاشەکشەدا بوون، تا ١٠ی سێپتەمبەری ١٩٩٦ تەواوی دەسەڵاتیان لە هەرێمی کوردستاندا لەدەست داو لەسەر سنوری ئێران گیرسانەوە[2].

ئەمریکا بارزانی و تاڵەبانی بانگێشتی ئەنقەرە کردو لە ئەنجامی دانوستانێکی چەند رۆژیو لە ٣١ی ئۆکتۆبەری١٩٩٦، رێکەوتننامەی ئەنقەرە واژۆ کرا. ئەمە لە کاتێکدا بوو (ی.ن.ك) لەبەرئەنجامەکانی دژە هێرشێکی لەسنوری ئێرانەوە، پارێزگای سلێمانیو کەلارو چەمچەماڵو کۆیسنجقی لەدەست (پ.د.ك) سەندەوە[3]. کۆی گشتی رێکەوتنەکە بە بەراورد لەگەڵ رێکەوتنامەکانی پێشوو، پاشەکشە بوو لە ستراتیجی نەتەوەیی کورد، چونکە هەرێمی کوردستانی بەشێوەیەکی فەرمیو یاسایی لەنێوان (کورد–کورد) دابەشکرد. وێرای ئەمە رێکەوتنی ئەنکەرە بواری زیاتری بە تورکیادا، کە دەسوەردان لە کاروباری ناوخۆی هەرێمی کوردستان بکات. بەمەش لاسەنگییەك لە جێبەجێکردنی رێکەوتنکە دەرکەوت، کە بە قازانجی (پ.د.ك)و لە زیانی (ی.ن.ك) بوو[4].

(ی.ن.ك) لە ناوەراستی ساڵی ١٩٩٧، بە هاوکاری (پ.ك.ك) هێرشی کردە سەر (پ.د.ك)و قورسترین شەری ناوخۆ سەری هەلدا کە تیایدا (پ.د.ك) موشەکی کاتیۆشای بەکار هێناو هەر لەو شەرەدا ١٠٠٠ کەس کوژراو. لەم کاتەدا، "سوپای تورکیاو هێزی هەوایی

---

[1] جوناثان راندل: أمة في شقاق، دروب كردستان كما سلكتها، ترجمة: فادي حمود، دار النهار، بيروت ١٩٩٧. ص٣٨٨.

[2] Jonathan Randal: Iraqi opposition describes mass execution near Irbil. September.1996 www.barm.ucsd.edu

[3] کریس کۆچێرا: بزوتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی، بەرگی یەکەم، بەرگی دووەم، وەرگێرانی لەفارسییەوە: ئەکرەمی مهیرداد، سەنتەری چاپو پەخشی نما، ٢٠٠٢. ل١٦٣–١٦٤.

[4] هێرش عەبدولڵا حەمە کەریم: پەیوەندییە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستانو تورکیا (١٩٩١–١٩٩٨)، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، ٢٠٠٩، ل١٢٩

بۆ هێرشێکی تۆڵەکردنەوە لە (ی.ن.ک) گەیشتنەوە (پ.د.ک)و هەمووئەو ناوچانەیان گرتەوە، کە مانگێك پێشتر (پ.د.ک) لەدەستی دابوون[1].

ئەمریکا دوای ئەوەی لە لایەنگری تورکیا لە کێشە ناوخۆکانی هەرێم پشتڕاست بووەوە، ڕاستەخۆ ناوبژو سەرپەرشتیکاری ئاشتی لەنێوان هەردولا ئەنجامدا[2]، سەرئەنجام (بارزانی)و (تاڵەبانی) لە(١٧ی سێپتەمبەری ١٩٩٨) بانگهێشتی واشنتن کرانو بە ئامادەبونی وەزیری دەروەی ئەمریکا (مادلین ئۆڵبرایت) سەرکردەی هەردوو پارتەکە ڕێکەوتننامەی واشنتن یان لە ئەمریکا ڕاگەیاند. ئەم ڕێکەوتنە وایکرد چارەنوسی هەرێمەکەی زیاتر یەکلایی کردەوەو هەرێمەکەی لە ململانێی ناوخۆیی دەرباز کرد. تاڵەبانیو بارزانی لای خۆیانەوە ئەوەیان درکاند، کە ئۆڵبرایت بەڵێنی زارەکی گرنگترو بەهێزتری لەسەر پاراستنی کورد پێداون[3]. لە ڕێکەوتنەکەدا هەردوو پارتەکە پابەندی خۆیان بە عێراقێکی یەکگرتوو دەربڕی بوو. ڕێکەوتن لەسەرئەوە کرا کە بەهیچ جۆرێك پەنای (پ.ك.ك) لەهەرێمی کوردستاندا نەدرێت، هەروەها سنورەکانی هەرێمی کوردستان تۆکمە تر بکرێت. هەردولا ڕێککەوتن لەسەر ئیدارەی یەکگرتوو، هاوبەشی لە داهات، هەڵبژاردن، فەرماندەی پێشمەرگە، هاریکاری نێوان ئەنجومەنی هەڵبژێدراو (پەرلەمان)و کۆمەڵەی نێودەوڵەتی[4].

لە نێو ئەم ململانێ ناوخۆییەدا هەردوو پارتەکە درکییان بە کاریگەریی ململانێکان لەسەر پەیوەندییکانی هەرێمو ڕەنگدانەوەی لەسەر پرسی نەتەوەیی کورد لە هەرێمەکە کردبوو. تاڵەبانی دان بەوەدا دەنێت، کە لە جەنگی ناوخۆدا هەر پارتەو لە پەیوەندییە دەرەکیەکانیدا شێوازی تایبەتی خۆی گرتۆتە بەر[5]. بۆیە لە میانی ڕێکەوتنامەی پاریس لە لایەن هەردولاوە پرۆژەی ئاشتی ئامادە کرا بوو لە ناو ئەو پرۆژانەدا گرنگی تایبەت بە

---

[1] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو،ل ١١٦.

[2] کوردستانی نوێ ژمارە ،( ١٥١٤)، ١٩٩٧/١٢/١٩ .

[3] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو،ل ١١٨.

[4] بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٧).

[5] جريدة السفير اللبنانية،٣ /١٩٩٤/٨

پەیوەندییە دەرەکییەکان درابوو. لە پرۆژەی (ی.ن.ك) دا هاتبوو: "نەخشاندنی سیاسەتی دەرەکی، کە ئامانجی، بنیاتنانی پەیوەندی باش لەگەڵ دەوڵەتانی جیهان، بە دەستهێنانی دانپیانانی یاسای و سیاسی بە ئیدارەی کوردی، بەردەوامبونی پارێزگاری نێودەوڵەتی، لابردنی گەمارۆ لەسەر کوردستان، بەدەستهێنانی یارمەتی ئابووری و گەشەپێدان و تەکنیکی و رۆشنبیری، نەخشاندنی سیاسەتی دەرەکی بەرامبەر بە دەوڵەتانی دراوسێ، کە لەسەر ئەم بنەمایانە بنیاتنرابێت، سیاسەتی دراوسێ باشی و دەسوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆ، حەرامکردن و بە تاوانکردنی هاریکاری لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ لە بوارەکانی تیرۆرو تێکدان و سیخوری دژی بەرژەوەندییەکانی گەلی کوردستان، جیاکردنەوی نوێنەری پارتەکان لە نوێنەری ئیدارەی کوردی، بەهێزکردن و چالاککردنی نوێنەرایەتی ئیدارەی کوردی"[1]. لە پرۆژەی (پ.د.ك) هاتووە، پابەند بوون بە سیاسەتی هاوبەش سەبارەت بە پارت و ئەو لایەنانەی کە نوێنەرییان لە ناو حکومەت نییە، لەگەڵ پارتە کوردستانییەکان بە پێی بەرژەوەندیی باڵای گەلی کوردستانی عێراق. پشگیری و پەرە پێدانی نوێنەرایەتی دەرەکی کوردی و دورخستنەوەی لە حزبایەتی و جەخت کردنەوە لەسەر بەدەسهێنانی زیاتری پشگیری و یارمەتی دەرەکی بۆ ئیدارەی هەرێمەکەو هەروەها مامەڵەکردنێکی واقعی لەگەڵیدا". لەم دوو دەقەوە ئەوە روون دەبێتەوە، کە یەکێك لە کێشەکانی هەرێمی کوردستان پەیوەندییە دەرەکییەکانە بە تایبەت لەو خاڵەدا کە پارتە سیاسیەکان بە پێی بەرژەوەندی خۆیان نەك بە پێی بەرژەوەندی هەرێمی کوردستان مامەڵەیان لەگەڵ کردووە، بە تایبەت لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێدا. دواتر هەردولا رێکدەکەون لەسەر چەند خاڵێك لە پەیوەندییە دەرەکییەکان، کە گرنگترینیان سەبارەت بە پەیوەندییە ناوچەییەکان، ئەم دەقەی خوارەوەیە، "هەموو هاوکارییەك لەگەڵ ولاتانی دراوسێ یان لەگەڵ حزبە سیاسیەکاندا هەبێت پێویستە بەکارنەهێنرێت لە لایەن حزبێکی دیکەوە دژی حزبێکی تر، بەڵکو پێویستە بۆ بەرژەوەندی کوردستانی عێراق بێت، پێویستە هەردوو حزب ئاگاداری

---

[1] نەوشیروان مستەفا: خەون یان مۆتەکە، یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ، کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر، سلێمانی، بێ ساڵی چاپ، ل٣٥، ل٤٠

یەکتر بکەنەوەو هاوکاری یەکتر بکەن‌و خۆیان لابدەن لە هەڵوێستی یەکلایەنە لەسەر حسابی کورد لەگەڵ ولاّتانی دراوسێ"[1] . دەتوانین بڵێین دوای دوو ساڵ لە حوکمە خۆبەخۆی کورد، ئینجا لە سەروبەندی ڕێکەوتننامەی پاریس، تێڕوانینێکی روون‌و ئاشکرا لەسەر چۆنییەتی بەڕێوەبردنی دەسەلاّت لە ناویشیدا پەیوەندییە دەرەکییەکان پەیدا بوو. هەرچەندە ئەم ڕێکەوتنە هیچ ئەنجامێکی لینەکەوتەوە، بەلاّم لە پرۆژەی هەردولاو لە دەقی ڕێکەوتنەکەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو دەسەلاّتەی لە هەرێمی کوردستان دەگوزەرا، زۆر هەژار بوو لە سیاسەتێکی ناوخۆیی تۆکمەو دپلۆماسیەتێکی بەهێز لە دەرەوەدا. راستی ئەم وتەیە لەوەدا دەردەکەوێت، کە لە ماوەی جەنگی ناوخۆدا پەیوەندییە پارتایەتییەکان پێشی پەیوەندییە نیشتمانییەکان دەکەوێت. هەر پارتەو بۆ سەرکەوتن‌و بەردەوامبون لە جەنگی ناوخۆدا خوازیاری پشتیوانی دەوڵەتە دراوسێکانەوپەیوەندی‌و لێکتێگەیشتن‌و ڕێکەوتنی هاوبەش لە سەر ئاستی پارت–دەوڵەتانی دراوسێ پەیدا دەبێت.

## سێیەم: چەسپاندنی دەسەلاّتی (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) (١٩٩٨–٢٠٠٣):

لە دوای ڕێکەوتننامەی واشنتن، بارودۆخی هەرێم گۆڕانی گەورەی بەخۆوە بینی. ئەو گۆڕانە بریتی بوو لەوەی دوو دەسەلاّتی کوردی بە ناوی هەرێمی کوردستان ئیدارەی سلێمانی‌و هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر هاتە کایەوە. هەریەك لەم دوو ئیدارەیە سەرچاوەیەکی یاسایی بۆخۆی دروست کردبوو، کە بەهۆیەوە حکومەتیان پێکهێنابوو. حکومەتەکانی هەردولا پارتە سیاسیەکانی دیکە تیایدا بەشدار بوون، بەلاّم دەسەلاّتی راستەقینە لە ئیدارەی سلێمانی بەدەست (ی.ن.ك)و لە ئیدارەی هەولێر بەدەست (پ.د.ك) بوو. بە واتایەکی تر هەردوو پارتەکە دەستییان بەسەر ژیانی سیاسی‌و ئابووری هەرێمەکەدا

[1] نەوشیروان مستەفا: خەون یان مۆتەکە، ل٢٨

گرت. ئامانجیشیان راکێشانی جەماوەرو بەهێزکردنی دەسەڵاتی ئیدارەکەیان بوو[1].
خاڵێکی بەرچاوی تر ئەوە بوو، کە هەردوولا دوو ئیدارەی سەربەخۆیان بە تەنیشت یەکەوە لەیەك هەرێمدا بنیات نا کە سەقامگیری بە هەرێم بەخشی بەڵام پرۆژەی بنیاتنانی نەتەوەییان لەناوبرد. ئەمە وایکرد گەرانەوە بۆ یاسا، پەیوەندیی نێوان دەزگا مەدەنیو سەربازیەکان، هەروەها بەگەڕخستنی تواناکان لە ئاستێکی زۆر نزمدا بێت[2]. ئەم دوو دەسەلاتە هیچ بەرهەڵستکارێکی بەهێزیان نەبوو. بۆیە دەسەلاتی خۆیان لە پێناوی پارتەکانیان بەکار هێنا بە جۆرێك دڵسۆزی بۆ پارت جێگای دڵسۆزی بۆ نەتەوە گرتەوە. ئەمە وای کردبوو کە ئەم دوو ئیدارەیە زیاتر لە دوو مقاتەعە یان کانتۆن بچن، نەك وەك پێکهاتەیەکی فدراڵی[3]. بۆیە دەکرێت بڵێین هەرێمەکە لە دوای رێکەوتنامەی واشنتن جەنگی ناوخۆی بەجێهێشتو رووی کردە سەقامگیری. بەلام پرۆژەی نەتەوەییو دابەشبونە ناوچەییەکانی قوڵتر کردەوە.

لە دوای روداوی ١١ی سێپتەمەبەری ٢٠٠١، ئەمریکا کەوتە شەرێکی توند لە دژایەتی کردنی تیرۆرو تۆمەتبارکردنی ئەو دەوڵەتانەی لە پشتی تیرۆرەوەن لە ناویشیاندا عێراق، کە بە پەرەپێدانی چەکی کۆمەڵکوژو هاریکاری ئەلقاعدە لە لایەن ئەمریکاوە تۆمەتبار کرا. ئەم دوو تەوەرە لە لایەك (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)ی لەیەك نزیك کردەوە، چونکە هەردوکییان مێژوویەکی دورو درێژییان لە ململانێ لەگەڵ رژێمی سەدام حسێن تۆمار کردبوو، هەروەها هەردوولا مستەکۆڵەی گروپە تیرۆرستەکانیان بەرکەوتبوو. لەلایەکی تر ئەمریکاو هێزە کوردییەکانی لەیەك نزیك کردەوە، ئەمریکا لە دوای روداوی ١١ی سێپتەمبەر دەستی کرد بە

[1] Henri J. Barkey and Ellen Laipson : IRAQI KURDS AND IRAQ'S FUTURE. MIDDLE EAST POLICY, VOL. XII, NO. 4, WINTER 2005, p116.

[2] Matan Chorev: op. cit.

[3] Michiel Leezenberg The Kurds in a Post-Saddam Iraq: Opportunities, Constraints, and Risks Presented at the American Enterprise Institute on February 3, 2003 . p3

دژایەتی بزوتنەوەی ئەلقاعدەو شانەکانی لە جیهان بە گشتی. لەم کاتەشدا یەکێك لە لقەکانی ئەو رێکخراوە لە ناوچەی سنوری نێوان هەرێمو ئێراندا بوون. لە لایەکی تر ئەمریکا لە دوای رووخانی رژێمی تالیبان لە ئەفغانستان، هەڵمەتی هەمەلایەنەی کردە سەر عێراق ئەوە بوو، بەم هۆیەوە (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) زیاتر لە ئەمریکا بۆ رووخانی رژێمی عێراق نزیك کەوتنەوە لە مارتی ۲۰۰۳. لە ١٤-١٧ی دیسەمبەری ۲۰۰۱ کۆنگرەی بەرهەڵستکارانی عێراقی لە لەندەن بە سەرپەرشتی ئەمریکا بەسترا لەژێر دروشمی (عێراق دوای رژێمی سەدام حسێن). ئەو کۆنگرەیە توانی یەکهەڵوێستی بە (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) بدات، کە هەڵوێستی کوردی لە هاوکێشە هەرێمیو عێراقیدا بەهێز کرد. دوای ئەوە لە ٨ی سێپتەمبەری ۲۰۰۲ کۆنگرەی بەرهەڵستکارانی عێراقی لە هاوینە هەواری سەلاحەدین بەسترا، بۆ روخاندنی رژێمی عێراقی. لە پەراوێزی کۆنگرەیە تاڵەبانیو بارزانی رێکەوتن لەسەر یەکخستنەوەی پەرلەمانی کوردستان کە لە ساڵی ١٩٩٥ بەدواوە دابەش بوو بوو. ئەوە بوو لیژنەیەك پێکهات بۆ ئەو مەبەستە، لە ٤ی ئۆکتۆبەری ۲۰۰۲ یەکەم کۆبونەوەی پەرلەمانی یەکگرتوو لە هەولێر بە ئەنجام گەیشت[١].

پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان لەم قۆناغەدا گۆرانی بەسەردا هات. بە جۆرێك دەتوانین بڵێین پەیوەندییە دەرەکییەکان هەرچەندە لەسەر ئاستی پارت نەك هەرێم بەردەوام دەبێت، بەڵام هەردوو پارتەکە ئامانجییان راگرتنی بالانسی پەیوەندییە ناوچەییەکانە لە بەرامبەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. لێرەدا هەریەك لە (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) لە یەك کاتدا پەیوەندیان بە ئێرانو تورکیاو سوریاوە لە دۆخێکی باشدایەو ئامانجی سەرەکیش، ئاگاداربوونی ئەو دەوڵەتانەیە لە داهاتووی عێراقو هەرێمی کوردستان وەك پارچەیەك لەو دەوڵەتە. هاوکات هاریکارو هاوبەشی سیاسەتی ئەمریکا بوون بە مەبەستی چەسپاندنی پێگەی کورد لە داهاتوی عێراقدا. بۆیە وەك توێژەرێك دەڵێت، "ئەزموونی هەرێمی کوردستان لە حوکمی خۆبەخۆو شێوازێك لە دیموکراسیو پەیوەندی

---

[١] حامد شريف الحمداني: لمحات من تأريخ حركة التحرر الكوردية في العراق، ٢٠٠٤، الأكاديمية العربية في الدنمارك، http://www.ao-academy.org/letters.html، ص٢٤٤-٢٤٥.

دەرەکی، هەستی ئازادیو بارێکی تایبەتی لە لای هەرێمەکە پەیدا کرد. بەجۆرێك هەرێمەکە بە تەواوی گەیشتونەتە ئەو باوەری، کە دەسەلاتی ناوەندی بەغداد ئەگەر هی رژێمی سەدام حسین بێت یان رژێمی نوێی دوای سەدام حسین، ئەوا پێشوازی لێناکرێت"(١).

[1]Bill Park: STRATEGIC LOCATION, POLITICAL DISLOCATION: TURKEY, THE UNITED STATES, AND NORTHERN IRAQ. MERIA. Volume 7, No. 2 - June 2003.
http://www.biu.ac.il/SOC/besa/meria/index.html

# بەشی دووەم

## -پەیوەندییەکانی ئێران و هەرێمی کوردستان

- تەوەری یەکەم- پەیوەندیەکانی عێراق و ئێران
- تەوەری دووەم-تێروانینی ئێران بۆ هەرێمی کوردستان
- تەوەری سێیەم- پەیوەندیەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ئێران
- تەوەری چواردم-کاریگەریی پەیوەندیەکانی ئێران و هەرێمی کوردستان لەسەر بزوتنەوەی رۆژهەلاتی کوردستان

# تەوەری یەکەم
# پەیوەندیەکانی عێراق و ئێران

عێراق و ئێران لە هەشتاکاندا جەنگێکی خوێناوی توند لە نێوانیاندا هەڵگیرسا، کە ماوەی هەشت ساڵی خایاند(١٩٨٠–١٩٨٨)، بەشێکی ململانێکان پەیوەندی بەکێشە مێژوویەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتەوە هەبوو، بەشێکی دیکەی پەیوندی بە ئەنجامی ئەو گۆڕانە سیاسیانەوە هەبوو، کە لە ناوخۆی هەریەك لەو دو دەوڵەتەدا سەریهەڵدا. گرنگترین کێشە مێژوویەکان کێشەی سنوریی بوو. ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حوکمرانی دەوڵەتی سەفەوی و دەوڵەتی عوسمانی. کاتێك لە ڕێکەوتنامەی زەهاودا لە ساڵی١٦٣٩ یەکەم هەوڵ بۆ دیاریکردنی ناوچەی سەروەری و هەژمونی ئەم دوو دەوڵەتە لەسەر شارو دێهاتی ناوچە سنورییەکان درا. هەر ئەم هەوڵە لە ڕێکەوتنی ئەرزەڕۆمی دووەم لە ساڵی١٨٤٧ جەختی لەسەر کرایەوە. پاشان ئەم ڕێکەوتنەی دوایی بوو بە بنەمایەك بۆ پرۆتۆکۆلی (ئەستەمبوڵ) لە ساڵی (١٩١٣)، کە بەپێی ئەم ڕێکەوتنە شەت ئەلعەرەب (ئێرانییەکان پێی دەڵێن اروند رود) دەبێتە هێڵی یەکلاکەرەوە. دواتر کۆمسیۆنێك لە ساڵی ١٩١٤ سەرپەرشتی رەنگڕشتنی هێڵەکەی کردو چەندین خاڵی سنوری دیاریکرد، بەلاّم

سەرهەڵدانی یەکەمین جەنگی جیهانی لەساڵی ١٩١٤، وایکرد، کە ئەنجومەنەکە نەگاتە ئەنجامی کۆتایی[١].

رێکەوتننامەی سنوری نێوان هەردوو دەوڵەتی عێراقیو ئێرانی، بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٣٧ بەسترا. بەو پێیە سنوری نێوانیان بە (١٢٠٠کم) خەملێنرا، کە لە سنوری تورکیا لە باکورەوە دەستپێدەکاتو تا (کەنداوی عەرەب/ فارسی) درێژ دەبێتەوە. هەر لەم پێناوەدا لیژنەیەك پێکهێنرا بۆ دیاریکردنی سنوور لەسەر زەوی بە شێوەیەکی پراکتیکی. بەلاّم ئەم لیژنەیە نەیتوانی بە تەواوەتی سنورەکە یەکلایی بکاتەوە[٢]. ئەو ناوچانەی، کە کێشەی لەسەر بوو، بریتی بوو لە رووباری (بناوە سوتاو) لە سلێمانی، رووباری (قۆرەتوو، ئەلوەند، کنگیر)، لە پارێزگای دیالە، رووباری (کنجانو کلاڵ) لە کوت، روباری (طیب، دویرج، شط الاعمی، نهر کرخە) لە عمارە، روباری (کارۆن) لە بەسرە. کێشەیەکی تر کەنارە ئاویەکانی ئێرانو عێراق بوو لەسەر کەنداوی فارسی، لەگەڵ کێشەی خێڵەکان، کە لە سنوورەکانی نێوان هەردولادا دابەشبووبوون. لەوانە خێڵەکانی جافو پشدەر و شێخ مەمەندیو باڵەكو خەیلانیومام وەسانو سورچیو هەرکی لە کوردستانی دابەشکراوی نێوان عێراقوئێراندا. هەروەها خێلە عەرەبیەکانی سنوری پاریزگای کوتو عەمارەو بەسرە[٣]. ئەم کێشەیە بە هەڵپەسێراوی مایەوە تا لە ساڵی ١٩٧٥رێکەوتنامەی جەزائیر لە نێوان هەردولا واژۆ کرا ، کە بە گەرانەوە بۆ پرۆتۆکۆلی ساڵی ١٩١٣و کۆمسیۆنی دیاری کردنی سنور لە ساڵی ١٩١٤،

---

[١] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، رجاء حسين حسيني الخطاب: العلاقات العراقية-الفارسية ١٨٤٧-١٩٨١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١، ص ص ٢٧-٤٣. علی ئومیدی: "اعتبار پیمان ١٩٧٥ از دید حقوق بین الملل"، فصلنامه سیاسی اقتصادی، شماره ٢٤٣-٢٤٤، ص٦-٧. محمد هاتف: روابط ایران وعراق و مسئله اروندرود، چاپ مروی، تهران، ١٣٧١، ص ص٥١-٦٨.

[٢] فلاح شاكر اسود: الحدود العراقية الايرانية، دراسة في المشاكل القائمة بين االبلدين، مطبعة العاني، ١٩٧٠، ص٢٢-٢٣.

[٣] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، فلاح شاكر اسود: المصدر السابق، ص٥٢-١٢٤

هەردولا لەسەر سنووری نێوانیان رێکەوتن[1]. بەلأم ئەم کێشەیە لێرەدا کۆتایی نەهات‌و بوو بە یەکێك لە هۆکارەکانی جەنگی هەشت ساڵە، بە تایبەت کاتێك وەزارەتی دەرەوەی عێراق بە فەرمی لە١٧ی سێپتەمبەر ١٩٨٠ رایگەیاند، کە عێراق تاك لایەنە پەیماننامەی ساڵی ١٩٧٥ی رەتکردەوە[2].

دەکرێت ئەم خاڵە مێژوویە بە یەکێك لە گرنگترین خاڵەکانی ململانێی نێوان عێراق‌و ئێران دابنرێت، کە لە مێژوی نوێ تا مێژوی هاوچەرخ، لە دەسەلأتێکەوە بۆ دەسەلأتی دواتر گواستراوەتەوە. بەلأم خاڵێکی تر، کە هۆکاری ململانێکە بوو بریتی بوو لەو رووداوە ناوخۆییانەی، کە لە هەردوو دەوڵەتدا رویدا. لە ئێران شۆرش لە ساڵی ١٩٧٩ سەریهەڵدا ، بە رابەرایەتی یەکێك لە ئیمامە توندرەوەکانی شیعەکان، کە روح الله خومەینی[3] بوو. ئەم شۆرشە مەترسیەکی گەور بوو بۆ سەر عێراق چونکە، خومەینی بەئاشکرا رایگەیاند کە " ئێمە شۆرشەکەمان بۆ جیهانی دەرەوە هەناردە دەکەین". عێراق بەهێزترین کاندیدی ئێران بوو بۆ هەناردەکردنی شۆرش، چونکە جگە لەوەی زۆرترین سنووری وشکانی لەنێوانیاندا هەیە، هاوکات عێراق نزیکەی (٦٠٪)ی شیعیە مەزهەب بوو[4]. هەروەها پێگەی مەزارگەی

---

[1] منوچهر پارسادوست: ریشهای تاریخ اختلاف ایرانو عراق، چاپ چهارم، چاپخانه حیدری، تهران، ١٣٦٩، ص ص ٤٠٠-٤٠٣.

[2] رجاء حسين حسيني الخطاب: المصدر السابق، ص ٢٢.

[3] ئایەتوللا روحوللا موسەوی خومەینی (١٩٠٢- ١٩٨٩) لە نزیك شاری تاران لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٠٨-١٩٦٢ خەریکی خوێندنی‌و توێژینەوەی زانستە ئیسلامییەکان بووە. لە ساڵی ١٩٦٢-١٩٧٩ دەستی کردووە بە چالاکی سیاسی و خەبات لە دژی رژێمی محەمەد رەزا شا. لە ساڵی ١٩٦٤ بەهۆی بۆچونە توندرەوییەکانییەوە شای ئێران لە ئێرانی دورخستەوە. لە ١ی فەبرایری ١٩٧٩ گەرایەوە ئێرانو بوو بە دامەزێنەرو رابەری کۆماری ئیسلامی ئێران. مصطفی اللباد: حدائق الاحزان،ایران و "ولاية الفقيه"، دار الشروق، القاهرة، ٢٠٠٥، www.albainah.net ص٩٤-٩٦

[4] لیام ئەندەرسن‌و ڤکاریپ ستانسفیلد: ئایندەی عێراق، دکتاتۆری، دیموکراسی یان دابەشبوون، و: کامیار سابیرو دلشاد حەمە، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٧، ل١٨٩. حازم صاغية: بعث العراق، سلطة صدام قياما وحطاما، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٣، ص ١٠٥.

ئیمامە گەورەکانی شیعەی جیهان لە عێراقدا بوو. وێڕای ئەوەی بەهێزترین دەوڵەتی عەرەبی عەلمانیش بوو لە ناوچەکەدا. لەم سەرو بەندەدا صادق خەلخالی[1]، راستەوخۆ رژێمی سەددام حسێنی بە ئامانجی ئێران دەستنیشان کرد بۆ هەناردە کردنی شۆڕش[2]. هەروەها خومەینی، سەدام حسینی بە کافر دادەناو سزادانی بە پێویستیەکی ئاینی دانا[3].

لە دوای هەشت ساڵ جەنگ کە بە یەکەمین جەنگی کەنداو ناوی دەرکرد، ئێران لە٢٠ ئۆگستۆسی ١٩٨٨ بە بڕیاری (٥٩٨) ی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کۆتایی هاتنی جەنگ رەزامەندی خۆی پیشاندا. بەڕای پسپۆڕێکی ئێرانی، ئەسغەر جەعفەر ولدانی، ئەم رازی بونەی ئێران بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە لە وانە، عێراق بوو بە خاوەنی موشەکی بالیستی دور هاوێژو چەکی کیمیاوی، هەروەها لە بەرەکانی جەنگ سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، لەلایەکی تر ئەگەرەکانی روبەروبونەوەی سەربازی نێوان ئەمریکاو ئێران زیاتر بوو بوو، بە تایبەت دوای ئەوەی فرۆکەیەکی ئێرانی بە (٢٩٠) سەرنشینەوە لە لایەن ئەمریکاوە لە دەریای فارسی خرایە خوارەوە. وێڕای ئەمانە ئابوری ئێران توانای بەردەوامبونی جەنگی لەدەست دابوو[4].

دوو ساڵ دوای کۆتایی هاتنی جەنگی هەشت ساڵە لە رووداوێکی کتوپردا لە ٢ی ئۆگستۆسی١٩٩٠ عێراق تەواوی خاکی کوێتی داگیر کرد. ئەمریکا بەسەرکردایەتی خۆی

---

[1] حجەت ئەلئیسلام صادق خلخالی: (١٩٢٦– ٢٠٠٣) یەکەم قازی شەرعی بووە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران. بە توندرەویو هەڵوێستە یەکلاکەرەوەکانی ناسرابوو بەرامبەر بەرهەڵستکارانی شۆڕشو تاوانباران. لە کۆتایی ژیانیدا کەنارگیری هەڵبژاردبوو، هەروەها دانی بەوەدا ناوە، کە نزیکەی ٢٠٠٠ هەزار کەسی لەسێدارە داوە http://www.aawsat.com

[2] Efraim Karsh : Essential Histories:The Iran-Iraq War 1980-1988 OSPREYPUBLISHING. Osprey Publishing Ltd. UK. 2002. pp112-113.

[3] ولید عبدالناصر: ایران دراسة عن الثورة والدولة، دار الشرق، القاهرة، ١٩٩٦، ص ٨١.

[4] اصغر جعفر ولدانی: روابط ایران وعراق در سالهای ٢٠٠٣–١٩٨٨. در حسین دهشیار و دیگران: مسائل ایرانو عراق، مؤسسه فرهنگ مطالعات و تحقیقات بین المللی ابرار معاصر، تهران،١٣٨٢، ص ص١٠–١١.

هاوپەیمانییەکی پێکهێنا، کە لە ٣٠ دەوڵەت پێکهاتبوون. ئەم هاوپەیمانانە لە ١٧یەنایر-٢٤ی فەبرایری١٩٩١، لەگەڵ عێراق کەوتنە جەنگی سەربازییەوە، کە بە "دووەمین جەنگی کەنداو" ناوبرا[١]. ئەوەی جێگای باسە سەرجەم دراوسێکانی عێراق لەو هاوپەیمانیەتەدا بەشدار بوون، جگە لە ئێران نەبێت، کە بێلایەنی خۆی راگەیاند[٢]، لەسەر زمانی سەرۆك کۆمار هاشمی رەفسەنجانی[٣]. ئەم هەڵوێستەی ئێران بە دوو قۆناغدا تێپەری کرد. قۆناغی یەکەم، بریتی بوو لە دەسپێکی کێشەکە، لە ٢ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠ – ١٥ی ئۆگستۆسی١٩٩٠. لەم قۆناغەدا ئێران ئیدانەی داگیرکاری عێراقی کردو پشگیری چارەسەری سەربازی بۆدەرکردنی عێراق کرد. بەلاّم دوای ئەمە قۆناغی دووەم دەستپێدەکات، کە ناوەراسی ئۆگستۆس، تا کۆتایی فبرایری ١٩٩١ دەخایەنێتو وەرچەرخانێك لە هەڵوێستی ئێرانیدا روویدا، کە بەتوندی ئیدانەی بوونی هێزی هاوپەیمانانی لە کەنداوی عەرەبی/ فارسیدا کرد. هۆکاری ئەم وەرچەرخانە لە هەڵوێستی ئێرانادا دەگەرێتەوە بۆ هەڵوێستی عێراق، کە لە کاتی قەیرانەکەدا بەرامبەر ئێران پەیرەوەی لێکرد[٤].

عێراق بۆ ئەوەی ئێران لە شەردا بێلایەن بێتو سود لە بێلایەنی دراوسێکەی وەربگرێت، هاوکات بۆ یەکخستنی هەڵوێستی ئێرانیو عێراقی لە دژی هەڵوێستی سعودی لە ناوچەکەدا

---

[١] ماریون فارووق سلوغلت وبيتر سلوغليت: المصدر السابق، ص٣٧١.

[٢] حسين علي : هل ستصبح ايران دولة نووية تخشاها الدول المجاورة لها؟ كتب عربية، kotobarabie.com، ص٩٢

[٣] عەلی ئەکبر هاشمی رفسنجانی لە فبرایر ١٩٣٤ لەدایك بووە. ساڵی یەکەمی شۆرشی ئێران وەزیری دەرەوە بووە. لە ساڵی(١٩٨١ – ١٩٨٨) سەرۆکی پەرلەمان بووە. لە ساڵی(١٩٨٩-١٩٩٧) سەرۆك کۆمار بووە. پاشان سەرۆکی ئەنجومەنی شارەزایان بووە لە. لە ساڵی ٢٠٠٧ بووە بە سەرۆکی کۆری دیاریکردنی بەرژەوەندی رژێم، (مجمع تشخيص مصلحة النظام). هاوکات پۆستی بەرپرسی ئەنجومەنی شارەزایان ( مجلس الخبراء)ی هەبووە. بە هۆی نارازی بوونی لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٩، پێگەی سیاسی لە ناو دەوڵەت لاواز بووە. http://www.alrashead.net

[٤] عبدالله فهد النفيسي: ايران والخليج، دياليكتيك الدمج والنبذ، دار القرطاس، kotobarabie.com، ص٣٦

کە بنکەی لەشکری هاوپەیمانان بوو، لە لایەکی تر بۆ رووتووشکردنی داگیرکردنەکەی بەگووتاری ئیسلامی[1]. لەبەر هەموو ئەوانە عێراق کۆمەڵێك سازشی گەورەی بۆ ئێران کرد، کە گرنگترینیان، سەرجەم زەوییە داگیرکراوەکانی بندەستی عێراقی گەراندەوە بۆ ئێران، کە زیاتر لە (٢٥٠٠) کم دووجا دەبوون. دانینا بە رێکەوتنامەی ساڵی ١٩٧٥. رەزامەندی پیشاندا لەسەر رادەستکردنەوەی زۆرینەی دیلە ئێرانییەکان. عێراق بەڵێنیدا، کە چالاکییەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە عێرقدا سنوردار بکات. هەروەها بڕیاریدا، کە نەوتی عێراق رەوانەی ئێران بکات. دواجار عێراق بەرپرسیارێتی خۆی لە جەنگی هەشت ساڵە گرتە ئەستۆ. هەموو ئەمانە وایکرد، ئێران لێرە بەدواوە سیاسەتی خۆی بگۆڕێت و هەستا بە ئیدانەکردنی ئەو ژمارە زۆرەی سەربازانی ئەمریکی و فەرەنسی و بریتانی لە ناوچەکەدا، چونکە ئێران گەیشتە ئەو باوەرەی، کە کێشەکە لە دەرکردنی عێراق لە کوێتەوە گۆڕاوە بۆ قایمکردنی جێگەپێی لەشکری ئەمریکی لە کەنداوی عەرەبی/فارسی. هەروەها دوای عێراق، کۆماری ئیسلامی ئێران دەبێتە ئامانجی ئەم هێزانە. وێڕای هەموو ئەو سازشەی، کە عێراق دەرخواردی ئێرانیدا، بەڵام تا کۆتایی کێشەکە ئێران مکوڕ بوو لەسەر دوو هەڵوێست، یەکەمیان پێویستە عێراق تەواوی خاکی کوێتی چۆڵ بکات و سەروەری تەواو بۆ کوێت بگەڕێتەوە. دووەمیان نابێت بە هیچ جۆرێك گۆڕانکاری لە سنوری نێوان کوێت و عێراقدا بکرێت، بۆ ئەوەی عێراق نە لە ئێستاو نە لە داهاتودا هیچ تایبەتمەندیەکی ستراتیجی لە بەرئەنجامی ئەو داگیرکاریە دەستگیر نەبێت[2].

بە دۆڕاندنی عێراق لە دووەمین جەنگی کەنداو ئێران سودێکی گەورەی پێگەیشت، چونکە عێراق بەدرێژایی ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکان پارسەنگی هێز بوو لە رۆژهەڵاتی

---

[1] ابراهيم محمد حسن: الصراع الدولی فی خليج العربی، مؤسسة االشارع العربی،کويت، ١٩٩٦، ص١٣٧.

[2] عبدالله فهد النفيسی: المصدر السابق، ص٣٨

ناوەڕاست بەگشتی‌و لە کەنداوی عەرەبی/فارسیدا بە تایبەتی[1]. بۆیە بە لاوازبونی عێراق، تای بالآنسەکە بە قازانجی ئێران تەواو بوو. بە تایبەت ئەو لەمپەرە عێراقیەی کە لەبەردەم ئێراندا بوو بۆ ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی کەنداودا، نەما[2]. لە لایەکی تر بەهۆی ئەو دانپیانانەوە، کە عێراق لە میانەی دووەمین جەنگی کەنداو بۆ ئێرانی دەربڕی، نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٩ی دیسەمبەری١٩٩١ لە جەنگی هەشت ساڵەدا، عێراقی تاوانبار کردو بڕی زیانەکانی ئێران بە (٩٧,٢) ملیار دۆلار خەملآند[3].

لە بەرامبەردا لە دوای ئەو شکستەی کە لە کوەیتدا عێراق توشی بوو، وایکرد لە ئاستی نێودەوڵەتی‌و هەرێمیدا توشی کەنارگیری بێت، بۆیە دەیویست سوود لە هەڵوێستی بێلایەنی ئێران وەربگرێت. بۆ ئەم مەبەستە توانی لە چەند لایەکەوە سودمەند بێت. لایەنی یەکەم توانی بە درێژایی ساڵانی نەوەدەکان نەوتی قاچاخ لە ئێرانەوە ڕەوانەی دەرەوە بکات، هەر لە میانەی دووەمین جەنگی کەنداودا بوو وەزیری دەرەوەی عێراق تاریق عەزیز[4]، لە سەردانێکی بۆ ئێران لە ١٠ی سێپتەمبەری ١٩٩٠، باسی ئەوەی کردبوو کە عێراق پێشنیاری هەناردەکردنی نەوتی عێراقی لە خاکی ئێرانەوە دەکات، هەرچەندە بە فەرمی ئێران ئەوەی ڕەتدەکردەوەو پابەندی خۆی بۆ سزا نێودەوڵەتییەکانی سەر عێراق دەربڕی بوو، بەلآم ئەمریکا بەردەوام ئێرانی بەوە تۆمەتبار دەکرد، کە نەوتی عێرق بە قاچاخ هەناردەی بازارەکان دەکات‌و لە ساڵی ١٩٩٧، بڕی داهاتی ساڵانەی ئەو نەوتە قاچاخە بە یەك ملیار

[1] سید محمد صدر: "طرح امریکا برای سرنگونی حکومت عراق: عوامل و واکنشها". فصلنامه سیاست دفاعی سیاست دفاعی: شماره، ٢٦،٢٧، سال هفتم، ١٣٧٨، ص ٢٧.

[2] ابراهيم محمد حسن: الصراع الدولي في خليج العربي، ص١٣٧-١٣٨

[3] اصغر جعفر ولدانی: همان منبع قبل،ص٢٠

[4] لە بنەڕەتدا ناوی میخائیل یوحەننایە لە خێزانێکی کاسۆلیکی لە موسل لە ساڵی ١٩٣٦ لەدایك بووە. هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریوسە لە زمانی ئنگلیزی لە زانکۆی بەغداد. لە ساڵی (١٩٧٩-١٩٩١) وەزیری دەرەوە بوو. لە ساڵی (١٩٧٩-٢٠٠٣) جێگری سەرۆك وەزیران بووە. لە ٢٤ی ئەپریلی ٢٠٠٣ خۆی رادەستی سوپای ئەمریکا لە بەغداد کرد. http://ar.wikipedia.org

دۆلار مەزەندە کرد[1]. لە بەرامبەر نەوتی قاچاخدا ئێران بابەتی خواردەمەنیو دەرمانی دەخستە بازاڕەکانی عێراقەوە. ئەم پەیوەندیانە هێندە بەهێز بوو ئەندامی لیژنەی سیاسەتی دەرەوە لە مەجلیسی شورای ئێرانی جەواد لاریجانی، وتی: "هیچ دەوڵەتێك بەقەد ئێران ناتوانێت یارمەتی عێراق بدات لەرووی ئابوورییەوە"[2].

لە دوای دووەمین جەنگی کەنداو یەکێك لە ئامانجە گرنگەکانی سیاسەتی دەرەوەی عێراقی، بریتی بوو لە هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری. لەم پێناوەدا وەزیری دەرەوەی عێراق محەمەد سعید سەحاف[3]، سەردانی تارانی کرد لە ١٦ی یەنایری١٩٩٨ بۆ ئەوەی محەمەد

---

[1] اصغر جعفر ولدانى: همان منبع قبل،ص٢١.

[2] Anthony H. Cordesman and Ahmed S. Hashm: Iraq Sanctions and Beyond, Westview Press, Colorado.1997, 191

[3] محەمەد سەعید سەحاف لە ساڵی ١٩٤٠ لە شارۆچکە حللەی نزیك شاری کەربەلا لەدایك بووە. دەرچوی بەشی ڕاگەیاندنە لە زانکۆی بەغداد. لە ساڵی ١٩٦٣ پەیوەندی بە حزبی بەعس کردووە. چەند پۆستێکی لە ناو حکومەت وەرگرتووە گرنگترینیان بەڕێوەبەری تی ڤی عێراقی بووە، هەروەها نوێنەری عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان. پاشان بوو بە وەزیری دەرەوەی عێراق لە ساڵی ١٩٩٢-٢٠٠٢. دواتر بووە بە وەزیری ڕاگەیاندن تا ساڵی ٢٠٠٣. http://ar.wikipedia.org

خاتەمی[1]، وەك سەرۆکی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی[2]، پشگیری هەڵگرتنی سزاکانی سەر عێراق بکاتو کۆتایی بە کەنارگیریەکەی بهێنێت[3].

دواجار ئەوەی عێراقی بە ئێرانەوە گرێ دابوو، سیاسەتی ئەمریکا بوو، بەرامبەر ئەو دوو دەوڵەتە. سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بیل کلینتۆن[4]، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتیدا سیاسەتی (الاحتواء المزدوج) ی لە بەرامبەر ئێرانو عێراق بەکارهێنا، کە مەبەست تیایدا بەرگرتن بوو لە ڕۆڵی ناوچەیی ئەم دوو دەوڵەتە، بەجۆرێك تەواوی کاریگەریان بۆ دروستکردنی تەنگژەو باری ناجێگیر لە ناوچەکەدا پەکبخات[5].

---

[1] حجەت ئەلئیسلام محەمەد خاتەمی، پێنجەمین سەرۆك کۆما ری ئێرانە. لە ساڵی ١٩٤٣لە خێزانێکی ئاینی لەدایك بووە. بروانامەی بەکالۆریۆسی لە فەلسەفەی ئیسلامی لە زانکۆی ئەسفەهان لە ١٩٦١ بەدەسهێناوە. لە ساڵی ١٩٨٢ بووە بە وەزیری ڕۆشنبیری. لە جەنگی ئێرانو عێراق بەرپرسی سەرکردایەتی جەنگی ڕاگەیاندن بووە. سەرۆك کۆماری ئێران بووە لە (١٩٩٧-٢٠٠٥). http://www.aljazeera.net

[2] ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٦٩ دامەزراوە بە بەشداری ٢٦ دەوڵەتی زۆرینە موسڵمان لە ریبات. دواتر لە ساڵی ١٩٧٠ کۆنگرەی وەزیرانی دەرەوەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە جدده بەسترا. ئامانج تیایدا چەسپاندنی هاریکاری ئیسلامیانەی نێوان دەوڵەتە موسوڵمانەکانە. ئێستا ٥٧ ئەندامی هەیەو سەرۆکەکەی ئەکمەل ئەلدین ئیحسان ئۆگلۆیە. http://www.islamicsummit.org

[3] الانصات المركزي، نشره، معلوماتيه يوميه يصدرها مكتب الاعلام المركزي للاتحاد الوطني الكردستاني، عدد (٨٢٨). /١٩٩٨/١/١٧

[4] بیل کلنتۆن ناوی ڕاستەقینەی ولیام جیفرسون بلاییسە. لە ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بووە. پسپۆری یاسای گشتییە. لە ساڵی ١٩٧٨ بووە بە حاکمی ویلایەتی ئەرکانساس. لە ساڵی ١٩٩٣ بووە بە چلو دووەمین سەرۆکی ئەمریکا تا ساڵی ٢٠٠١. لە گرنگترین ڕووداوەکانی سەردەمی کلنتۆن ڕێکەوتنامەی ئۆسلۆی نێوان فەلەستینییەکانو ئیسرائیلە /http://www.islamicnews.net

[5] سیاسة الاحتواء المزدوج: "Dual Containment": لە لایەن مارتن ایندك Martin Indyk، تیۆریزە کرا کە نوێنەری پەیوەندییە دەرەکییەکان بوو لە لیژنەی ئاسایشی نەتەوەی لە ١٨ی مایۆی ١٩٩٣ لە کۆبونەوەی پەیمانگای واشنتن بۆ سیاسەتی ڕۆژهەلاتی نزیك باسی کردبوو. ئەو باسی ئەوی کردبوو دوای ئەوەی کە بریتانیا لە سەرتای حەفتاکان بە تەواوی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست پاشەکشی کرد، ئەمریکا

سەرۆکی مەجلیسی شورای ئێران علی ئەکبر ناتق نوری[1]، لە بەرامبەر ئەو سیاسەتەی ئەمریکادا رایگەیاند، کە "ئێرانو عێراق پەیوەندیەکەیان گەیشتۆتە ئاستێك کە دەتوانن بالآنسی هێز لە بەرامبەر هێزی ئەمریکا لە کەنداوی فارسیدا رابگرن"[2]. هەروەها سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بوشی کوڕ[3]، لە دوای رووداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، هەردوو دەوڵەتی لە بەرەی شەڕ لە دژی ئەمریکا ناونا، ئەوە بوو لەم بارەیەوە سەددام حسین رایگەیاند، کە پێویستە ئێرانو عێراق کێشەکانیان لەبیر بکەنو هەوڵبدەن هاوپەیمانییەکی ستراتیجی دژی ئەمریکا پێکبهێنن[4].

ئێران لە نەوەدەکاندا بە سەرکردایەتی رەفسەنجانی هەڵمەتی دووبارە بنیاتنانەوەی دەگوزەراند، لەو کاتەدا سیاسەتی دەرەوەی ئێران بریتی بوو لە جەخت کردنەوە لەسەر سود وەرگرتن لە لایەنی دەرەکی بۆ دووبارە خۆبنیاتنان، بۆیە ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی ئێران، باشکردنی پەیوەندییەکانی بوو لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا. لە ٢٧ی مایوی ١٩٩١دا رایگەیاند بە جۆرێك، کە "پێویستە هاریکاری دەرەکی جێگای رووبەرو بونەوەی دەرەکی

---

بەرپرسیاریەتی ناوچەکەی گرتە دەستو سیاسەتی بەرامبەر کەنداو بریتی بوو لەوەی کە عێراقو ئێران بەرامبەر یەکترو دژی یەکتر بەکار بهێنێتو بالآنسێك دروست بکات ئەم سیاسەتە تا داگیرکردنی کوەیت بەردەوام بوو، بەلآم لە دوای دووەمین شەری کەنداو ئەم سیاسەتە پێویستە بگۆردرێت بە شێوەیەك کە عێراقو ئێران لە جیهان کەنارگیر بکرێنو وازیان لێبهێنرێت تا بەرەو خراپی دەرۆنو پاشان دەروخێن. İdris DEMİR: op.cit. p3

[1] لە ساڵی ١٩٣٤ لە مازندەران لەدایك بووە. ساڵی ١٩٨١-١٩٨٥ وەزیری ناوخۆ بووە. لە ساڵی (١٩٨٩-١٩٩٧) سەرۆکی پەرلەمانی ئێران بووە. لە ساڵی ١٩٩٧ خۆی بۆ سەرۆکایەتی ئێران کاندید کرد، بەلآم هەڵنەبژێردرا. http://www.aljazeera.net

[2] Anthony H. Cordesman and Ahmed S. Hashm: op. cit. p192

[3] لە ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٦٨ پەیوەندیی بە هێزی ئاسمانی نیشتمانی لە ولایەتی تەکساس کردووە. حاکمی ویلایەتی تەکساس بووە لەسەر لیستی پارتی کۆماری لە ساڵی (١٩٩٤-٢٠٠٠). چڵو سێیەمین سەرۆکی ئەمریکا بووە لە ساڵی (٢٠٠١-٢٠٠٩). http://www.zuhlool.org

[4] حسین دهشیارو دیگران: مسائل ایرانو عراق،ص٣٢.

بگرێتەوە"، ئەم سیاسەتە هەڵقولاوی کێشەی جەنگی هەشت ساڵە بوو کە بەهۆیەوە (٢٢٠) هەزار کوژراوی لێکەوتبۆوە[1]، (٩٠٪)ی کارگەکانی لە کار کەوتبوون،(٤) ملیۆن ئێرانی بێکار بوون[2].

یەکێك لە بایەخە یەکەمەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران لە نەوەدەکاندا، کێشەی عێراق بوو. ئەم گرنگییە لەو تێڕوانینەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری عەرەبیو رۆژهەڵاتی ناوەراست سەید محەمەد سەدر (١٩٩٣-١٩٩٧)، باسی دەکات کە، "عێراق وێڕای ئەوەی گەمارۆی ئابووریو فشاری بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە سەرەو دژایەتی ئەمریکاو ئیسرائیل دەکات، بەلاّم هێشتا ئامادەگییەکی تەواوی هەیە بۆ ئەوەی ببێتەوە بە عێراقی (١٩٨٠). هێشتا سوپاو یەکە نیزامییەکانو چەکە کۆمەڵ کوژییەکانی ماون. بەم بەڵگانە عێراق هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ ئاسایشی ئێمە، بۆیە گرنگترین پێگەی لە سیاسەتی ئێراندا هەیە، ئەمە واتای ئەوەی نییە کە ئەمریکاو ئیسرائیل پشت گوێ بخەین، ئەو ئەمریکایەی، کە بە درێژایە تەمەنی شۆڕشی ئیسلامی دوژمنێکی بەهێزی ئێران بووەو بە هەموو شێوەیەك بەدوای ئەوەدا ئەگەڕێت، کە ئەو کارە بکات، بەلاّم ئەوەی ئەو کارەی بۆ دەکات بەغدادەو ئێمەش دەبێت ئاگادار بین"[3].

هەر لەم ترسەوە بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ عێراق، دوو باوەڕ لە ناوەندی بڕیاری ئێرانیدا گەلاّڵە بوو. یەکەمیان نەمانی ئەو رژێمەی بە تاکە مەرجی ئاسایی بونەوەی پەیوەندییەکان دەزانی، چونکە بەڕای ئەوان زۆرینەی کێشەکانی نێوان هەردولا بە تایبەت لە شەری هەشت ساڵەدا سەرچاوەکەی سەدام حسینو رژێمەکەی بوون، لە لایەکی تر زۆربونی

---

[1] سەرچاوەیەکی تر قوربانییەکانی ئێران بە ٤٥٠٠٠٠-٧٣٠٠٠٠هەزار کوژراوو ٦٠٠٠٠٠-١٢٠٠٠٠٠ کەمئەندام ، مەزەندە دەکات.

Patrick Clawson and Michael Rubin: Eternal Iran Continuity and Chaos, PALGRAVE MACMILLAN, New York, 2005, p113,

[2] نیفین عبدالمنعم مسعد: صنع القرار في ايران و العلاقات العربية-الايرانية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠١، ص١٩٩-٢٠٠

[3] سيد محمد صدر: همان منبع قبل، ص ٢٧

بڕیارە نێودەوڵەتیەکان لە دژی عێراق، وایکردووە ڕژێمی عێراق، مەشروعیەتی نێودەوڵەتی لەدەست بدات. دواجار عێراق لە ناوخۆشدا لەژێر فشاری نەیارەکانیەتی. لەم سۆنگەیەوە باوەڕی یەکەم پێیوابوو، ئێران پی خۆش بێت یان نا، داهاتووی ئەو ڕژێمە نەمانەو درەنگ یان زوو دەڕووخێت. دووەم باوەڕ پێداگری لەسەر هەبونی پەیوەندی و هاریکاری لەگەل عێراق دەکرد، چونکە لە لایەك ئەو ڕژێمە دژی ئەمریکاو ئیسرائیلە لە لایەکی تر عێراقێکی لاواز بۆ ئێران باشترە وەك لە ڕژێمێکی بەهێز[1].

ئێران و عێراق لە دوای دووەمین جەنگی کەنداو تا جەنگی ئەمریکا لە دژی عێراق، (١٩٩١-٢٠٠٣)، نەیانتوانی بەربەستەکانی بەردەم پەیوەندیەکانیان لابەرن و وەك دوو دەوڵەتی دراوسێ پەیوەندیەکی ئاساییان هەبێت. لەم قۆناغەدا گرنگترین بەربەستەکان بریتی بوو لەم کێشانەی خوارەوە:

١. کێشەی پارتە بەرهەڵستکارەکان: ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەنگی هەشت سالە کاتێك هەردوولا پارتە بەرهەڵستکارەکانی یەکترییان دالدە ئەدا. بە کۆتاییهاتنی جەنگ، کێشەی بەرهەڵستکارەکان چارەسەر نەکرا. ئەوە بوو تاران زۆر بە روونی درکاندی کە یەکێك لە هۆکاری ئالۆزی پیوەندیەکان ئەوەیە ئێران دالدەی (ئ.ب.ش.ئ.ع)، (المجلس الاعلى للثورة الاسلامية فى العراق)[2]، دەدات و ئەوانیش دالدەی (ر.م.خ)، (سازمان مجاهدين خلق ايران)[3]، دەدەن[1].

---

[1] امیر دریابان علی شمخانی: "استعداد بحران افرینی عراق و سیاستهای ایران"، فصلنامه "سیاست دفاعی": شمارە، ٢٦،٢٧، سال هفتم، ١٣٧٨. ص ١٧-١٨

[2] ئەم گروپە لە ساڵی (١٩٨٢) لەسەر دەستی ئێران دامەزرا بۆ مەبەستی کردنەوەی بەرەیەکی دیکەی شەڕ لە دژی عێراق دەیویست سود لە بەرهەڵستکارە عێراقیەکانی دانیشتوی ئێران وەربگرێت. زۆرینەی ئەم گروپە شیعە مەزهەب بون و کوردیشیان تێدا بوو. یەکەم سەرۆکی مەحمود هاشمی بوو پاشان محەمەد باقر ئەلحەکیم، سەرۆکایەتی کرد. Anthony H. Cordesman & Emma R. avies: Iraqs iusurgency and road to civil War (Washington D.C-2008) P 38.

[3] ڕێکخراوی موجاهدینی خەلق، لە ساڵی ١٩٦٥ دژی ڕژێمی محەمەد رەزا شای ئێران (١٩٤١-١٩٧٩)، دامەزرێنرابوو، ئامانجیان رووخاندنی ڕژێمی شاو کۆتایهێنان بە هاوپەیمانێتی نێوان ئەمریکاو ئێران

عێراق لە سەرهەڵدانی راپەرینی ساڵی١٩٩١دا راستەوخۆ ئێرانی تاوانبار کرد، کە پشتیوانی (ئ.ب.ش.ئ.ع) کردووە بۆ راپەرین لە پارێزگاکانی باشوردا[٢]. لە داوای لاوازبونی عێراق لە دووەمین جەنگی کەنداو، ئێران ئەم هەلەی قۆستەوە کە راستەوخۆ هێرش بکاتە سەر کەمپی ئەشرەف، ئەوە بوو لە ٥ی ئەپرلی ١٩٩٢ بۆ یەکەم جار ئێران لە دوای شەری هەشت ساڵە ئاسمانی عێراقی بەزاندو کەمپەکە کەوتە بەر شالاوی (١٢) فرۆکەی ئێرانی لە جۆری (F5) ,(F4)[٣]. ئەم کێشەیە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠دا گەیشتە چڵەپۆپەی ململانێ کاتێك ئێزگەی تاران رایگەیاند کە شەرێکی روبەرو بونەوە لە نێوان ئێران و(ر.م.خ) بووە کە تیادا (٤) لەوان کوژراوە، لە لایەکی تر (ر.م.خ) رایگەیاند، کە شەرەکە لە نزیك شارۆچکەی (بەدرە)ی سەر بە پارێزگای واست رویداوە تیایدا ئێران دەبابەو زرێپۆشی بەکارهێناوەو (١٥)کم هاتۆتە ناو خاکی عێراق[٤]. دوابەدوای ئەم روداوە لە ٦/٥ی فەبرایری٢٠٠٠، (ر.م.خ) هێرشێکیان کردە سەر نوسینگەی سەرۆك محەمەد خاتەمی و کۆمارو هەندێك لە نوسینگەکانی علی خامنیی و هاشمی رەفسەنجانی[٥]،

---

بوو، بۆ ئەم مەبەستە خەباتی چەکدارو توندو تیژیان بە رەوا دەزانی، باوەریشیان بە گرێدانی باوەری مارکسیو ئیسلامی بوو. ئەم گروپە رۆڵی هەبوو لەسەرخستنی شۆرشی گەلای ئێران، بەلام بەهۆی سەرهەڵدانی جیاوازی لەگەڵ رژێمی ئیسلامی ئێران، لە ساڵی ١٩٨١ دەستی کردەوە بە خەباتی چەکداری لە دژی دەوڵەتی ئێران. تا ئێستا ١٢ هەزار هاوڵاتی ئێرانی بونەتە قوربانی ئەو ململانێیە. سەرۆکی ئەم گروپە مەسعود رجوی بوو، کە لە ساڵی ١٩٨٦ خۆیو گروپەکەی لە لایەن عێراقەوە پەنا دران و تەواوی پشگیری سەربازیان لێکردن و شوێنێکیان لە نزیك سنووری ئێرانو لە پارێزگای دیالە بە ناوی (کەمپی ئەشرەف) بۆ تەرخان کرا. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم رێکخراوە بروانە، ولید محمود عبدالناصر: صعود وسقوط التیار الاسلامی فی ایران، دار المستقبل العربی، بیروت، ١٩٩٣، ص ص٨٠-٨١

[١] الانصات المرکزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (٥١٦)، ٢١/١/ ١٩٩٧

[٢] علی الشمرانی: صراع الاضداد، المعارضة العراقية بعد حرب الخليج، دار الحكمة، لندن،٢٠٠٣، ص١٧٥-١٧٦

[3] Anthony H. Cordesman and Ahmed S. Hashm: op. cit. p191

[٤] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد (١٦٠٦)، ١٦/١/٢٠٠٠

[٥] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد (١٤٨٨)، ٧/٢/٢٠٠٠

سەرکردەی باڵای پاسدارانی ئێرانی رەحیم سەفەوی[١] رایگەیاند، کە ئەو چەکدارانەی (ر.م.خ) لە عێراقەوە هاتونو جێگری سەرەك كۆماری عێراق عزەت ابراهیم دوری[٢] و عدی کوری سەدام حسینی[٣] تۆمەتبار کرد. هەروەها داوای لە حکومەت کرد، کە هەڵوێست لە بەرامبەر عێراق وەربگرێت. لە بەرامبەردا عێراق ئەوەی راگەیاند، کە بە هیچ جۆریك دەست وەرناداتە چالاکی سیاسیو سەربازیو کێشەی ناوخۆی (ر.م.خ)[٤]. لێرەدا ئەوەی پێویستە بوترێت، کە سەرۆکی (ئ.ب.ش.ئ.ع) بە ئاشکرا رایگەیاند کە ئەوان لەدەرەوەی سیاسەتی ئێران ناتوانن بچنە ناو خاکی عێراقەوە[٥].

٢. یەکێك لەو کێشانەی، کە جەنگی هەشت ساڵە لەدوای خۆی بەجێیهێشتو گرفتێك بوو لەبەردەم ئاڵۆزی پەیوەندییەکان بریتی بوو لە کێشەی مرۆیی، کە وەزیری دەرەوەی

---

[١] یەحیا رەحیم سەفەوی لە ساڵی ١٩٥٨ لەدایك بووە بەشداری یەکەمین جەنگی کەنداوی کردووە. پلەی جەنەراڵی لە سوپادا هەیە. لە ساڵی ١٩٩٨-٢٠٠٧ سەرکردەی باڵای سوپای پاسدارانی ئێران بووە. ئێستا راوێژکاری باڵای سەرکردایەتی گشتی سوپایە بۆ کاروباری سەربازی. /http://www.aljazeera.net/portal

[٢] لە ساڵی ١٩٤٢ لە شاری ئەلدور لە پارێزگای سەلاحەدین لەدایك بوو. لە بنەماڵەیەکی خێلەکی بووەو پەروەردەیەکی سۆفییانەی هەبووە. لە ساڵی ١٩٦٨ بەدواوە هاورێی سەدام حسین بووە. جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بووە. لە ساڵی ٢٠٠٣ سەرکردایەتی سەربازی ناوچەی باکور بووە. لە دوای مردنی سەددام بووە بە ئەمینداری گشتی حزبی بەعس. http://ar.wikipedia.org/wiki

[٣] عودەی سەدام حسین (١٩٦٤-٢٠٠٣) کورە گەورەی سەدام حسین بووە. سەرۆکی لیژنەی ئۆلۆمپی عێراقی بوو لە ساڵی ١٩٨٦. نەقیبی رۆژنامەنوساتی عێراق بوو. سەرنوسەری رۆژنامەی بابل بوو. هەروەها سەرکردەی هێزی "فیدایی سەددام" بوو. لە ساڵی ١٩٩٦ هەوڵی کوشتنی درا. لە ٢٥ی یۆلیۆی ٢٠٠٣ لەسەر دەستی ئەمریکیەکان کوژرا. http://www.elsmt.com/

[٤] الانصات المرکزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد،(١٤٨٩).٨/٢/٢٠٠٠

[5] Abbas William Samii :THE NEAREST AND DEAREST ENEMY: IRAN AFTER THE IRAQ WAR،Middle East Review of International Affairs (MERIA) Vol. 9, No. 3 (September 2005)، www.meria.idc.icil

عێراق ناجی سەبری پۆلێنی کردبوو بەسەر دیلو بێ سەروشوێنو ئاوارە وگۆری سەربازەکانی بەرەی جەنگ[1]. لە نەوەدەکاندا هەردوولایەن، دوای چەندین دانیشتن نەیانتوانی تەنها کۆتایی کێشەی دیلەکان چارەسەر بکەنە، ئەو ژمارە دیلەی کە ئازادیش دەکران، ئەوە وەك کارتێکی سیاسی لە دانوستانەکان بە کار دەهات نەك وەك کێشەیەکەی مرۆیی، بۆ نموونە عێراق لە میانەی دووەمین جەنگی کەنداودا بەیەکجار (١٨) هەزار دیلی ئێرانی ئازاد کرد، ئەمەش لە بەرامبەر ئەوە بوو، کە ئێران بەشداری شەر لە دژی عێراق نەکات[2]. عێراق بە ئازاد کردنی ئەم ژمارە دیلە نیازپاکی خۆی رادەگەیاندو بەردەوام پێداگری لەوەدەکرد، کە تەنها (٦٤) دیلی لا ماوەو لە بەرامبەردا داوای (١٢) هەزار دیلی خۆی لە ئێران دەکرد[3]. ئەمە لە کاتێکدا بوو ئێران خشتەیەکی پێشکەش کرد بۆ راگەیاندنەکانو تیایدا هاتبوو، کە ئێران بە (١٠٦) جار، (٥٠) هەزار دیلی عێراقی بەرداوە، بەڵام عێراق بە (٧٠) جار (٣٩٤٧١)، دیلی بەرداوەو ئێران داوای (٣٢٠٦) دیلی لە عێراق دەکات[4].

٣. کێشەی فرۆکە عێراقیەکان تەوەرێکی گرنگی ئاڵۆزی پەیوەندیەکان بوو. لە نێوانی دووەمین جەنگی کەنداودا، بۆ سەلامەتی فرۆکەکانی عێراق لە پەلاماری سەربازی هاوپەیمانان، (١٢٧) فرۆکەی جۆراوجۆری نارد بۆ ئێران بەڵام دوای تەواو بونی جەنگ ئێران ئامادە نەبوو دان بەوەدا بنێت، کە ئەو فرۆکانە دەگەرێنێتەوە بۆ عێراق. ئەم فرۆکانە (٢٢) دانە لە فرۆکەی بازرگانی جۆری (IL76) بوون ، (٥) فرۆکەی نەفەر هەڵگری جۆری (BOING) هەروەها (١٠٠) فرۆکەی سەربازی بوون[5]. پسپۆرێکی ئێرانی پێیوایە، کە

---

[1] الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد (٢٠٩٢).٦/١٢/٢٠٠١

[2] عبدالله فهد النفيسي: المصدر السابق، ص٣٧

[3] الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد (٦٧٢)، ٢٠/ ٧/ ١٩٩٧

[4] الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد (١٦٦٤)، ٢/٨/٢٠٠٠

[5] Anthony H. Cordesman and Ahmed S. Hashm: Iraq Sanctions and Beyond, P19٢

بوونی هەندێك فرۆکەی جەنگی لە ناو سوپای ئێرانیدا وەك جۆرەکانی، (ئەلیوشن—٢٧) (ئەلیوشن—٢٥) (ئەلیوشن—٧) (میك—٢٩)،کە پێشتر ئێران نەیبوەو ئێستا لە مانۆرە سەربازیەکاندا دەردەکەوێت، دەیسەلمێنێت، کە ئەوانە فرۆکەی عێراقین و ئێران تازە نیازی نییە بیداتەوە بە عێراق[1].

ئێران لە نەوەدەکاندا سیاسەتی (نە ئاشتی رەهاو نە شەڕ)ی لەگەل عێراق پەیرەو دەکرد، ئەمەش وەك سەرکردەی سوپای پاسداران دانی پیادا نا، کە کێشەی سیاسەتی دەرەکی ئێران لە بەرامبەر عێراق بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە. گرنگترینیان ئەوەیە ئەمریکا سیاسەتێکی دیاریکراوی بەرامبەر عێراق نیە، هاوکات سیاسەتی توندی عێراقیەکان سەبارەت بە بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش، لە سەرو هەمووشیانەوە فرەییی لە مەرکەزی بڕیاردانی ئێرانی ، وایکردووە، سیاسەتێکی ئاشکرای ئێرانی تایبەت بە عێراق نەبێت[2].

بڕیاری رووخاندنی رژێم کە لە لایەن کۆنگرێسی ئەمریکیەوە لە ساڵی ١٩٩٨ دەرچوو[3]، بەرچاورونیەکی بۆ ئێران دروست کرد لە تێڕوانینیان بۆ داهاتوی عێراق. لەو بڕیارەدا گرنگی تایبەتی بە بەرهەڵستکارانی عێراقی لە روخاندنی رژێمی عێراقی درا، ئەویش بە تەرخانکردی ٩٧ ملیۆن دۆلار بۆ بەرهەڵستکاران، بە ئامانجی خۆڕیکخستن و ئامادەبونیان بۆ روخاندنی عێراق. ئەمە لەکاتێکدا بوو بەشێکی گرنگی ئەو بەرهەڵستکارانە شیعەکان بوون و لە ناو بازنەی سیاسەتی ئێران دەخولانەوە، هەر ئەمەیە وا دەکات یەکێك لە بەرپرسانی وەزارەتی هەواڵگری (ئیتلاعات) لەم بارەیەوە دەڵێت:" ئێران سەنگی تەواوی لە عێراقدا لە (٣٠٪-٣٥٪)، بە بێ ئێران ناتوانرێت هیچ گۆڕانێك لە عێراقدا بکرێت هەمان کات ئێرانیش ناتوانێت

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد(٢٠٨١). ٢٠٠١ /١٢/٢٥

[2] امير دریابان علي شمخاني:هەمان منبع قبل. ص١٦

[3] کۆنگرێسی ئەمەریکی لە مانگی (ئۆکتۆبەری ١٩٩٨) بڕیاری "ئازادکردنی عێراق"ی دەرکرد، وەك سیاسەتێکی رونو ئاشکرا بەرامبەر دیاریکردنی دواڕۆژی رژێمی عێراق کە چارەنووسی لەناوچونە، بۆئەم مەبەستە وەك یەکەمین هەنگاو بڕی (٩٧)ملیۆن دۆلار لەلایەن ئیدارەی ئەمریکاوە درا بە بەرهەڵستکارانی عێراق بۆ کارکردن لەپێناو روخاندنی ئەو رژێمە. دانيل بايمن و دیگران: "سياسة أمريكا در قبال عراق، برس چهار سناريو"، مترجم : مريم ملانظر، فصلنامه "سياسة دفاعى"، شماره، ٢٦-٢٧، ١٣٧٨ ، ص٥٦ .

بە تەنها گۆڕان لە عێراقدا بکات"[1]. هەموو ئەمانە وایکرد کە ئێران گرنگی زیاتر بە بەرهەڵستکارانی عێراقی بدات بە تایبەت ئەو چوار لایەنەی، کە بەشداری کۆبونەوەکان لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکی دەکرد، کە (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)و (ك.ن.ع) (المؤتمر الوطني العراقي)[2]. لە هەمووشیان گرنگتر (ئ.ب.ش.ئ.ع) بوو، کە ئێران خواستی ئەوەی هەبوو بەهۆی ئەو ئەنجومەنەوە لە لایەك ئاگاداری نەخشەی ئەمریکا بێت لە عێراق. هەروەها لە داهاتووی عێراقی دوای سەدام حسین دڵنیا بێت، کە تیایدا رەوتە شیعە ئیسلامیەکان رۆڵی کارا بگێڕن. تاڵەبانی دوای کۆبونەوەی لەگەڵ محەمەد خاتەمی لە یەنایری ٢٠٠٣ سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان بەرهەڵستکارانی عێراقی‌و ئێران وتی: "سیاسەتی ئێران بریتیە لە هاریکاری کردنی ئۆپۆزسیۆن لەم پێناوەدا هەموو هاریکارییەکمان پێشکەش دەکات، ئەمەش بۆ دیموکراتی بۆ عێراقێکی یەکگرتوو، هەروەها حوکمی گەل. ئێرانیش دژی هاریکاری ئەمریکا بۆ ئێمە نییە"[3].

لە دوا ساتەکاندا رای ئێران لە پشتگیریکردنی شەڕ گۆڕانی بەسەردا هات لەبەر دوو هۆ، یەکەم: ترسی ئەوەی لێنیشت، کە سوپای ئەمریکی بە تەواوی لە هەر چوارلاوە نزیکی سنورەکانی دەبێتەوە. دووەم: ئەمریکا ئلیتێکی سیاسی عێراقی لە فەرمانڕەوا دامەزرێنێت لەگەڵ سوپای ئەمریکی گەلەکۆمە لە ئێران بکەن‌و بەرهەڵستکارانی ئێرانیش لەم پێناوەدا

---

[1] گروه امنيت ملي: ايندە عراق، فصلنامه "سياست دفاعي": شماره، ٢٦،٢٧، سال هفتم، ١٣٧٨.

[2] کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی-Iraq National Congeess، (INC) لە ساڵی ١٩٩٢ لە لایەن دکتۆر ئەحمەد چەلەبی دامەزراوە. پشتگیری دەرەکی لە لایەن دەستگای هەواڵگری ئەمریکا (CIA) دەستکەوتبوو. لە ساڵی ١٩٩٢-٢٠٠٤، بری ٣٠ ملیۆن دۆلاری لەو دەستگایە وەرگرتبوو. بڕوانە، Spencer C. Tucker: The Encyclopedia of Middle Eeast Wars: The United States in the Persian Gulf, Afghanistan and Iraq Conflicts ( California-2010) p 270.

[3] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد(٢٤٤٨). ٢٠٠٣/١/٩.

بەکار بهێنن[1]. هەر بۆیە وەزیری دەرەوە ئێران کەمال خەرازی[2]، ناڕەزایی خۆی دەربڕی بۆ لێدانی سەربازی لە عێراق و رایگەیاند، کە واشنتن ئەو مافەی نییە، کە حکومەت و رژێمەکان بگۆڕێت، بەلاّم عێراق پێویستە بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش جێبەجێ بکات[3].

---

[1] ئێران دەورویشتی بە هێزی ئەمریکا گیرا بوو. لە باکورەوە هێزی لە هەندێك کۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست جێگیر کردبوو. لە رۆژهەلاّتەوە لە ئەنجامی روداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، ئەفغانستانی داگیرکردو بنکەی سەربازی لێدانا. هاوکات کەشتییە سەربازییەکانی لە کەنداوی عەرەبی/فارسیدا بوون. بۆیە بە داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئەمریکاوە، لە رۆژئاواشەوە ئەمریکا ئێران ئابلّوقە دەدات.

www.meria.idc.icil.Abbas William Samii : op.cit

[2] لە ساڵی ١٩٤٤ لەدایك بووە. هەڵگری بڕوامەی دکتۆرایە لە ئەندازیاری شارستانیدا لە زانکۆی هۆستن لە ئەمریکا. سەرۆکی دەزگای هەواڵی ئێران بووە لە (١٩٨١—١٩٨٩). نوێنەری ئێران بووە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە (١٩٨٩-١٩٩٧). وەزیری دەرەوەی ئێران بووە لە (١٩٩٧-٢٠٠٥).

http://www.marefa.org

[3] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد (٢٢٣٤). ٢٠٠٢/٥/١١.

# تەوەری دووەم
# تێڕوانینی ئێران بۆ هەرێمی کوردستان

کەسێتی ئێرانی بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا دیارە، کە مێژوو کاریگەریەکی زۆری لەسەر داناوە، بۆیە کوردو کێشەکەیان بە رای ئەوان لێکدانەوەیەکی مێژوویی بۆ دەکرێت. کورد بەرای ئێرانیەکان، بەشێکی گرنگ بوون لەو دەوڵەتانەی، کە شانازی پێوە دەکەن، وەك دەوڵەتەکانی ماد(٧٢٨–٥٥٠پ.ز)و هخامنشین(٥٥٠–٣٣١پ.ز)و پارس(٢٤٧پ.ز–٢٢٦ز)و ساسانی(٢٢٦–٦٣٦ز). زمانی کوردیش، کە ناسنامەیەکی تایبەتی بە کورد داوە، یەکێکە لە شاخەکانی زمانی فارسی[١].

ریچارد کوتام[٢]، لە پەنجاکانی سەدەی بیستدا دەڵێت" ئەو ئێرانیانەی، کە پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ مێژوودا هەیە، زۆر باش دەزانن کە پەیوەندییەکی زۆر لە نێوان مێژووی خۆیانو مێژووی کورد هەیە. پێداگری لەسەر ئەوەش دەکەن، کە نەك کوردەکانی ئێران بەتەنها، بەڵکو سەرجەم کوردەکان لە راستیدا ئێرانین". نوێنەری ئێران لە کۆنگرەی ئاشتی پاریسدا لە ساڵی ١٩١٩، داوای ویلایەتی موسڵی کرد، بە بیانووی ئەوەی، کە سنورێك لە نێوان ئێرانو کوردستاندا نیە ، کوردەکانیش ناتوانن لە سنوری یەکەیەکی

---

١ حمید احمدی: قومیتو قوم گرایی در ایران، افسانەو واقعیت، کتابخانه ملی ایران،١٣٧٨،ص٧٦

٢ القومیة فی ایران، ، بدون اسم المترجم،مکتبة الرواد،١٩٧٨، ل١٠٦

سیاسیدا کۆببنەوە[1]. دوای ئەوەی لە لایەن ئەندامانی کۆنگرەی ئاشتی داواکەی بە بێ نرخ سەیرکرا، چیتر داوای مێژووی لە ئێرانەوە بۆ ولایەتی موسلو باشوری کوردستان بەدی ناکەین. محەمەد خاتەمی لە ساڵی ۲۰۰۳ و لە کۆبونەوەیەکی لەگەڵ تاڵەبانیدا، وەك ئاماژەیەك بە پەیوەندیی مێژوویی نێوان کوردو دەوڵەتەکانی ئێران، باسی ئەوەی کردبوو، کە پەیوەندییەکی مێژوویی لە نێوان کوردو ئێراندا هەیەو کورد رۆڵێکی گرنگی لە مێژوی کۆنی ئێراندا بینیوە[2].

دوابەدوای ئەم تێروانینە مێژوویە بۆ کورد، تێروانینێکی تریان هەیە بۆ بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی. بەرای دکتۆر حەمید ئەحمەدی، کە لە توێژینەوەیەکیدا بە ناوی "ئیتنۆو ئیتنۆگەرایی لە ئێران، ئەفسانەو راستی"، بەو ئەنجامە گەیشتوە، کە گروپە جیاوازەکانی وەك کوردو بەلوجو ئازەر ریشەیەکی مێژووییان لە ئێراندا هەیەو لە ژێر کاریگەری میراتی سیاسیو کلتوری ئێرانو ئەزموونی هاوبەشی کۆمەڵگای ئێرانیدا خۆیان بینیوەتەوە. کوردەکانیش تا ناوەراستی سەدەی بیستەم زۆرینەیان خێڵەکی بوونو هەستی جوداخوازیان لە کۆمەڵگای ئێرانی نەبووە، بەڵام ئەوەی، کە ئەم هەستە دروست دەکاتو گروپە خێڵەکیەکان دەکاتە گروپی نەتەوەیی، رۆژهەلاتناسەکانن لەگەڵ سیاسەتی نێودەوڵەتی بە تایبەت لە دووەمین جەنگی جیهانی وای لە کورد کردووە، کە وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ داواکاریان لە ئێراندا هەبێت. لەگەڵ هاندانی دەرەکی بەتایبەت لە لایەن نەیارەکانی ئێرانەوە. هەموو ئەمانە لە لایەن دەستەبژێری کورد بەکار هاتووە، بۆ ئەوەی داستانی نەتەوەو رەگەزی لێ دروست بکەنو شەرعییەت بدەن بە چالاکی سیاسی خۆیان[3]. هەر لەم بۆچوونەوەیە، کە سوپای پاسداران لە سەرەتای شۆرشی ئیسلامیدا نوسینێکی بلاو کردۆتەو بەناوی "کوردستان، ئیمپریالیزمو گروپە وابەستەکانیان"، کە چەند خاڵێك دەخاتە روو لەوانە هەردوو دەوڵەتی وەك یەکێتی سۆڤیەتو ئەمریکا لە ململانێی خۆیانادا کوردستان

---

[1] عبدالرحمن سليمان زيباري: المصدر السابق، ص٥١-٥٢

[2] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد(٢٤٤٨). ٢٠٠٣/١/٩.

[3] حميد احمدي: همان منبع قبل، ص٣٧٢-٣٧٤

ئەکەن بە سەنگەر لە دژی ئیسلامو ئێران. ئەوان لە ڕێگای نەتەوایەتی، نەخوێندەواری کۆمەڵگەی کوردی، جیاوازی مەزهەبیو بە یارمەتی گروپە بەرهەڵستکارە داردەستەکان، ئەم کارانە دەکەن. لە لایەکی تر ئەمریکا بەتایبەتی دەخوازێت لە کوردستاندا ئیسرائیلی دووەم دروست بکات[1]. لێرەدا دەگەینە ئەو باوەرەی کە لە دیدی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە کورد بوون وەك نەتەوەیەکی تایبەت لە ئێرانو کوردایەتی وەك پرۆژەیەکی نەتەوایەتی، دوو شتی هەناردەکراوی بێگانەی رۆژئاواییە، بەڵام ئەوەی کە رەسەنایەتییە ئەوەیە کە کورد شانازی بە ئاینی ئیسلام بکاتو رێزی تایبەتی بۆ ئەو پیاوە ئاینیانە هەبێت کە سەرکەوتنیان بۆ شۆرش بەدیهێناوە، ئاینی ئیسلامو شورشی ئیسلامی ئێران زامنی پارێزگاری کردنی مافی نەتەوەکانە[2].

بەڵام جیاوازییەکی گەورە لە نێوان بۆچوونی ئێرانی بۆ کێشەی کورد لە وڵاتەکەیداو کێشەی کورد لە عێراقدا، کە لە هەرێمی کوردستاندا خۆی دەنواند، هەبوو. بۆچوونی ئێران بەرامبەر هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی دەستوورو سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا دەسوڕایەوە. بە پێی دەستوری ئێرانی، بۆ کۆماری ئیسلامی رەوایە دەست وەربداتە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتێك بەناوی مافی موسوڵمانان یان پشگیریکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی. لەمادەی (١٥٢)ی دەستوری ئێراندا هاتووە: "سیاسەتی دەرەوەی ئێران بەندە لەسەر قەدەغە کردنی هەموو جۆرەکانی سەپاندنی دەسەڵات یان ملکەچیکردن، هەروەها پارێزگاریکردن لە سەربەخۆیی تەواوەتی، یەکێتی خاکی وڵات، پارێزگاری کردن لە مافی هەموو موسوڵمانان، بێلایەنی لە نێوان زلهێزەکان، گۆرینەوەی پەیوەندیی ئاشتیخوازانە لەگەڵ دەوڵەتانی شەرنەکەر". هەروەها لە مادەی (١٥٤) ئەو دەستوورە هاتووە کە "کۆماری ئیسلامی ئێران پشگیری خەباتی ستەمدیدەکان (مستضعفين) لە دژی خۆبەزلزانەکان (متكبرين) دەکات لە هەر ناوچەیەکی جیهان بێت، لە هەمان کاتدا

---

[1] دفتر سیاسی سپاه پاسداران انقلاب اسلامي: کردستان "امپريالیزمو گروههای وابسته،١٣٥٩. ص١٠-١٢

[2] حامد محمود عيسي: المصدر السابق، ص٤٢١

دەستوەرناداتە کاروباری ناوخۆی وڵاتانی تر"[١]. رەفسەنجانی راڤەی ئەم دەقانە بە شێوەیەك دەکات، کە پشگیریکردن مانای دەستێوەردان نییە، نمونەی فەلەستین‌و ئەفغانستان دەهێنێتەوە کە ئەوان پشگیریان دەکەن نەك دەست لە کاروباریان وەربدەن[٢].

لە نەوەدەکاندا سیاسەتی دەرەوەی ئێران سێ ئامانجی هەبوو کە بریتی بوون لە نوێبونەوەو گەشەپێدان. پارێزگاری لە بەرژەوەندی ئیسلام‌و بەرژەوەندی ئیسلامیی. بەرهەڵستی تاك جەمسەری‌و هەژمونی ئەمریکا[٣].

بەپێی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران، هەرێمی کوردستان شوێنێك بوو، کە بەتەواوی لەناو بازنەی گرنگی پێدانی ئێران بوو، چونکە هەرێمی کوردستان کاریگەری هەبو بۆ نوێبونەوە نوێسازی بەهۆی هاوسنوری لەگەڵ ئێران، بەپێی ئەو نەخشەیەی کە رێکخراوی نێودەولەتی (UNICEF) لەساڵی (١٩٩٧) کێشاویەتی، هەرێمی کوردستان سنورێکی هاوبەشی لەگەڵ ئێران بە درێژای (٥١٣کم) هەیە[٤]. ئەمە وایکردبوو، کە هەرێم بازارێکی باش بێت بۆ کاڵاکانی ئێران‌و لە لایەکی تر رێرەوێکی ترانزێت بوو بۆ هەناردەکردنی کاڵا بۆ ئێران. هاوکات خەڵکی کوردستان زۆرینەیان موسلمانن‌و لە هەرێمیشدا پارتە ئیسلامیەکان رۆڵێکی گرنگیان لە روداوە سیاسیەکاندا هەبوو، بۆیە پارێزگاریکردن لە مافی موسڵمانەکانی هەرێم‌و پشگیری کردن لە پارتە ئیسلامییەکان بەپێی دەستوری ئێرانی کارێکی رەوا بوو. لە هەموو ئەمانە گرنگتر هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەمریکادا پەیدا بوو، بۆیە بەرهەڵستیکردنی ئەو هەرێمە وەك یەکەیەکی سیاسی، لە بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران بوو. هەر لەم بارەیەوە یەکێك لە ئەفسەرەکانی سوپای پاسداران بەناوی سردار مسجدی لە کاتی گفتوگۆی بەرپرس‌و توێژەرانی ئێرانی لەسەر ئایندەی عێراق‌و

---

[١] نقلا عن: نفین عبدالمنعم: صنع القرار فی ایران، ص٣١٥.

[٢] نقلا عن، المصدر نفسه: ص٦٤

[٣] امیر محمد حاجی یوسفی: سیاستی خارجی جمهوری اسلامی ایران در پرتو تحولات منطقةای (٢٠٠١-١٩٩١) دفتر مطالعات سیاسی‌و بین‌المللی،تهران،١٣٨٤،ص٥٥-٥٦.

[٤] بروانە پاشکۆی ژمارە ( ١)

هەرێمی کوردستان ، دەڵێت:"ئێمە ستراتیجێکی دێرینمان لە کوردستاندا هەیە، نە پەلە دەکەین‌و نە دوا ئەکەوین. ئێمە پێویستە لەوێ ئامادەبونمان هەبێت. هەرکاتێك پەیوەندیە قوڵەکانی ئێمە لەگەڵ کوردەکاندا بەرەو دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی رۆیشت (کە ئەوە ئامانجی هەموو کوردێکە{ ئەمە وتەی مەسجدییە})، ئەوا ئێمە لەو کارە نزیك نابینەوە. دووەم ستراتیج ئەوەیە نە ئاشتی رەهاو نە جەنگ. بە واتایەکی تر شەر لە کوردستاندا بە قازانجی ئێمە نییە، رازیشمان لەسەر ئەوو شەرە نییە، چونکە خەڵکی ئەو ناوچەیە موسوڵمانن‌و ناوچەکە نائارام دەبێت‌و ئەمە بەهانەیەك دەبێت بۆ ئەوەی کە گەورە هێزەکان دەسوەردان بکەن‌و کێشە لەسەر مەرزەکانی ئێمە دروست دەبێت. هەروەها نابێت ئەم مەرزانە بۆ بەرهەڵستکاران سودمەند بێت. ئێمە لەگەڵ شەڕدا نین لە کوردستان. لە بەرامبەردا تا کاتی دیاریکردنی چارەنوسی عێراق، ئێمە سیاسەتی نە جەنگ نە ئاشتی بەکار دەهێنین، کێشەی کوردیش دەبێت لەو چوارچێوە سەیر بکرێت. واتە ئەگەر سیاسەتی ئێمە سیاسەتی رووبەروو بونەوە بوو، پێویستە ببینین، کە پێگەی کوردستان لەکوێدایە. یان ئەگەر سیاسەتی ئێمە سیاسەتی ئارامکردنەوەی پەیوەندییەکان بوو لەگەڵ عێراق، ئەوا دەبێت ببینین، کە پێگەی کوردستان چۆن پێناسە دەکەین"[1]. هەر لەم سۆنگەیەوە دکتۆر ئەسغەر جەعفەری ولدانی لە تەرزە سەرەکییەکانی سیاسەتی ئێران بەرامبەر عێراق‌و هەرێمی کوردستان لە نەوەدەکان ، بەم شێوەی لای خوارەوە دیاریدەکات:

- رەتکردنەوەی هێرشی ئەمریکا بۆ سەر عێراق
- رەتکردنەوەی هەوڵەکانی ئەمریکا بۆ گۆرینی رژێمی عێراقی
- خۆشحاڵی ئێران سەبارەت بە هەوڵەکان بۆ نەهێشتنی چەکی کۆمەڵکوژ لە عێراقدا
- پێویستە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بری ئەمریکا سەنگی مەحەك بێت لە چارەسەرکردنی کێشەی عێراق
- بەفەرمی ناساندنی مافی چارەنوس بۆ گەلی عێراق
- رێگرتن لە دابەشبوونی عێراق

[1] گروه امنیت ملی: اینده عراق، فصلنامه "سیاست دفاعي": شماره، ٢٦،٢٧، سال هفتم، ١٣٧٨

- ڕێگەگرتن لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی
- پشگیریکردن لە گرتنە بەری ڕێگای ئاشتی لە بری ڕێگەچارەی شەر سەبارەت بە عێراق[1].

لەکۆی ئەم تێروانینە سیاسیەی ئێراندا، دەتوانین بڵێین، ئێران هەموو پەیوەندیەکی ئەمریکا لەگەڵ دەوڵەتی عێراقو هەرێمی کوردستاندا بەناڕەوا دەبینێت. چونکە ئاسایی بوونەوەی پەیوەندیی ئەمریکا لەگەڵ عێراقدا دەبێتە هۆی لاوازکردنی ئێران، لەلایەکی تر هەموو پەیوەندییەکی ئەمریکا لەگەڵ بەرهەڵستکاراندا بۆ ئەوەیە، کە گروپێك ئایندەی دەوڵەتی عێراقی بگرێتە دەست، کە ببێتە ڕکەبەرێکی ئێران لە ناوچەکەدا یان عێراق دابەشبکاتو بەوەش دەوڵەتی کوردی لێوە پەیدا دەبێت، کە لە هەردوو باردا ئاسایشی ئێران دەخاتە مەترسیەوە. تەریب بەم بۆچونە سیاسیە، بەلاّم بە پێچەوانەوە، ئێران پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراقو کوردستان بە ڕەواو بە مافی خۆی دەزانێت چونکە عێراق زۆرینەی موسوڵمانی شیعەیەو پێویستە پشگیریان بکرێت، هاوکات هەرێمی کوردستانیش وەك ئەوەی کە هەرێمێکی یەکەم موسوڵمانو دووەم ستەمدیدەی دەستی ئیمپریالیزمو دوژمنانی ئێرانن (لە دیدی ئێرانیەکانەوە)، بۆیە بۆ ئێران ڕەوایە، کە دەست لە کاروباری هەرێمی کوردستان وەربداتو بەرژەوەندیەکانی خۆی لەم هەرێمەدا بپارێزێت.

---

[1] حسین دهشیارو دیگران: مسائل ایرانو عراق،ص۳۱

# تەوەری سێیەم
# پەیوەندیەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ئێران

دەتوانین پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ئێران لەروی پراکتیکیدا بۆ چوار قۆناغ دابەش بکەین، (١) کۆرەوی بەهاری ساڵی١٩٩١، (٢) دامەزراندنی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان (١٩٩٢–١٩٩٤)، (٣) جەنگی ناوخۆ (١٩٩٤–١٩٩٨)، (٤) ساڵانی (١٩٩٨–٢٠٠٣)

قۆناغی یەکەم: کۆڕەوی ساڵی (١٩٩١)

لەگەڵ سەرهەڵدانی راپەرینی گەلانی عێراق لە سەرەتای مارتی ١٩٩١، لە باشوورو باکوورەوە ئێران رێگەی بە بەرهەڵسکارە عێراقیەکاندا، کە خاکی ئێران بەکار بهێنن بۆ هێرشکردنە سەر رژێمی سەدام حسین. ئەمە وەك هەڵوێستێکی دەستخۆشی ئێرانی وابوو لە راپەرینێك، کە دژی دوژمنی هەشت ساڵەی ئێران بەرپا دەکرا. ئەم راپەرینە کەمتر لە مانگێکی خایاندو سوپای عێراق لە٢٩–٣٠مارتی١٩٩١ زۆربەتوندی دەستی بە سەرکوتکردنی راپەرینەکە کرد. لەبەرامبەردا تێکڕایی جەماوەری کوردستان لە ترسی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی‌و پرۆسەی ئەنفالێکی نویٚ لە کۆچڕەوێکی بەرفراواندا، ئاوارەی سنورەکانی تورکیاو ئێران بوون[١].

ئێران لە ٤ی ئەپریلی١٩٩١دا یاداشتێکی بۆ ئەنجومەنی ئاسایش رەوانە کردو تیایدا داوای هەنگاوی خێرای کردبوو، کە بەرامبەر بەغداد بگیرێتە بەر، بەمەبەستی راوەستانی

[1]Human Rights Watch :The 1991 uprising in Iraq.

شەپۆلی کۆرەو، چونکە ئەو ژمارە زۆرە (بەرای ئێران) کاریگەری بۆ سەر ئاسایش‌و ئارامی ناوچەکە دەبێت. لەو نامەیدا ئێران باسی رەوشی نالەباری کوردی عێراقی کردبوو، کە زیاتر لە (٥٠٠) هەزار ئاوارە لەسەر سنورەکانن‌و لەترسی سوپای عێراقی هەڵهاتووون، ئەم دەوڵەتە لەگەڵ ئەوەی، کە سنووری بۆ کردونەتەوە، بەلاّم ئەو ژمارە زۆرەی سەرەوە، کێشەی ئابووری‌و کۆمەلاّیەتی بۆ ئێران دروستدەکەن[1].

لە ئەنجامی یاداشتی ئێران‌و تورکیاو فەرەنسا، بە هاریکای بریتانیاو ئەمریکا، بریاری (٦٨٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش دەرچوو، کە بۆ یەکەم جار لەو ئەنجومەنەوە بە روون‌و ئاشکرایی باسی ئەوە کرابوو کە (سەرکوتکردنی مرۆڤ)و (جوڵەی ئاوارە)کانی کورد بەرەو رووی سنورە نێودەوڵەتیەکان، (دەبێتە هۆی هەرەشە بۆ سەر ئاسایش‌و ئارامی) نیودەوڵەتی[2].

سنوری ئێران بەرووی زیاتر (١.٥) ملیۆن ئاوارەی کورد لەساڵی (١٩٩١) ئاوەلاّکرا[3]، ئەم هەڵوێستەی ئێران مەدح‌و وەسفی کوردی هەرێمی کوردستانی بەدەست هێنا. کاربەدەستان‌و پیاوانی ئاینی، داوایان لە خەڵکی ئێران کرد کە داڵدەی ئاوارەکان بدەن، ئەوە بوو پارێزگاکانی سنەو ئازەربێجانی رۆژئاواو کرماشان، دەرگای ماڵ‌و قوتابخانەو مزگەوتەکانیان بەرویاندا کردەوە. ئەم هەڵوێستە مرۆییە ئێرانی توشی قەیرانی دابینکاری پێداویستی‌و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرە لە ئاوارە کرد. بۆ نموونە شاری پیران شەهر کە پێشتر ژمارەی دانیشتوانەکەی تەنها (٢٥) هەزار کەس بوو لە کاتی ئاوارەییەکەدا گەیشتە (١٢٥) هەزار کەس. ئەم ژمارە زۆرە وایکرد، کە ئێران کۆنترۆڵی دابین کردنی خۆراک‌و تەندروستی بۆ ئاوارەکان لەدەست بدات، ئەوە بوو داوای یارمەتی دەرەکی کرد. بەلاّم وەلاّمدانەوەی کۆمەڵی نێودەوڵەتی بۆ کێشەی ئاوارەکان لە ئێراندا هێواش بوو بە

---

[1] بروانە دەقی نامەی نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەنجومەنی ئاسایش. پاشکۆی ژمارە

[2] جیانگیر کرمی: گزارشی از تحولات شمال عراق در دهة ١٩٩٠ ( ٧٦-١٣٦٩)، مجلە سیاست دفاعی، شمارە ٢١-٢٠، ص١٩٧

[3] Human rights watch :The 1991 uprising in Iraq.

بەراورد لەگەڵ تورکیادا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەنارگیرییەی، کە ئێران لە ناوەندی نێودەوڵەتیدا توشی هاتبوو. قوربانیی ئەو کەنارگیریەش بەرۆکی ئاوارەکانی کوردی گرت. هەرچۆنێك بێت ئەم داوایە لە لایەن ئەمریکا وەلام درایەوەو بۆ یەکەمجار لە دوای شۆڕشی ئیسلامی فرۆکەیەکی رەوانەی فرۆکەخانی میهراباد لە تاران کرد کە بری یارمەتیەکەی بە (١٤٥) هەزرار پاوەند خەملێنرا بوو. لە لایەکی تر ئێران بۆ یەکەم جار رێگای بە هێزێکی سەربازی بێگانەی وەك هێزی ئەلمانیادا، کە ئۆردوگا بۆ ئاوارەکان دروستبکەن‌و پێداویستیەکانی حەوانەوە بگوازنەوە. وێڕای ئەوەی کە کۆمەککەرانی ئەوروپا بری ئەو یارمەتییەی کە بەخشییان بە ئێران بە (٢٥٠) ملیۆن دۆلار خەملاند، کە خێمەو بەتانی‌و خۆراکی دەگرتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بە وتەی بەرپرسە ئێرانییەکان هەر ڕۆژێك (١٠)ملیۆن دۆلاری لەبوجەی دەوڵەت بۆ ئاوارەکان سەرف کراوە. بەلام هێشتا رێژەی سەرفکردن لە نێوان کوردە ئاوارەیەکی ئێرانی‌و کوردە ئاوارەیەکی تورکیدا (١-٧,٦٥) دۆلار بوو[1].

قۆناغی دووەم: دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان(١٩٩٢-١٩٩٤)

لەبەر ڕۆشنایی بڕیاری (٦٨٨)، لەلایەن ئەمریکاوە (ناوچەی دژەفڕین-No-fly zoon) چووە باری جێبەجێکردن، کە لە (بنکەی ئەنجەرلیك)ی تورکیاوە، فرۆکە ئەمریکیەکان ناوچەکەیان لە فڕۆکە عێراقیەکان گرت. کورد لە ئەپریلی ١٩٩٢توانی لە ژێر سایەی ناوچەی دژە فڕیندا هەڵبژاردن ساز بکات‌و پەرلەمان‌و حکومەت پێکبهێنێت.

هەڵوێستی ئێران لەم رووداوانەدا ئەرێنی نەبوو. تاران نیگەرانی خۆی لە بونی هاوپەیمانان لە هەرێمی کوردستان دەربری. وەزیری دەرەوەی ئێران علی اکبر ولایەتی[2]،

---

[1] نادر ئینتسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کورد، وەرگێرانی: عەتا قەرەداغی،چاپخانەی تیشك،سلێمانی، ٢٠٠٤. ل٣٣٢-٣٣٣.

[2] عەلی ئەکبەر ولایەتی: لە ساڵی ١٩٤٦ لە تاران لەدایك بووە. هەڵگری بروانامەی دکتۆرایە لە زانکۆی جون هوبکنز لە بواری پزیشکیدا. لە ساڵی (١٩٨٢-١٩٩٧) وەزیری دەرەوە بووە. لە دوای ئەوە بووە بە راوێژکاری رابەری کۆمار بۆ کاروباری سیاسەتی دەرەوە. http://digital.ahram.org.eg/

لە سەروبەندی دامەزراندنی دەسەلاتی هەرێمی کوردستاندا رایگەیاند کە "ئەوەی لە باکوری عێراق هەیە کێشەیەو کێشەکەش لەوێدا دەستی پێکرد کە سوپای عێراقی لە باکوردا نەمان"[1]. بەلام دوای ئەوەی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان بوو بە دی فاکتۆ، لێرە بەدواوە گرنگترین ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران بەرامبەر ئەم هەرێمە بریتی بوو، لە پارێزگاریکردن لە سنورەکانی نێوانیان. رێگری کردن لە چالاکی بەرهەڵستکارە کوردە ئێرانیەکانی کە نیشتەجێی هەرێمی کوردستانن. پەیوەندی بەستن لەگەڵ پارتە کوردیەکانی هەرێمی کوردستان. ئاگاداربوون لە گۆرانکارییەکانی ناوچەکە، نیگەران بوون لە هەژمونی ئەمریکی‌و تورکی لە هەرێمەکەدا. هاریکاریکردن لەگەڵ سوریاو تورکیا بە مەبەستی یەك هەڵوێستی بە رامبەر هەرێمی کوردستان[2]. بەرای توێژەری تورك بیرام شینکایا، ئێران ترسەکەی لە هەرێمی کوردستان لەوە بوو، کە هێزی چەکوشی ئامادە ببێتە هێزێکی هەرەشە بۆ سوپای ئێرانی لە باکووری رۆژئاواوە. لە لایەکی تر ئێران نیگەران بوو لە هاریکاری کوردو تورکیا لە هەرێمی کوردستان، هەروەها لە لەشکرکێشیەکانی تورکیا لە هەرێمەکەدا. مەترسیەکی تری ئێران ئەوە بوو، کە تورکیا لە رێگای تورکمانەکانەوە مەلەفی نەوتی پارێزگاکانی کەرکوك‌و موسڵ بەدەستەوە بگرێت‌و بالانسی هێز لە ناوچەکەدا بە قازانجی خۆی پارسەنگ بکات. کورد لە ترسی ئێرانیەکان تێگەیشتن‌و بۆ رەوینەوەی ئەو ترسە لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٣دا لە پەرلەمانەکەیانەوە پەیامێکیان گەیاندە ئێران، کە هەرێم هەرەشە نییە بۆ سەر کەس. دوای ئەم پەیامە، شاندێکی سەربازی‌و سیاسی لە ئێرانەوە سەردانی هەرێمی کوردستانیان کردو دەسەلاتدارانی هەرێم بەلێنیان بە ئێراندا، کە رێگری لە چالاکییە چەکداریەکانی (ح.د.ك.ا)[3] بگرن، کە هێرش نەکەنە سەر ئێران‌و لەسنورەکانی

---

[1] صلاح برواری: جلال طالبانی مواقف واراء: مكتب الفكر والوعي، سليمانية، ٢٠١٠ ، ل٣٤٠- ٣٤١

[2] حسين دهشيارو ديگران: مسائل ايرانو عراق،ص٩٥

[3] ئەم پارتە لە ١٦ی ئۆگستۆسی ١٩٤٥ لە شاری مهاباد دامەزراوە. لە دوای رووخانی کۆماری کوردستان لە مهاباد لە ساڵی ١٩٤٦، لە دۆخی متبوندا بووەو پاشانیش لەژێر کۆنترۆڵی (پ.د.ك) عێراقدا بووە. بەلام لە کۆنگرەی سێیەمی ئەو پارتە لە سێپتێمبەری ١٩٧٣ وەك تاکە رێکخراوی رۆژهەلاتی

ئێران دوریان بخەنەوە، لە بەرامبەردا ئێران نوسینگەی تایبەتی بۆ پارتەکانی هەرێمی کوردستان، لە تاران و شارە کوردییەکان دەکاتەوە[1].

پەیوەندییە راستەوخۆکانی ئێران لەگەڵ هەرێمی کوردستان لە رێگای قەرارگا[2]ی رەمەزانەوە بوو. ئەم قەرارگایە دامەزراوەیەکی سەربازی سەر بە سوپای پاسداران بوو، کە لە جەنگی هەشت ساڵەدا پێکهاتبوو بۆ هاریکاریکردن و سودوەرگرتن لە پارتە کوردییەکانی باشوری کوردستان لە دژی سوپای عێراقی[3]. ئێران لە رێگای قەرارگاکانەوە هاتە ناو کوردستان. یەکەمین قەرارگای دامەزراند بە ناوی (قەرارگای دییانە). یان نوێنەرایەتی حکومەتی ئێران لە هەرێمی کوردستان. پاشان ئەم قەرارگایە لە دوای هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢، چووە هەولێر بە ناوی(نوسینگەی ئەربیل بۆ پەیوەندیەکانی ئێران) کرایەوە. دواتر لە

---

کوردستان لە دژی ئێران چالاکییەکانی دەسپێکردۆتەوە. لە شۆرشی گەلانی ئێران، لە ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان-کۆمەڵە، هەشت تا بیست شارۆچکەیان بەدەستەوە بوو، بەلام بەهۆی رەتکردنەوی داواکارییەکانیان لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران، جەنگی نێوان بزوتنەوەی کوردی و دەوڵەت سەری هەڵدا. بارەگای سەرەکی ئەم پارتە لە دوای دەسپێکردنی یەکەمین جەنگی کەنداوەوە لە هەرێمی کوردستانە. عبد الرحمن قاسملو: کردستان ایران، ت: غزال یشیل ئۆغلو، دار الشموس للدراسات والنشر، دمشق، ١٩٩٩، ص٨٧-٩١.

[1] BAYRAM SINKAYA: CONFLICT AND COOPERATION IN TURKEY-IRAN RELATIONS, 1989-2001, MASTER OF SCIENCEINTHE DEPARTMENT OF INTERNATIONAL RELATIONSJANUARY 2004.pp٧٢-٧١..

[2] قەرارگا لە میانی یەکەمین جەنگی کەنداو دامەزرا لە لایەن سوپای پاسدارانی ئێران کە شێوەیەکی نارێکخراوی لە جەنگدا بەکار دەهێنا. لە سەرەتادا چوار قەرارگا بوو بە ناوی قەرارگاکانی، کەربەلا، نەسر، فەتح، قدس. دواتر قەرارگا رەمەزان لە ساڵی ١٩٨٢ پێکهات. عملیات فتح المبین. پژوهشگاه علوم و معارف دفاع مقدس http://www.dsrc.ir

[3] سعید محمد پور: تاثیر عملیتهای نامنظم قرارگاه رمضان در جنگ تحمیلی، فصلنامه سیاست دفاعی، سال دوازدهم، شماره ٤٧، ١٣٨٣، ص٩٧.

سلێمانی‌و دهۆك‌و هاوینە هەواری سەلاحەدین‌و دەربەندیخان، نوسینگەی تریان کردەوە، ئامانجی ئەم نوسینگانە بریتی بوو لە:

1. رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان پارتە کوردیەکان‌و ئێران
2. چرکردنەوەی چالاکییەکان‌و لە دژی بەرهەڵسکارای ئێرانی
3. کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر بارودۆخی ناوخۆی عێراق
4. کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر رێکخراوە نا حکومیەکان‌و رێکخراوە بیانیەکان‌و چالاکی دەوڵەتانی رۆژئاوا لە هەرێمدا
5. یارمەتیدانی مرۆیی بە مەبەستی بەدەستهێنانی رای جەماوەری هەرێم[1].

هەرێمی کوردستان و ئێران تا ئەم قۆناغە پەیوەندییەکی بەهێزیان لە نێواندا نەبوو ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ چەند لایەنێك. یەکەمیان: هەرێمەکە لە رێگای هاوپەیمانانەوە دەپارێزرا، ئێران بەهۆی هەڵوێستی بێلایەنی لە دووەمین جەنگی کەنداودا، لەناو هێزی هاوپەیمانەکاندا بۆ پاراستنی هەرێمەکە بەشداری پێنەکرا. ئەمە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی ئێران جێگای بایەخی دەسەلاتدارانی هەرێم نەبوو. دووەم: بۆ هەرێمی کوردستان تورکیا گرنگتر بوو وەك لە ئێران، چونکە دەروازەی هەرێمەکە بەرووی دەرەوەدا لە رێگای تورکیاوە بوو، هاوکات تورکیا نزیك بوو لە رۆژئاواوە چ لەرووی جوگرافی‌و چ لەرووی سیاسی[2]، بۆیە پێگەی ئێران بۆ هەرێمی کوردستان بەلای دەسەلاتدارانی هەرێمەوە ستراتیجی نەبوو. سێیەمین: لە سەرەتای نەوەدەکاندا ئێران‌و رۆژئاوا پەیوەندییەکانیان باش نەبوو ئەمە وایکردبوو هەموو جۆرە پەیوەندییەکی ئێران‌و هەرێمی کوردستان، جێگای دەستخۆشی رۆژئاوا نەبوو. هەموو ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی کە ئێران لە لایەن هەرێمی کوردستانەوە گرنگی پێنەدرێت، لە بەرامبەردا ئێران خۆشی لەم هەڵوێستەی هەرێم نەدەهات، بۆیە فشاری خستە سەر هەرێمەکە، سەرەتا بە تۆپباران کردنی هەرێمی کوردستان بە ناوی راوەدونانی بەرهەڵستکارانی ئێرانی دەستی پێکرد. دواتر لە شەری نێوان (ب.ئ.ك)و (ی.ن.ك) لە ساڵی

---

[1] بروانە پاشکۆی ژمارە (٨).

[2] هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان‌و تورکیا، ل١٦

١٩٩٣، بەتەواوی پشگیری (ب.ئ.ك)ی کرد. ئینجا بەتەوای بەشداری شەری ناوخۆی نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)ی کرد لە ساڵی (١٩٩٤–١٩٩٨).

پەیوەندییەکانی نێوان (ب.ئ.ك)و ئێران دەگەرێتەوە بۆ ساڵانی هەشتاکان، ئەم پەیوەندیە سەرەتا لە ژێر کاریگەریی سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی لە ئێران دەستپێدەکات، کاتێك، کە توانی رژێمی شاهانەی عەلمانی بروخێنێتو لە جێگەیدا رژێمێکی ئیسلامی دامەزرێنێت. ئەم رووداوە بوو بە یەکێك لە هۆکاری چالاکبونی رەوتی ئسلامی لە کوردستان بەگشتیو (ب.ئ.ك) بە تایبەتی، لەم بارەیەوە جێگری رابەری (ب.ئ.ك) مەلا عەلی عەبدول عەزیز، بە ئێرانیەکانی وتبوو " تا شۆرشی ئیسلامی سەریهەڵنەدا ئێمە نەمانتوانی شۆرش بکەین "[1]. ئێران دواتر کاریگەریی راستەوخۆی کردە سەر رەوتە ئیسلامییەکانی عێراق بەوەی کە (ئ.ب.ش.ئ.ع) ی دامەزراند، کە یەکێك لە بەرپرسە بالاکانی کەسایەتییەکی کورد بوو بەناوی شیخ محەمەد نجیب بەرزنجی. دوای بەهێزبونی رەوتی ئیسلامی لە کوردستان، (ب.ئ.ك) وەك پارتێکی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٨٧ دروست بوو ، ئەم پارتە لە لایەن ئێرانەوە پشتگیری کرا، رێگاشی پێدرا، کە نوسینگە لە شارە سنورییەکانی ئێران وەك کرماشان، سنە، سەردەشت، پیرانشار، پاوە، مەریوان بکەنەوە، جگە لە تاران کە نوسنگەیەکیشیان لەوێ هەبوو. سەرباری ئەمە ئێران بوو بە رێرەوەی پەیوەندیەکانی (ب.ئ.ك) بەرووی جیهانی ئیسلامیدا[2].

لە دوای راپەرین ئێران هەمیشە دەیویست خۆی لە (ب.ئ.ك)نزیك بکاتەوە، بەڵام لەم کاتەدا (ب.ئ.ك) پێویستی بە ئێران نەبوو، چونکە یارمەتی ماددی لە سعودییەوە وەردەگرت[3]. بەڵام رووی (ب.ئ.ك)کاتێك بەرەو ئێران وەرچەرخا، کە لەگەڵ (ی.ن.ك) لە ساڵی ١٩٩٣ کەوتە شەرەوە، ئەمە وایکرد کە (ب.ئ.ك)پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئێران بەتین

---

[1] وثائق الادانة: اصدرها مكتب دمشق للاتحاد الوطني الكوردستاني: ١٩٩٤، وثيقة رقم: (٥١)

[2] محمد سيد نوري البازياني: مستقبل الحركة الاسلامية في كوردستان العراق، مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٦، ص ١١٦–١١٧، وثائق الادانة: وثيقة رقم: (٦٦)

[3] محمد سيد نوري البازياني: المصدر السابق، ص ١١٧–١١٨

بکات. هۆکاری ئەم نزیك کەوتنەوە بە پلەی یەکەم هۆکاری جوگرافی بوو، چونکە پێگەی هێزو سەنگی (ب.ئ.ك) لە کوردستاندا کەوتبووە ناوچە سنورییەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئێراندا، بە پلەی دووەم بەتینبوونی پەیوەندیەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، دوای ئەوەی (ب.ئ.ك)کەوتە شەڕەوەو لە بەرامبەر (ی.ن.ك) شکستی هێناو زۆرینەی پێشمەرگەکانی چونە ناو خاکی ئێران، لێرەوە باشبونی پەیوەندیکردن لە گەڵ ئێران بوو بە پێویستیەکی گرنگ، چونکە ئێران هەم پەناگایەك بوو بۆ هێزەکانیان، هەم سروشتی شەر ئەوەی بەسەر (ب. ئ. ك)دا سەپاند کە بۆ بەردەوامبوون لەو شەرە پێویستی بە پشتگیری لۆجستی سەربازی ئێران هەیە.

دوای زنجیرەیەك کۆبونەوە، (ب.ئ.ك) گرنگی خۆی بۆ ئێران لە هەرێمی کوردستاندا دەخاتە بەرچاوو پێیان دەڵێن، کە ئەمان دەتوانن بە هاریکاری ئێران، پلانی رۆژئاواو هەوادارەکانیان {مەبەستی هێزە عەلمانیەکانی هەرێمی کوردستانە}، پوچەڵبکەنەوەو سنورەکانی ئێران بپارێزنو رێگە لە بەرهەڵسکارانی وەك (ر.م.خ) بگرن کە لە سنورەوە ئاودیوی ئێران، ئەمان دەتوانن لە رێگای ئێرانەوە کار بکەن بۆ بانگەوازی ئیسلامی نەك لە کوردستان، بەڵکو لە عێراق بە گشتی. لە وەڵامدا ئێرانیەکان بە راشکاوی نیگەرانی خۆیان لە پچڕانی پەیوەندیەکانی نێوانیان دەردەبرنو بە ئاشکرا پێیان دەڵێن کە یارمەتیدان دەبێت دوو لایەنە بێت[1].

گرنگترین داواکارییەکانی (ب.ئ.ك) لە ئێران بریتی بوو لەوەی (ب.ئ.ك) لە بریاردان سەربەخۆ بیت، بوجەیەکی ساڵانەی هەبێت، کە لەگەڵ قەبارەی پارتەکەدا بگونجێت، ئازاد بێت لە پەیوەندیکردن بە جیهانی دەرەکی، یارمەتیدانی راگەیاندنو سەربازی بکرێت. لە بەرامبەردا گرنگترین داواکارییەکانی ئێران بریتی بوو لە: بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولا بۆ بەرزراگرتنی ئیسلام لە دژی خاچپەرستو زایۆنیزمە جیهانیەکان،

---

[1] وثائق الادانة: وثيقة رقم: (٥١)

پاریزگاریکردن لـە سنورەکان، ئـاڵوگۆرکردنی زانیـاری، بـەهێزکردنی (ب.ئ.ك) لـە مەیـدانی سیاسی کوردستاندا[1].

ئێران زانیـاریی تـەواوی لـە خـودی (ب.ئ.ك) وەرگـرت لەسـەر ژمـارەی چـەکدارو جـۆرو ژمـارەی چـەکەکانیان‌و بنکـەو بارەگایـان لـە هـەرێمی کوردسـتاندا. لـە جـەنگی ناوخۆشـدا پشگیری تەواوی لێکـردن، بـۆ نموونـە لـە یارمەتیەکـدا (٤٥٠) هـەزار فیشـەك‌و (٢٠٠) فـەردە ئاردیان لە ئێران وەرگرتووە[2]. ئێران لـە جـەنگی نێـوان (ب.ئ.ك)و (ی.ن.ك)، گـەورەترین قازانجی کرد، چونکە پـێش شـەڕەکە بـەردەوام ئێـران ئامـادەیی خـۆی بـۆ نزیکبونـەوە لـە (ب.ئ.ك) دەردەبری، بۆ ئەوەی وەکو ژمارەی خۆی لە ناوچەکەدا جوڵەی پێبکات[3]، بەڵام بەم شەڕە ئێران بە ناوی پاراستنی بەرژەوەندی کاری ئیسلامی توانی لە لایەك خـۆی بکاتـە برا گەورەی (ب.ئ.ك)، یەکێك لە سەرکردە ئێرانییەکان پێی وتبوون کە: "پێگـەی ئێـوە زۆر گرنگە بۆیە لێرە بەدواوە دەبێـت پەیوەنـدیمان بـە تیـنتر بێـت"[4]، جگـە لەمـە ئـەم شـەڕە وایکرد، کە ئێران لە پەراوێزی ڕووداوەکـانی هـەرێمی کوردسـتانەوە خـۆی بخاتـە نـاوەڕۆکی ڕووداوەکـان، لـە کۆبونەوەیەکـدا وەك ڕەخنەیـەك لـە پەراوێزخسـتنیان، باسـی ئـەوەیان بـۆ شاندی (ب.ئ.ك) کردبووکە لە بارودۆخی نـاوخۆی هـەرێمی کوردسـتان نـارازین‌و دەبێـت بـە پلانێکی تۆکمەوە هاریکاری یەکتر بکەن[5]. هەروەها لەم کەناڵەوە تـوانی فشـارێکی گـەورە بخاتە سەر ڕەوت‌و هێـزە عەلمانیـەکان لـە هـەرێمی کوردسـتان، هاوکـات (ب.ئ.ك)ی کـردە بـەردەبازێك بـۆ ڕکەبـەریکردنی پـرۆژەی هاوپـەیمانان لـە هـەرێمی کوردسـتان، وەك خۆیـان

---

[1] وثائق الادانة: وثيقة رقم: (٥٣،٥٦)

[2] وثائق الادانة: وثيقة رقم: (٤١)

[3] سەلام عەبدولکەریم: گوتاری ئیسلامی‌و گرفتی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی. خانەی ڕەهەند، ٢٠٠٩، ل ٢٧-٢٧٥

[4] وثائق الادانة: وثيقة رقم: (٥١)

[5] هەمان بەڵگەنامەی پێشوو

وتەنی:"بەرنامەی دەوڵەتانی تر لە کوردستان بۆ یەکخستنی هێزە عەلمانییەکانە لە دژی ئیسلام"[1].

قۆناغی سێیەم: جەنگی ناوخۆ(١٩٩٤-١٩٩٨)

پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو ئێران لە دوو قۆناغی پێشودا بەتین نەبوو، چونکە هەرێمەکە پێویستی بە پشتگیری ئابووریو سیاسی ئێران نەبوو. لە لایەک ئێران مامەڵەی لەگەڵ نەدەکرد چونکە گومانی لەو هەرێمەو لە هێزی هاوپەیمانەکان هەبوو، لە لایەکی تر هەرێمی کوردستان پشتی بە سنوری تورکیا دەبەست بۆ پەیوەندیکردن بە جیهانی دەروە بە گشتیو ئەوروپاو ئەمریکا بە تایبەتی. بەڵام دوابەدوای سەرهەڵدانی جەنگی ناوخۆ، ئێران سەنگی خۆی بە تەواوی خستە ناو هەرێمەکە، سەرەتا سەنتەرێکی پێکهێنا بە ناوی (سەنتەری نەسر)، کە تایبەت بوو بە کاروباری بەرهەڵستکارانی عێراق بە گشتیو بەرهەڵستکارانی کورد بە تایبەتی. ئەم سەنتەرە ئامانج لە دروستبوونی گرتنە بەری یەك سیاسەتە بەرامبەر هەرێمی کوردستان، چونکە وەك سەرکردەی هێزە دەریاییەکانی ئێران، عەلی شمەخانی ئاماژەی پێدەدا، سیاسەتی دەرەوەی ئێران بەرامبەر عێراق بەگشتی {هەرێمی کوردستان وەك بەشێك لە عێراق} دەینالاند بەدەست فرە بڕیاریو جیاوازیی هەڵوێستی بەرپرسە ئێرانیەکان لەم بوارەدا[2]. هەر ئەو راستییە لە توێژینەوەیەکی چەند پسپۆرێکی ئێرانیدا دووپات کراوەتەوە کە لە ئێراندا هەماهەنگی لەنێوان دەسەڵاتی جێبەجێکردنو دەسەڵاتەکانی تر نیە، جگە لەمە چەندین سەرچاوەی بڕیاردانی جیاواز هەیە[3]. هاوکات سکرتێری گشتی (پ.س.د.ك) محەمەد حاجی مەحمود، لە یاداشتەکانیدا ئەو راستیە دەخاتە روو، کە لە نێوان ئیتلاعاتی ئێرانیو دەزگای قەرارگادا ململانێ هەبووەو

---

[1] هەمان بەڵگەنامەی پێشوو

[2] امیر دریابان علی شمخانی:همان منبع قبل، ص١٦.

[3] علی ئەسغەر کازمیو علی مهدی زادە ئەشرەفی: ستراکتوری سیاسی ئێرانو سیستەمی پەیوەندی وولات، وەرگێرانی: ئازاد رەشید، دۆسیەی ئێران، ژمارە (٢).

ئەمان لەبەر ئەوەی بە بێ ئاگاداری قەرارگا پەیوەندیان بە نوێنەرانی وەزارەتی ئیتلاعات کردووە، بۆیە نوێنەریان لە ئێران بۆ ماوەیەك دەرکراوە[1].

لە سەنتەری (نەسر)، نوێنەری هەموو ئەو لایەنانەی تیادا بوو، کە کاریگەریان لەسەر دروستکردنی بریاری سیاسەتی دەرەوەی ئێرانیدا هەبوو. بە واتایەکی تر لەم سەنتەرەدا نوێنەری سوپای پاسداران‌و وەزارەتی ئیتلاعات‌و وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی دارایی‌و ئابوری تیادا بوو، کە هەموویان لە لایەن نوێنەری رابەری کۆماری ئیسلامی سەرپەرشتی دەکران[2]. هەر لە ڕێگای ئەم سەنتەرەوە ئێران سەرپەرشتی گفتووگۆی ئاشتی نێوان لایەنە شەرکەرەکانی دەکردو توانی (ی.ن.ك)و (ب. ئ. ك) بگەیەنێتە ریکەوتنێکی ئاشتبونەوە لە ساڵی ١٩٩٧، (پ.د.ك)و (ح. س.د.ك)ی ئاشتکردەوە، سەرپەرشتی سێ خولی گفتوگۆی نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)ی کردو بۆ یەکەمجار لەسەر دەستی دەوڵەتێکی هەرێمی توانیان نوسراوێکی لەیەککەیشتن واژۆ بکەن.

لە جەنگی ناوخۆدا ئێران هەڵوێستێکی بێلایەنی نەبوو لەگەڵ لایەنە شەرکەرەکان، بەڵام لایەنگری هەمیشەیی لایەنێکیش نەبوو، لە سەرەتای جەنگەکە لایەنگری (پ.د.ك)و (ب.ئ.ك)ی دەکرد دژی (ی.ن.ك). دەتوانین هاریکاری نێوان ئێران‌و (پ.د.ك) بۆ دوو هۆکار بگەڕێننەوە، کە ئەویش هۆکاری مێژووییە لەگەڵ هۆکاری تاکتیکی.

مەبەستمان لە هۆکاری مێژوویی ئەوەیە، کە ئێران‌و (پ.د.ك) مێژوویەکی تایبەتیان بۆ خۆیان تۆمار کردبوو. سەرەتاکانی ئەو مێژووە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی، کە شۆرشی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥ شکستی هێنا، بەشێکی زۆر لە هێزەکانی (پ.د.ك) لەگەڵ خێزانەکانیان ئاوارەی ئێران بوون، کە نزیکەی (٢٥) هەزار ئاوارە دەبوون. لەگەڵ سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی ئێران لە ١٩٧٩، پارتەکە بۆ ئەوەی دووبارە لە ئێرانەوە خۆی رێکبخاتەوەو دەستبکاتەوە بە چالاکی لە هەرێمی کوردستاندا، خۆی کرد بە بە هاوپەیمانی

---

[1] محەمەد حاجی محمود: رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك(١٩٧٦-١٩٩٦)، بەرگی چوارەم، چاپخانەی دیلان، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٤١٦

[2] بروانە پاشکۆی ژمارە (٨).

ئێران تا ئەو دەوڵەتە رێگا لە چالاکیەکانی نەگرێت‌و هاوکات یارمەتیشی بدات [1]. لە لایەکی تر (پ.د.ک) یارمەتی گەوری پێشکەشی ئێران کرد بۆ سەندنەوەی شارە کوردیەکان لە بن دەستی پارتە بەرهەڵستکارە کوردیە ئێرانییەکان لە ساڵی ١٩٨٠دا [2]، ئەمە وایکرد بە درێژایی ساڵانی هەشتاکان پردێکی متمانە لە نێوان ئێران‌و ئەو پارتەدا دروست بێت. لە ساڵی ١٩٨٣دا (پ.د.ک) و ئێران لە چالاکیەکی هاوبەشدا هێرشیان کردە سەر شارۆچکەی حاجی ئۆمەران، لەدوای ئەمە ئێران رۆڵێکی گرنگی بینی لە ئاشتکردنەوەی (پ.د.ک) لەگەڵ (ی.ن.ک). هەموو ئەوانە بوونە بناغەیەکی بەتین بۆ پەیوەندیەکانی نێوانیان، کە دەتوانین بڵێین هەردوولا لەدوای دامەزراندنی دەسەلاَت لە هەرێمی کوردستان کاریان لەسەر دەکرد. ئەوەی ئەم پەیوەندیانەی زۆرتر بەهێز کردبوو، ئەوە بوو، کە ئێران لەو کاتەدا نێوانی لەگەڵ (ی.ن.ک) ئاڵۆز بوو، بۆیە تاکە کەناڵێکی گرنگ کە ئێران لە هەرێمی کوردستاندا کاری لەسەر دەکرد لە ماوەی نێوان (١٩٩١–١٩٩٤)، کەناڵی (پ.د.ک) بوو. بۆ نموونە تاڵەبانی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەی (الحیاە) لە ١١ی یەنایری ١٩٩٢دەڵێت: "لە ئێستادا لەرێگای (پ.د.ک) پەیوەندیمان بە ئێرانەوە کردووە" [3].

ئەم پەیوەندیانەی هەرێمی کوردستان لەگەڵ (پ.د.ک) بەتینتر بوو لە نیوەی یەکەمی جەنگی ناوخۆدا لە ساڵانی (١٩٩٤–١٩٩٦). لە پارێزگای سلێمانی هێزو بارەگاکانی (پ.د.ک)، بە مەبەستی خۆلادان لە شەری ناو شار، رۆشتنە قەزای هەڵەبجە. لێرەدا جارێکی تر جوگرافیا دەبێتەوە بنەمای پەیوەندییەکان، چونکە ئێران بوو بە پردی پەیوەندی لە نێوان هەڵەبجەو سەرکردایەتی (پ.د.ک) لە هاوینە هەواری سەلاحەدین. بە واتایەکی تر شارۆچکەی هەڵەبجە هیچ سنورێکی جوگرافی لەگەڵ سەرکردایەتی (پ.د.ک) نەبوو چونکە جوگرافیای دەسەلاَتی (ی.ن.ک) لە نێوان هەڵەبجەو هاوینەهەواری سەلاحەدیندا بوو، ئەمە وایکرد (پ.د.ک) لەگەڵ ئێراندا رێکبکەوێت. ئەم رێکەوتنە چەند لایەنێکی دەگرتەوە ئەویش

---

[1] حامد محمود عیسی: المصدر السابق، ص٤٢٠

[2] بۆ زانیاری زیاتر بروانە هەمان سەرچاوە، ل ل٤٢٨–٤٣٥

[3] صلاح بروارى: جلال طالبانی مواقف واراء، ص ص٣٤٠–٣٤١

بریتی بوو لە بەکارهێنانی خاکی ئێران بۆ پەیوەندی لە نێوان هەڵەبجەو سەرکردایەتی. ئەم پەیوەندییە بریتی بوو لە هاتووچۆی ئەندامە باڵاکان، موچەی هێزو بارەگان، دواجار کاری پۆستە لە نێوان هەڵەبجەو هاوینەهەواری سەلاحەدیندا لەو رێگایەوە بوو کە وێستگەکانی بریتی بوو لە هەڵەبجە–مەریوان–ورمێ–حاجی ئۆمەران–هاوینە هەواری سەلاحەدین. لە لایەکی تر خاکی ئێران بۆ گواستنەوەی هێزو پەلاماردانی (ی.ن.ك) لە پشتەوە بەکاردەهات ، واتە هێزەکانیان لە هەڵەبجەوە دەچوونە مەریوان، لەوێوە دەچونە پێنجوێن، بە پێچەوانەشەوە. وێرای ئەمە ئێران هەروەك چۆن یارمەتی (ب.ئ.ك)ی ئەدا بەهەمان شێوە لە جەنگی ناوخۆدا، لەروی لۆجستییەوە یارمەتی (پ.د.ك)ی ئەدا[1].

پەیوەندییەکانی نێوان ئێران‌و (پ.د.ك) بەردەوام بوو تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٦، لێرە بەدواوە پەیوەندیەکان ئاڵۆزی تێکەوت ئەمەش لە ئەنجامی رووداوەکانی جەنگی ناوخۆدا بوو، کە شارۆچکەی هەڵەبجەو دەوروبەری لەژێر دەستی (پ.د.ك) دەرچوو لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٦دا، چیتر وەك جوگرافیای شەر، (پ.د.ك) پێویستی بە ئێران نەبوو. هەروەها ئێرانیش بە تەواوەتی بوو بە هاوپەیمانی (ی.ن.ك)، ئەویش لە کوردستاندا پێویستی بە (پ.د.ك) نەمابوو، ئەمە وایکرد، کە هەردوولا لەیەکتر دور بکەونەوە. باری پەیوەندییەکان هەر بەو شێوەیە نەمایەوە، یەکێك لە هۆکارەکانی تر بریتی بوو لەوەی، کە (پ.د.ك) بە تەواوی چووە ناو چوارچێوەی سیاسەتی تورکیا لە ناوچەکەدا، ئەمە وایکرد بەرژەوەندییەکانی ئێران لەگەڵ سیاسەتی (پ.د.ك) لە ناوچەکەدا پیچەوانەی یەکتر بووەستن، کە ئەمە دەسگیرکردنی کۆمەڵێك لە ئەندام‌و بەرپرسی نوسینگەکانی (پ.د.ك) ی لە ئێران لێکەوتەوە. ئێران ئەو کەسانەی بەوە تۆمەتبار کرد، کە سیخوری بۆ تورکیاو ئسرائیل دەکەن، یەکێك لە دەسگیر کراوەکانیش لەناو بەندیخانەدا گیانی لەدەستدا[2].

دەتوانین بڵێین، کە پەیوەندییەکانی نێوان ئێران‌و (پ.د.ك) لە شەری ناوخۆدا هێندەی تەکتیکی بووە هێندە ستراتیجی نەبووە، چونکە ئامانجی ئێران لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ

---

[1] محەمەد حاجی محمود: رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك، ل ل٣٦١، ٤١٣

[2] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد(٨٧٤) ١٩٩٨/٣/١٨

(پ.د.ك) بریتی بووە لە فشار دروستکردن لە سەر (ی.ن.ك)، بەمەبەستی ئەوەی ئەم پارتەی دوایی بخاتە سەر هێڵی سیاسەتی خۆی لە ناوچەکەدا، هاوکات ئامانجی (پ.د.ك) بریتی بوو، لە سود وەرگرتن لە پێگەی جوگرافیای ئێران وەك پردی پەیوەندی لە نێوان هێزەکانیدا.

پەیوەندییەکانی نێوان (ی.ن.ك)و ئێران شێوازێکی تری بەخۆوە بینی، ئەم پەیوەندیانە لە سەرەتای شۆرشی ئیسلامیدا لە ساڵی ١٩٧٩ بەدواوە شێوازێکی ململانێ بەخۆوە دەبینێت، سەرچاوەی ئەم ململانێیەش بریتی بوو لەوەی کە (ی.ن.ك) پشتگیری (ح.د.ك.ا) و کۆمەڵەی[1]، کرد لە شەری دژە ئێراندا. ئەم ئاڵۆزییە لە پەیوەندییەکان بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٨٦، کە هەردولا بە ناوبژی (ح.س.ك) رێکەوتن. بە پێی ئەو رێکەوتنە ئێران و(ی.ن.ك) لە جەنگی دژە عێراقدا بوون بە هاوپەیمان، ئەم هاوپەیمانیەش لە چالاکیەکی هەردولادا بۆ سەر لولە نەوتیەکانی کەرکوك لە ساڵی ١٩٨٦ بەرجەستە بوو[2]. دەتوانین بڵێین تا کۆتایی جەنگی هەشت ساڵە لە ١٩٨٨، هەماهەنگی تەواو لە نێوان هەردولادا هەبوو بەتایبەت لە چالاکیە سەربازیەکاندا. لە دوای جەنگەکە پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) چونە ناو خاکی ئێران کە تا سەرەتای ساڵی ١٩٩١ لە ئۆردوگاکانی ئێراندا ژیانیان بەسەر برد. لە ماوەی مانەوەی (ی.ن.ك) لە ئێران، ئەم پارتە بە سەرکردایەتی تالەبانی

---

[1] ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٦٩ وەك رێکخراوێکی مارکسی لینینی بە شێوەی نهێنی کاریان دەکردو. لە ساڵی ١٩٧٨ یەکەمین کۆنگرەی خۆی لە شاری نەغەدە بەستووە. لە ١٢ی دیسەمبەری ١٩٧٩و لە میانی شۆرشی ئێراندا بە ئاشکرا دەرکەوتن. لە ئەندامە چالاکەکانیان سدیق کەمانگەرو فوئاد سوڵتانی بوو. ئەم پارتە هەر زوو لەگەڵ (ح.د.ك.أ) کەوتنە ناکۆکی لەسەر بابەتی ئایدۆلۆجیو شێوازی کاری سیاسیو سەربازی لە دوای سەرهەڵدانی شۆرش. بارەگای سەرەکی ئەم پارتە لە شارۆچکەی زرگوێزە لە باشوری شاری سلێمانیی. ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٨٣ ناوەکەی گۆردرا بۆ پارتی کۆمۆنیستی ئێران. هۆشمەند عەلی شێخانی: عەبدوالرحمان قاسملۆ، ژیانو رۆڵی سیاسی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد. ١٩٣٠-١٩٨٩. هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٦٩.

[2] بۆ زانیاری زیاتر بروانە، نەوشیروان مستەفا ئەمین: خولانەوە لە ناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عیراق ١٩٨٤-١٩٨٨، مەڵبەندی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان،١٩٩٩، سلێمانی، ل١٠٣-١١١

هەوڵیدا لە ساڵی ١٩٨٩کە بوار بۆ گفتوگۆ لە نێوان ئێران‌و (ح.د.ک.ا) برەخسێنێت ، بەڵام ئەم هەوڵە بە ئاکام نەگەیشت، بەهۆی تیرۆرکردنی سکرتێری ئەو حزبە، عەبدولرەحمان قاسملۆ(١)، لە میانەی دانوستانەکان لە ڤییەننا لە لایەن ئێرانەوە(٢).

ئەم رووداوە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر ساردبونەوەی پەیوەندی نێوان هەردولا، لە دوای دامەزراندنی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان، دووبارە لە رووداوێکی هاوشێوەدا سکرتێری نوێی (ح.د.ک.ا) سادقی شەرەفکەندی(٣)، لە میانی گفتوگۆدا لە شاری بەرلین لە لایەن ئێرانەوە لە ساڵی ١٩٩٢دا، تیرۆر کرا. ئەمە وایکرد کە تاڵەبانی بە ئاشکرا رایگەیاند کە ئێران ئەم کارەی ئەنجام داوە، هەروەها وتی: "دەزگای تیرۆرستی ئێرانی بەرپرسیارە لە شەهیدکردنی شەخسیەتە کوردییەکان‌و عەبدولرەحمان قاسملۆو تەقاندنەوەی چەن ئۆتۆمبیلێك لە کوردستانی عێراق بە مەبەستی تیرۆرکردنی کوردە ئێرانیەکان.....ئێمە

---

[1] عەبدولرەحمان قاسملۆ (١٩٣٠-١٩٨٩) لە شاری ورمێ لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی‌و ئامادەیی لە ئێران تەواو کردووە. پاشان چۆتە ئەورووپاو لە زانکۆکانی فەرەنساو چیکۆسلۆفاکیا خوێندویەتی لە بواری زانستی سیاسی‌و کۆمەلایەتیدا. هەڵگری بروانامەی دکتۆرایە لە زانستی ئابوری لە زانکۆی پراگ‌و پاشان هەر لەو زانکۆیە وانەی سەرمایەو ئابووری سۆسیالیستی وتووە. هەڵگری دروشمی دیموکراسی بۆ ئێران‌و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بوو.لە ساڵی ١٩٧٣ بووە بە سکرتێری گشتی (ح.د.ك.ا).. لە ١٣ی یۆلیۆی ١٩٨٩ لە کاتی دانوستان لەگەڵ شاندی ئێرانی لە ڤییەنا تیرۆر کرا. کریس کۆچێرا: بزوتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی، بەرگی بەرگی دووەم، وەرگێرانی لەفارسییەوە: ئەکرەمی مهێرداد، سەنتەری چاپ‌و پەخشی نما، ٢٠٠٢. ل١٨-٢٤.

[2] نادر ئینتسار: ئیتنۆ نەتەوایەتی کورد، ل٩٩

[3] سادق شەرەفکەندی (١٩٣٨-١٩٩٢) لە شاری بۆکان سەر بە پارێزگای ئازەربێجانی رۆژئاوا لەدایك بووە. برای هەژاری شاعرە، لە دوای عەبدولرەحمان قاسملۆ بوو بە سکرتێری (ح.د.ك.ا) ئێران. هەڵگری بروانامەی دکتۆرا بوو. لە ١٧ی سێپتەمبەری ١٩٩٢ رێستۆرانتی میکۆنۆس لە بەرلین تیرۆر کرا. دواتر دادگای ئەو شارە دەزگای هەواڵگری ئێرانی تۆمەتبار کرد. کە بوو بە هۆی تێکچونی پەیوەندییەکانی نێوان ئێران‌و ئەڵمانیا.

Iran–Europe relations : challenges and Seyyed Hossein Mousavian: opportunities, Routledge, New York 2008, p92

پێمان وتن لەجیاتی TNT و هۆکارە چەپەڵەکانی تیرۆر کردن، نەوتو بەنزینمان بۆ بنێرن، هیوادارم رەفسەنجانیو ولایەتی دەستیان لەم کارەدا نەبێت"[1].

ئێران بەم لێدوانانەی تاڵەبانی نیگەران بوو، بۆیە داوای رونکردنەوەی لە نوێنەری (ی.ن.ك) کردبوو، هەر ئەم روداوە وایکرد کە ئەم پارتە نوسینگەی خۆی لە تاران دابخات[2]. لێرە بەدواوە ئێران فشاری دەخستە سەر (ی.ن.ك). ئەم فشارانە لە لایەك بریتی بوو لە ئەنجامدانی کاری تیرۆرستی لە سنوری دەسەلاتی پارتەکەدا، لە لایەکی تر بریتی بوو لە تۆپبارن کردنو ئەنجامدانی چالاکی سەربازی لەو سنورانەی کە لەژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك)دا بوو. وەزیری پێشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان جەبار فەرمان، کە هەمانکات ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتەکە بوو رایگەیاند: "رۆژی ٢١ی یۆلیۆی١٩٩٣ هێزێکی ئێرانی بە قولایی (١٥) کم سنووری هەرێمی کوردستانیان بەزاندو پەلاماری گوندی (کەناروێ)ی داوەو قوتابخانەکەیان تەقاندووەتەوەو (١٣) کەسیشیان لە دانیشتوانو فەرمانبەرانی ناوچەکە بە بارمتە گرتووە. هێزەکانی ئێمەش توانیویانە (٥) سەرباز بە دیل بگرن. لە سەرەتای مانگی ئادارەوە تا ئێستا(٢٧ی یۆلیۆی ١٩٩٣)، ئێران (٤٥) جار خاکی ئێمەی بۆردومان کردووەو (٣٠) شەهیدو بریندارمان هەبووە (٢٢) گوند بە زەوییە کشتوکاڵیەوە سوتاوە. ئێمەش لەتوانامانـدا هەیە بەرپەرچی هەموو هێرشێك بدەینەوە"[3].

یەکێکی تر لە فشارەکانی ئێران بریتی بوو لە پشتگیریکردنی ئەو لایەنانەی، کە لە دژی (ی.ن.ك) دەکەوتنە شەرەوە، ئەوە بوو پشگیری (ب.ئ.ك)ی کرد لە ساڵی (١٩٩٣) بەدواوە، ئەم پشگیریە کاریگەریی گەورەی نەکردە سەر (ی.ن.ك)، چونکە تا ئەو کاتەش (ی.ن.ك) لە پەیوەندیە دەرەکیەکانیدا پشتی بە تورکیاو سوریا دەبەست، بەڵام کاتێك، کە لەگەڵ (پ.د.ك) لە ساڵی١٩٩٤کەوتە جەنگەوە، ئیتر ئەم هێزە لە کوردستاندا لە نێوان نەیارەکانیدا

---

[1] کوردستانی نوێ. رۆژنامە. ژمارە(١٩٥)، ١٩٩٢/٩/٢٠

[2] نەوشیروان مستەفا ئەمین: خەون یان مۆتەکە یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ، ل٥٥

[3] کوردستانی نوێ. رۆژنامە. ژمارە(٤٤٧)، ١٩٩٣/٧/٢٨

قەتیس بوو، چونکە لە باشورەوە حکومەتی عێراقی بوو کە دوژمنی سەرەکی کورد بوو، لە رۆژئاواوە (پ.د.ك) بوو،کە بە حوکمی پێگەی دەسەلاتی، بوو بە لەمپەر لەبەردەم پەیوەندییەکانی (ی. ن.ك) لەگەڵ تورکیاو سوریا ، لە باکوریشەوە ئێران بوو، کە بەردەوام فشاری دەخستە سەر، لە رۆژهەلاتەوە (ب.ئ.ك)و (پ.د.ك) بوو، کە لەبەرەی جەنگدا بەرەو رووی یەکتر راوەستا بوون. رەنگدانەوەی ئەم قەتیسبوونە بۆ یەکەمجار لەسەر سکرتێری گشتی پارتەکە تالەبانیو جێگرەکەی نەوشیروان مستەفا رەنگی دایەوە، ئەمەش کاتێك، کە لە سەرەتای شەر لەگەڵ (پ.د.ك)دا هەردووکیان لە ئەوروپاوە گەرابوونەوە بۆ دیمەشق، بەشێوەیەکی ئاسایی نەیانتوانی بگەرێنەوە سنوری دەسەلاتی خۆیان، بەلکو لە دیمەشق–قامشلی بە فرۆکە، لە قامشلی–نەسیبەین بە ئوتومبێل، لە نەسیبەین –هەولێر بە هەلیکۆپتەری سەربازی تورکی گەرانەوە هەولێر[1].

تا ئەم قۆناغەش پەیوەندییەکانی ئێرانو (ی.ن.ك) بەرەو ئاسایی بوونەوە، نەرۆشتبوو، چونکە سەرکردایەتی پارتەکە نەگەشتبونە ئەو باوەرەی، کە لەگەڵ ئێراندا پەیوەندیەکەیان ئاسایی بێتەوە، ئەوە بوو یەك رۆژ دوای گەرانەوەی، تالەبانی وتی، " ئێران بە راستەوخۆ بەشداری شەڕ دەکات بە بەکارهێنانی سوپای پاسدار لە دژی یەکێتی، لە هەرکوێیەك شەر خامۆش کرابێت ئەو لەوێ شەری خۆش کردووە"[2]. هەروەها وتی، "ئامانجی ئەوەیە کە ئەو دیموکراتیەی کوردستانی عێراق پوچەڵ بکاتەوەو بە نیازی ئەوەی کە بتوانێ گەلەکەمان لە هەردوو دیوی کوردستان نائومێد بکات"[3].

بەلام بەگەرمبوونی ئاگری جەنگو زۆربونی فشارەکان لەسەر سەرکردایەتی ئەو پارتە، بۆ دانوستان چونە تاران بە ئامانجی بێلایەنکردنی ئێران لە جەنگی ناوخۆو ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکان. لایەنی ئێرانی، کە (سەنتەری نەسر) نوێنەرایەتی ئەکرد، بە روونی بە

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بروانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین: خەون یان مۆتەکە یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ،ل ١٢٣–١٣٢

[2] کوردستانی نوێ. رۆژنامە. ژمارە (٦٩٨)، ١٩٩٤/٦/٢

[3] کوردستانی نوێ. رۆژنامە. ژمارە (٦٩٩)، ١٩٩٤/٦/٥

شاندی (ی.ن.ك)ی وتبوو، کە ئێران فشارەکانی راناگرێت ئەگەر (ی.ن.ك)، چالاکی بەرهەڵستکارە کوردییەکانی ئێران بەتەواوی سنوردار نەکات. یان بەو شێوەیەی کە شاندی کوردی لە بۆچونی ئێرانیەکان تێگەیشتبوون، "ئەگەر ئاسایشی کوردستانی ئێران بەهۆی چالاکی دوژمنەکانیەوە لە ئەرزی کوردستانی عێراق تێکچوو، ئەوا ئاسایشی کوردستانی عێراقیش بەهۆی چالاکی دوژمنەکانیانەوە لە ئەرزی کوردستانی ئێرانەوە تێك ئەدرێت"[1].

سیاسەتی ئێران لە جەنگی ناوخۆدا لەسەر دوو هێڵ بەڕێوە دەچوو، یەکەمیان بریتی بوو لە بەکارهێنانی مەیدانی هەرێمی کوردستان بۆ لەناوبردنی بەرهەڵستکارە کوردیەکانی ئێران، ئەمەش بەڕای ئێرانیەکان بەبێ هاریکاری (ی.ن.ك) ناکرێت، چونکە ئەم پارتە زۆرینەی رەهای سنورەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ئێرانی بەدەستەوەیە، لە لایەکی تر بنکەی سەرەکی پارتە بەرهەڵستکارەکان دەکەوتە سنوری ئەم پارتەوە، بۆیە بەشێکی سەرەکی هەوڵەکانی لە هەرێمی کوردستاندا لە پێناوی ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەم پارتەدا خستبووە گەڕ. ئەمەش بە سود وەرگرتن لەو لایەنانەی، کە نزیکن لە هەردولایەنەوە، وەك (ح.س.د.ك)[2]، و (ئ.ب.ش.ئ.ع). لایەنی ئێرانی هێندە پێداگری لەسەر ئەم بابەتە کردبوو تا گەیشتبووە ئەوەی کە جگە لە کاروباری پارتە بەرهەڵستکارە ئێرانییەکان نەبێت، ئیدی ئێران بە هیچ شێوەیەك دەست وەرنادەنە کاروباری ناوخۆی کوردستان و رێز لە بریاری فیدراڵی کوردستان دەگرن. ئێران بە داواکاری راگرتنی چالاکیەکانی بەرهەڵستکاران و (ی.ن.ك) بە داواکاری بێلایەنکردنی ئێران لە شەری ناوخۆ، هەڵگرتنی ئابڵوقەی ئابووری کە لەلایەن ئێران و (پ.د.ك) کەوتبووە سەریان، کردنەوەی نوسینگەی پارتەکەیان لە تاران، چوونە سەر مێزی گفتوگۆ[3]. تەوەری دانوستانەکانیش

---

[1] نەوشیروان مستەفا ئەمین: خەون یان مۆتەکە یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ،ل ل٥٨ -٥٩

[2] محەمەد حاجی محمود: رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك، ل ل٢٧٢، ٣٥٧.

[3] نەوشیروان مستەفا ئەمین: خەون یان مۆتەکە یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ، ل٦١

بریتی بوو لە ، پەیوەندییەکانی هەردوولا، کێشەی بەرهەڵستکاران، هێزی هاوپەیمانان، بارودۆخی عێراق[1].

هێڵی دووەم کە ئێران هەوڵی بۆ دەدا ئەویش سەرپەرشتیکردنی دانوستان بوو، کە لە نێوان لایەنە شەرکەرەکاندا رویان دەدا، ئێران توانی سەرپەرشتی کۆبونەوەکانی نێوان (ح.س.د.ك)و (پ.د.ك) بکات لە ساڵی ١٩٩٣[2]. هەروەها توانی رێکەوتنامەی نێوان (ی.ن.ك)و (ب.ئ.ك) بکات لە ساڵی ١٩٩٧[3]. بە هەمان شێوە دەیویست سەرپەرشتی رێکەوتنامەی نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) بکات. ئامانجی ئێران لەم سەرپەرشتیارییە ئەوە بوو، کە هەرێمی کوردستان و رووداوەکانی لە ژێر سایەی ئەو بێت. کۆماری ئیسلامی ئێران ویستی وابوو کە چۆن لە هەشتاکاندا ئەم هێزانەی سەرەوەی کۆکردبۆوەو هەماهەنگ بوو لەگەڵیان بۆ روخانی رژێمی بەغداد، هەمان ویستی هەماهەنگی لە نەوەدەکاندا هەبوو، بەڵام ئەمجارە لە پێناوی ئاگاداربوون لە چارەنوسی هەرێمەکەو سەپاندنی هەژمونی خۆی بەسەر هەژمونی رۆژئاوادا لە هەریمی کوردستاندا.

نەوشیروان مستەفا لە کتێبەکەیدا باس لەوە دەکات، کە لە تاران چوار خولی گفتوگۆ لە نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) بەرێوە چووە لە نێوان ئۆگستۆسی ١٩٩٤–سێپتەمبەری١٩٩٥[4]. هەردوولا بە ناوبژی ئێران رێکەوتنێکیان واژۆ کردووە، کە گرنگترین خاڵی ئەو رێکەوتنەدا، کە مۆرکی ئێرانی پێوە دیار بوو بریتی بوو لەوەی، کە ئێران لەسەر داوای هێزە کوردییەکان ناوبژی دەکات. خاڵێکی تر، کە ئاماژەی پێکرابوو بریتی بوو لەوەی کە هەردوو پارتی شەرکەر، ئاسایشی سنوری ئێران و سوریاو تورکیا لەبەرچاو بگرن[5]. بەڵام ئەم رێکەوتنە نەچووە بواری جێبەجێکردنەوە، چونکە ئێران هێندەی رۆڵێکی مێژوویی هەبوو هێندە

---

[1] هەمان سەرچاوە: ل٦٩

[2] محەمەد حاجی محمود: رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك، ل ل٢٦٤-٢٦٥.

[3] بروانە بەڵگە نامەی ژمارە (٨)

[4] نەوشیروان مستەفا ئەمین: خەون یان مۆتەکە یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ، ل٥٤

[5] بروانە بەڵگە نامەی ژمارە (٨)

شەرعییەتێکی یاسایی لە هەرێمی کوردستاندا نەبوو بە بەراورد لەگەڵ هاوپەیمانان، کە بەهۆی بریاری ٦٨٨، بونێکی یاسایی و هەمانکات پابەندی نێودەوڵەتیان بۆ پاراستنی هەرێمەکە لە ئەستۆ گرتبوو، بە واتایەکی تر ئێران لە چوارچێوەی بەرژەوەندی ئیسلامیو دژایەتی کردنی رۆژئاوا (وەك دوو بنەمای سیاسەتی دەرەوەی ئێران) دەیروانییە هەرێمی کوردستان، کە هەردوو بنەماکە لەگەڵ ئەو پایانەدا یەکانگیر نەدەبوو کە هاوپەیمانان هەرێمەکەیان لەسەر وەستاندبوو، ئەویش بریتی بوولە پاراستنی هەرێمەکە لە رێگای سوپای هاوپەیمانان، هەروەها پشگیریکردنی هێزە عەلمانییەکانی کوردستان. بە واتایەکی تر ئەمریکا هەموو جوڵەیەكو هەژمونێکی ئێرانی لە هەرێمی کوردستان بە زیانی بالآدەستیو نەخشە رێگای خۆی دەزانی لە هەرێمی کوردستانو لە عێراقیشدا. هەر لەم روانگەیەوەیە دەبینین تالەبانی لە نامەیەکیدا بۆ کادرێکی پارتەکەی دەنوسێت:"ئەمریکا دەڵێت ئەوە خەتی سوورەو هەرەشەی تێکدانی علاقات دەکات گەر ئێران بێتە کایەکەوە"[1]. لەم بارەیەوە، ئەحمەد چەلەبی[2]، بە هەردوو پارتەکەی راگەیاندبوو ئەگەر رێگە لە ناوبژیوانی ئێران نەگرن ئەوا هاوپەیمانان "رەنگە بکشێنەوەو بەجێتان بهێڵن بۆ سەدام"[3]. ئێران لای خۆیەوە تێگەیشتنی بۆ نارەزایی ئەمریکا هەبوو لە رۆڵی ئێران لە هەرێمی کوردستاندا، بۆیە کاتێك سەرۆکی مەکتەبی کاروباری عێراق لە کۆماری ئیسلامی ئێران عەلی ئاغای محەمەدی، گەیشتە هەرێمی کوردستان لە ٢ی یەنایری ١٩٩٦، بۆ ئەوەی رێکەوتنی تارانی نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) بکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە، مکوڕ بوو لەسەر پەیامەکەی ئەویش ئەوە بوو کە بە ئەمریکا رابگەیەنێت، هەرێمی کوردستان جێگای ململانێی ئێرانو ئەمریکا نییە. زیاتر لەوە، وتی: "ئەمریکا سەفەری وەفدی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ کوردستان بە

---

[1] نەوشیروان مستەفا ئەمین: خەون یان مۆتەکە یاداشتی رۆژانەی شەری ناوخۆ، ل٨٧.

[2] ئەحمەد عەبدولهادی چەلەبی لە ساڵی ١٩٤٥ لەدایك بووە. خاوەنی بروانامەی دکتۆرایە لە زانستی بیرکاری لە زانکۆی شیکاگۆ لە ئەمریکا. دامەزرێنەری بانکی (بترا)یە لە ئوردن لە ساڵی ١٩٧٧. بەهۆی مایەپوچبونی بانکەکەی، دادگای ئەردەن حوکمی ٢٢ ساڵ زیندانی بەسەردا دا بە شێوەی غیابی. لە ساڵی ١٩٩٢ بوو بە سەرۆکی لیژنەی جێبەجێکردن لە (ك.ن.ع). http://www.alrashead.net

[3] کوردستانی نوێ. رۆژنامە. ژمارە (١١١٨)، ١٩٩٦/١/٣

کارێکی ترسناك دەزانێت، بەلاّم ئەمریکا ناتوانێت لە ناو میللەتی کورددا جێگای خۆی بکاتەوەو قازانجی ئەم گەلە هی ئێمەیە"[1].

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە هێڵی دووەمی ئێران لە هەرێمی کوردستان گەیشتە بنبەست، بۆیە چانسی کارکردنی ئێران تەنها هێڵی یەکەم بوو. ئەم هێڵە رۆژ لە دوای رۆژ بۆ ئێرانیەکان کاراتر دەبوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی لایەنە شەرکەرەکانی هەرێمی کوردستان زیاتر پێویستیان بە لایەنگر بوو، نەك ناوبژیوان. یان دەتوانین بلێین هەردوو لایەنی جەنگەکە داوای یارمەتیان لە ئێران دەکرد بۆ شەر، نەك بۆ ئاشتی. (پ.د.ك) داوای لە ئێران دەکرد کە لە رێگای ئێرانەوە ئابلۆقەی سەر شارۆچکەی هەڵەبجە کە (ی.ن.ك) بەسەریدا سەپاندبوو، هەڵبگرێت. هاوکات (ی.ن.ك) داوای لە ئێران دەکرد، کە ئابلۆقەی سەر پارێزگای هەولێرو سلێمانی بشکێنێت کە (پ.د.ك) سەپاندبووی. لێرەدا ئێران داوای لایەنی دووەمی پەسەند کرد (واتە ی.ن.ك) چونکە ئەم لایەنە بەهۆی ئەوەی تەواوی هێزەکانی خۆیی و لەگەڵ سنوری دوو پارێزگای بن دەستی، قەتیس کرابوو، بۆیە سازشی زیاتری لێ چاوەروان دەکرا ، بەلاّم لایەنی یەکەم ( واتە پ.د.ك) نەدەچووە ژێر فشارەکانی ئێران، چونکە تەنها یەك شارۆچکەی لە ژێر فشاری ئیراندا بوو، لە کاتێکدا زۆرینەی دەرگای سنوری دەسەلاّتەکانی تری بەرووی تورکیاو سوریاو هەندێك جار عێراقیش ئاوەلاّ بوو. ئێرانو (ی.ن.ك) لە ئۆگستۆسی ١٩٩٤ گەیشتنە رێکەوتنێك، کە گرنگترین خاڵەکانی بریتی بوون لە:

١. (ی.ن.ك) چالاکی سەربازی بەرهەڵستکارەکانی ئێران قەدەغە دەکاتو رێوشوێنی پێویست دەگرێتە بەر بۆ ئەوەی لە سنور ئاودیوو نەبن. ئێران تێچونی ئەو هێزە دەکات کە ئەم کارە لە ئەستۆ دەگرێت

٢. ئێران ناوبژیوانی لە نێوان لایەنە ناکۆکەکانی کوردستانی عێراق دەکات بە مەبەستی کۆتایهێنانی ململانێ نێوانیان دەکەن.

٣. هەردوولا هاریکاری یەکتر دەکەن بە مەبەستی بەهێزکردنی بەرهەڵستکارانی عێراقی.

٤. هەردولا هاریکاری یەکتر دەکەن بۆ روخاندنی رژێمی دکتاتۆری عێراق.

٥. رێگە بە کادرو بەرپرس و مامۆستاکانی زانکۆ بدرێت کە گەشتەکانیان لە ئێرانەوە بە جیهانی دەرەوە بە ئەنجام بگەیەنن.

٦. راهێنانی کادری راگەیاندن لە بواری ئیزگەو تی ڤی و رۆژنامەوانی لە کۆماری ئیسلامی.

٧. پێشکەشکردنی یارمەتی تەکنیکی و زانستی زانکۆو پەیمانگاکانی هەرێم بدرێت.

٨. پێشکەشکردنی یارمەتی تەندروستی بۆ کوردستانی عێراق.

٩. ئێران ئەم کارئاسانییە ئابووریانە دەکات:

- کردنەوەی مەرزەکانی سنوری پارێزگای (ورمێ، کوردستان، کرمنشاه)، بە مەبەستی بازرگانی
- رێگە خۆشکردن بۆ جوڵەی ترانزێت لە هەرێمی کوردستان بۆ دەرەوەو بە پێچەوانەشەوە
- یارمەتیدانی تەکنیکی بۆ دەرهێنانی پەترۆڵ
- یارمەتیدان بە مەبەستی وەگەرخستنەوی کارگەکان.
- کارئاسانی بۆ ئەو بابەتانەی، کە (ی.ن.ك) لە بازارەکانی ئێراندا پێویستی پێیەتی [1].

لێرە بەدواوە تا کۆتایی شەری ناوخۆ لە (١٩٩٨) ئێران و (ی.ن.ك) هاوپەیمانی ستراتیجی یەکتر بوون لە بواری سیاسی و ئابوری و سەربازیدا [2].

قۆناغی چوارەم: ماوەی نێوان (١٩٩٨-٢٠٠٣)

لەم قۆناغەدا ئێران تانوپۆی داهاتوی عێراقی بۆ دەردەکەوێت، ئەمیش لەروانگەی بریاری ئازادکردنی عێراق لە ساڵی ١٩٩٨ لە لایەن کۆنگرێسی ئەمریکاوە. ئێران لە روانگەی

---

[1] الاقتتال الداخلي في كوردستان العراق، كيف اندلع ومن المسؤل عنه، الجزء الاول، مكتب الدراسات والبحوث المركزي، تابع للحزب الديمقراطي الكردستاني. هةولير، ١٩٩٧، ص ص ٢٩٤-٢٩٦.

[2] المصدر نفسه ص ص٣٠١، ٣٥١،٣٢٥.

نزیکبونی لە زۆرینەی بەرهەڵستکارانی عێراقی، بە تایبەت (ی.ن.ك)و (ئ.ب.ش.ئ.ع) ، دەیویست ئاگاداری پرۆژەی داهاتووی عێراق بێت، بە شێوەیەك لە دوای روخانی رژێمی سەدام حسین، گروپی فەرمانڕەوا، ئەگەر داردەستی ئێران نەبن، ئەوا لە دۆستەکانی ئێران بن. لەم تێروانینەوە تاکە هێزێکی عێراقی کە وەك یەك لە ئێران و ئەمریکا نزیك بێت (ی.ن.ك) بوو. بە واتایەکی تر گروپە شیعیەکان پەیوەندیان لەگەڵ ئەمریکادا نەبوو، هاوکات گروپە عەرەبیە نەتەوەییەکان و (پ.د.ك) لە ئێران نزیك نەبوون، بەڵام ئەوەی، کە سودی لە ململانێکانی (ئێرانی–ئەمریکی) دەبینی و بە قازانجی خۆی بەکاریدەهێنا (ی.ن.ك) بوو. ئەوەی کێشەی بۆ ئێران دروست کرد ئەوە بوو کە (ی.ن.ك) لە دوای رێکەوتنامەی واشنتن لە سێپتەمبەری ١٩٩٨، لەمپەری (پ.د.ك)ی لەبەردەم نەما بۆ پەیوەندیکردن بە جیهانی دەرەوە، بە واتایەکی تر رێکەوتنی واشنتن دەرگای پەیوەندیەکانی (ی.ن.ك)ی زیاد کردو بەم هۆیەوە فشارەکانی ئێرانی لەسەر سوك بوو، کە لە ماوەی جەنگی ناوخۆدا(١٩٩٤–١٩٩٨) تووشی هاتبوو.

ئەم هۆکارەی سەرەوە تەرازووی پەیوەندیەکانی بەلای (ی.ن.ك) سەنگین کرد، چونکە ئێران لە عێراقدا پێویستی زیاتر لە جارانی بەو پارتەی سەرەوە هەبوو، بە پێچەوانەی پارتەکە کە وەك سەردەمی جەنگی ناوخۆ پێویستی بە یارمەتی سەربازی و ئابووری ئێران نەبوو.

لە دوای رووداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، کۆبونەوەکانی ئەمریکا لەگەڵ پارتە بەرهەڵسکارەکانی عێراقدا پەرەی دەسەند، تاڵەبانی هەوڵەکانی لە پێناوی بەشداریکردنی لایەنێکی شیعە لەو کۆبونەوانەدا خستبووەگەر. هەڵبژاردەی تاڵەبانی، (ئ.ب.ش.ئ.ع) بوو بۆ ئەوەی وەك لایەنێکی شیعە بەشدار بێت. بۆ ئەم هەوڵەش پێویستی بە رەزامەندی ئێران هەبوو، بۆیە لە هەوڵێکی بێوچاندا توانی ئێران و (ئ.ب.ش.ئ.ع) رازی بکات، بەڵام بەو مەرجەی، کە کۆبونەوەکانی نێوان ئەمریکاو بەرهەڵستکاران لە ئەوروپا بێت نەك لە ئەمریکا، هەروەها پەیوەندی ئەمریکا لەگەڵ (ئ.ب.ش.ئ.ع) راستەو خۆ لەگەڵ سەرۆکی

ئەنجومەنەکە محەمەد باقر ئەلحەکیم[1] نەبێت، بەڵکو لە ئاستێکی سەرکردایەتی بێت[2]. لە لایەکی تر وتەکانی تاڵەبانی بۆ میدیا جیهانیەکان جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە هەرچەندە ئەو رۆڵی نێوەندی بینیوە لە نێوان ئەمریکاو محەمەد باقر ئەلحەکیم، بەلام هەمانکات، لە پرۆسەی رووخانی رژێمی سەدام حسیندا دژایەتی خۆی بۆ دەسوەردانی دەوڵەتە ناوچەییەکان دەربڕی بەتایبەت ئێران و تورکیا، چونکە دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و پەشێوی لە عێراقدا[3].

لەم سۆنگەیەوە ئێران، هەمیشە لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ (ی.ن.ک) سڵەمینەوەیەکی پێوەدیار بوو، ئێران وەك دراوسێکانی دیکەی هەرێمی کوردستان، لە دروستبونی دەوڵەتێکی کوردی لە دوای رمانی دەسەلاتی سەدام حسین دەترسا، هەربۆیە وەك فشارێك لەسەر هەرێمەکە بە گشتی و (ی.ن.ك) بە تایبەتی، پشتیوانی لە گروپێکی توندرەوەی ئیسلامی دژ بە (ی.ن.ك) کرد بەناوی (جند الاسلام) لە کوردستان، کە دواتر بوون بە (انصار الاسلام) لە کوردستان[4]، لەم بارەیەوە عودەی سەدام حسین ئێرانی بە وەستان لە پشت

---

[1] محەمەد باقر ئەلحەکیم، (١٩٣٩-٢٠٠٣)، کوری مەرجەعی ئاینی سەید موحسن ئەلحەکیمە. هەڵگری بروانامەی ماجستێرە لە زانستی قورئان لە زانکۆی ئیمام سادق لە ئێران. لە ساڵی ١٩٨٠ چۆتە ئێران. سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی بووە لە عێراق تا لە ٢٩ی ئۆگستۆسی ٢٠٠٣ لە تەقینەوەیەکی تیرۆرستی رێکخراوی ئەلقاعدە لە نەجەف تیرۆر کرا. http://ar.wikipedia.org/

[2] کۆنوسی کۆبونەوەی شاندی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ئێران، ٢-٦/٥/٢٠٠٢

[3] الانصات المركزي، نشره خبريه معلوماتيه يوميه العدد(٢٣٤٨). ٢٠٠٢/٩/٨

[4] ئەم رێکخراوە لە ١ی سێپتەمبری ٢٠٠١ لە شارۆچکەی بیارەی سەر بە پارێزگای سلێمانی دامەزرا لە لایەن ئەندامە توندرەوە جیابوەکانی (ب.ئ.ك) بە پشتیوانی رێکخراوی ئەلقاعدە. دواتر لە ٥ی دیسەمبەری ٢٠٠١ ناوەکەی گۆردرا بۆ ئەنسار ئەلئیسلام لە کوردستان بە سەرپەرشتی مەلا کرێکار. دوای چەندین کاری تیرۆرستی و شەرو پێکدادان لەگەڵ (ی.ن.ك)، ئەوە بوو لە میانی جەنگی ئەمریکا دژ بە عێراق، لە لایەن سوپای ئەمریکاوە بارەگاکانیان لە هەورامان بۆردومان کراو پێگەکانیان لەو ناوچەیە لەدەستدا. نیاز سەعید عەلی: دیاردەی ئیسلامی سیاسی و رەوتی ئیسلامی سیاسی لە کوردستانی عێراق، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٩٧-٩٩.

گروپە تیرۆرستیەکانی کوردستانی عێراق تاوانبار کرد[1]. بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە، بە سەرکردایەتی تاڵەبانی شاندێکی(ی.ن.ك) چوو بۆ ئێران و لە شارۆچکەی قەسر شیرین کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ لایەنی ئێرانی کردبوو بۆ تاوتوێکردنی ئەو پرسە. ئێرانیەکان وتبوویان کە ئەو گروپە تیرۆرستن و مەترسین بۆ سەر ئێرانیش[2]، دوا بەدوای ئەم کۆبونەوەیە ئێران هەریەکە لە (ی.ن.ك) و (ب.ئ.ك) و (کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان)ی کۆکردەوە بۆ یەکهەڵوێستی دژی (ئەنصار الاسلام)، ئەوە بوو هەرسێ لا لە (١٥ی نۆڤەمبەری٢٠٠١) گەیشتنە ڕێکەوتنێك بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە، ئەویش بەوەی ئەو دوو پارتە ئیسلامیە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن، لە بارێکدا ئەگەر پێیان چارەسەر نەکرا ئەوا (ی.ن.ك) هێرش دەکاتە سەر (انصار الاسلام)، و هەڵوێستی ئەوانیش یان دەبێت بێلایەن بن یان دەبێت هاریکاری (ی.ن.ك) بن. بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتنەکەش، نوێنەری ئێران و نوێنەری پارتە بەشداربووەکانی ڕێکەوتنەکە بەدواداچون دەکەن، هەروەها پارتە ئیسلامیەکان بەشداری لە حکومەتی هەرێم دەکەن و یارمەتی مادییان لە لایەن (ی.ن.ك) پێدەگات، شێوازی ئەم بەشداری و یارمەتییە لە ڕێگای ئێرانەوە بەو دو لایەنە رادەگەیەنرێت[3].

لەم ڕێکەوتنەدا ئێران خۆی دەکاتە زامنی ئاشتی لە هەرێمەکەدا، ئەمەش وەك ئاگادارکردنەوەی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان لە قەبارەی هەژمونی خۆی لە هەرێمەکە. ئەم پەیامەی ئێران زۆر بە ئاسانی گەیشت و دەسەلاتدارانی هەرێم تێگەیشتنیان بۆ ناوەرۆکەکەی هەبوو، لەم پێناوەدا سەرۆکی حکومەتی (ی.ن.ك) لە سلێمانی بەرهەم ئەحمەد سالح چووە ئێران و ڕایگەیاند، کە هەوڵی پارتەکەی بۆ ئەوەیە، کە وەك هێزێکی کوردی عێراقی لە گۆڕەپانی سیاسی عێراقدا ڕۆڵی هەبێت و بەشێك بێت لە دارێژەرانی سیاسەتی عێراقی داهاتوو. وەڵامی ئێرانیەکانیش بریتی بوو لەوەی کە ئێران، کوردستانی

---

[1] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد(٢٣٤٠). ٢٠٠٢/٨/٢١.

[2] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد(٢٠٤١).٢٠٠١/١٠/١٦.

[3] بروانە پاشکۆی ژمارە (١٠)

عێراق بە بەشێك لە خاکی عێراق دەزانێت. کوردەکانیش وەك هێزی عێراقی دەناسێنێت، هەوڵەکانیشی لە پێناو ئاشتیو سەقامگیری لە ناوچەکەدایە[1]. ئەم گوتارە بە شێوازێکی تر لە لایەن سەرۆکی پەرلەمانی ئێران (مەهدی کەروبی) بە تاڵەبانی وترا، کە لە پێش جەنگی ۲۰۰۳، لە ۷ی یەنایری ۲۰۰۳ سەردانی ئێرانی کردبوو. مەهدی کەروبی جەختی لەسەر ئەوە کردبوو، کە " ئێران پشتگیری یەکێتی خاکی عێراق دەکات کە هەموو نەتەوەکان لەگەڵ یەکدا وەك یەك تیایدا بژین". سەرۆك کۆماری ئێران محەمەد خاتەمی لە هەمان سەردانی تاڵەبانی بۆ ئێران، جەختی لەسەر پالپشتی ئێران بۆ بەرهەڵسکارانی عێراقی دەربریی بوو[2].

دەتوانین بڵێن ئەم دیدارە وەك دیداری ماڵئاواکردنی ئێرانیەکان بووە لە کوردی عێراق وەك بەرهەڵستکارو خۆئامادە کردنی ئێران بووە بۆ پێشوازی کردنیان لە ئێران وەك بەشدارێکی سەرەکی لە عێراقی داهاتودا.

---

[1] الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد(٢٠٩١)، ٢٠٠١/١٢/٥

[2] الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد٢٤٤٧، ٢٠٠٣/١/٨. الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية عدد ٢٤٤٨. ٢٠٠٣/١/٩

# تەوەری چوارەم
# کاریگەریی پەیوەندیەکانی ئێران و هەرێمی کوردستان لەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی رۆژهەلاتی کوردستان

پرسی پارتە کوردییە ئێرانیەکان، گرنگترین فایل بوو، لە سەرجەم دانوستانەکای ئێران لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا. ئەم پارتە کوردیانە بە سود وەرگرتن لە جەنگی هەشت ساڵە، توانیبویان لەسەر سنووری کوردستانی عێراقدا بارەگاکانیان دامەزرێنن و لەوێوە هێرشیان دەکردە سەر ئێران، کە ئەمەش جێگای خۆشحاڵی عێراق بوو، چونکە باری سەرشانی سوپای عێراقیان لە هەرێمی کوردستان سوك کردبوو[1]. ئەم پەیوەندیەی نێوان ئەم پارتانە لەگەڵ حکومەتی عێراقدا جێگای نارەزایی پارتە کوردییە عێراقیەکان نەبوو، چونکە ئەمانیش بە هەمان شێوە سودیان لەو جەنگە بینی بوو بۆ گورز وەشاندن لە حکومەتی عێراق؛ بە واتایەکی تر جەنگی نێوان عێراق و ئێران نەبوو بەهۆی شەری نێوان پارتە کوردییەکانی ئەو دوو دەوڵەتە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەماهەنگی زیاتر کردن و رێکەوتنێکیش هەبوو لە نێوان ئەو پارتانە بۆ چونیەتی پەیوەندی ئەم پارتان لەگەڵ دەوڵەتی نەیاردا. سکرتێری کۆمەڵە سەید برایم علیزادە، لەم بارەیەوە دەنوسێت: " دوای ئەوەی شۆرشی ئیسلامی هاتە سەر تەخت لە ئێران، لە یاداشتێکدا کە واژۆ کراو تیایدا شێخ عزەدین

[1] حامد محمود عیسی: المصدر السابق، ص٤٤٣

حوسەینی[1] و کۆمەڵەو (ح.د.ک.ا)و (ی.ن.ک) تیایدا بەشدار بوون، تیایدا هاتبوو، دامەزراندنی پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکانی وەك ئێران و عێراق، بۆ هێزە سیاسیەکانی بەشداربوو لە کۆبونەوەکە، رەوایە، بەو شەرتە کە ئەم پەیوەندیانە لەتمە لە خەباتی خەڵکی کوردستان لە بەشەکانی تر نەدات و وردەکاریەکانی ئەم کۆبونەوەش لە لایەنەکانی تر شاراوە نەبێت"[2].

گرنگترین ئەو پارتە کوردیانەی ئێران بریتی بوون لە:

1- حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران
2- رێکخراوی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران (کۆمەڵە).
3- سازمانی خەباتی نەتەوەیی کوردستان[3]
4- یەکێتی شۆرشگێرانی کوردستان

ئەم گروپانە لە دوای دامەزراندنی دەسەلات لە هەرێمی کوردستان، زیانێکی گەورەیان لێکەوت، بەپێی ئەو زانیاریە وردانەی کە نوسەر (فەرهاد عێراقی) بلاویکردونەتەوە، لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٩١-١٩٩٧)، ئەم پارتانەی سەرەوە، (٢٢٥) پێشمەرگەو لایەنگریان تیرۆر کراون، کە زۆرینەیان سەر بە (ح.د.ک.ا) بوون[4]. هاوکات نوسەرێکی تر ژمارەی

---

[1] (١٩٢٢-٢٠١١) لە شارۆچکەی بانە سەر بە پارێزگای سنە لەدایك بووە. ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ك) بووە لە ساڵی ١٩٤٤. مامۆستای ئاینی بووەو خاوەنی قوتابخانەی ئاینی تایبەت بەخۆی بووە. لە ساڵی ١٩٧٩ رۆڵی گرنگی بینیوە لە دانوستانەکانی نێوان بزوتنەوەی کوردی و رژێمی ئێرانداو چاوی کەوتووە بە خومەینی و سەرۆك وەزیران مەهدی بازرگان. پاشان لە هەشتاکاندا. لە ساڵی ٢٠١١ لە سوید مردووە. http://www.sunni-news.net

[2] پێشرەو: کوردستان ئەمرۆو سبەینێ، ناوەندی چاپەمەنی کۆمەڵ، ١٣٨٤، ل٩٥

[3] پارتێکی نەتەوەیی ئیسلامی سونە مەزهەبە لە ٢٧ی ئۆگستۆسی ١٩٨٠ لە لایەن جەلالەدین حوسەینی برای عزەدین حوسەینی دامەزراوە. تا ئێستا چوار کۆنگرەی بەستووەو ئێستا بابا شێخ کوَری شێخ جەلال حوسەینی سکرتێری ئەو پارتەیە. http://www.sazmanixebat.org

[4] بۆ ئەم زانیاریانە سود وەرگیراوە لە سەرجەم کتێبەکەی، فەرهاد عێراقی: کوردستانی عێراق و تیرۆری نەیارانی سیاسی ئێرانی، بێ شوێنی چاپ کردن، ٢٠٠١. ص ص١١-٧٣.

هەڵسوراوانی سیاسی رۆژهەلاتی کوردستان کە لە سالآنی (١٩٩١-١٩٩٧) لە هەرێمی کوردستان تیرۆر کراون بە (١٧١) پێشمەرگە دادەنێت[1].

ئێران هەر لە سەرەتای دروستبونی دەسەلآتی هەرێمی کوردستان، ئەوەی نەشاردەوە کە ترسی هەیە لە هەرێمی کوردستان، سەرچاوەی ئەم ترسە بریتی بوو لە چەند هۆکارێك کە گرنگترینیان پارتە کوردیەکانی ئێران لەژێر سایەی ئەو هەرێمەدا چالاکی دژی ئێران دەکەن، لە لایەکی تر گواستنەوەی مۆدێلی هەرێمی کوردستان بوو بۆ کوردستانی ئێران.

سەبارەت بە پارتە کوردیەکان، کۆمەڵێك هۆکار هەبوون وای لە لایەنی ئێرانی کردبوو، کە مەترسی لێیان هەبێت، لەو هۆکارانە، بارەگای سەرەکی ئەو پارتە ئێرانیانە لە هەرێمی کوردستان‌و لە ناو هەرێمیشدا لەسەر سنورەکانی ئێران بوون. لە لایەکی تر هەرێمی کوردستان بەهۆی تازە دامەزراندنی‌و هەروەها نەبونی ئەزموونی دەسەلآت، نەبوونی توانای مادی‌و سەربازی، نەیدەتوانی سنورە نێودەوڵەتیەکان بپارێزێت‌و رێگری لە چالاکیەکانی ئەو پارتانە بکات. لە لایەکی تر پارتە کوردییەکانی ئێران‌و عێراق ئەوەندەی ئەزموونی هاریکاریان لە دژی ئێران‌و عێراق هەبوو، ئەوەندە ئەزموونی شەریان لە دژی یەکتر نەبوو. لە هەموویان گرنگتر، بەهۆی ئەوەی کە دەسەلآتی هەرێمی کوردستان هیچ بنەمایەکی یاسایی نێودەوڵەتی نەبوو، بۆیە هیچ ئیلتزامێکی نێودەوڵەتی لەسەر شان نەبوو بۆ پاراستنی سنورەکان لە دژی نەیارانی دەوڵەتانی دراوسێ. هەموو ئەمانە ترسی ئێرانی بەرهەمهێنابوو.

ئێران توانی لەسەر بنەمای ئەو ترسە گەورەترین سود وەربگرێت لە هەرێمی کوردستان بۆ لەناوبردنی نەیارەکانی لەو هەرێمەدا، ئەمەش بەچەندین شێوە لەوانە بۆردومانکردنی بارەگاکان بە موشەك لە خاکی ئێرانەوە، شالآوی فرۆکە بۆ سەر بارەگاکان، رفاندن، دەرمانخواردکردن، بۆسەدانان لەسەر رێگاکان، تقینەوە بە هۆی تی ئن تی، بەکارهێنانی RBG7، هاوەن. ئەم کارانەی لە چەند کەناڵێکەوە بە ئەنجام دەگەیاند لەوانە:

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر شوێن‌و کاتی ئەنجامدانی ئەو کارە تیرۆرستیانە لەگەڵ ناوی تیرۆرکراوان، بروانە، بەهمەن سەعیدی: سێ ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە سکرتێری کۆمەڵە، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ل٤٥٦-٤٦٨.

- نوسینگە فەرمییکانی ئێران لە هەرێمی کوردستاندا هەیبوو کە ئەو نوسینگانە لە هەرسێ پارێزگای هەرێمی کوردستان و شارۆچکەکانی دەربەندیخان و هاوینەهەواری صەلاحەدین کراوە بوون
- ئەو پارتە کوردیانەی کە لە شەری هەشت ساڵەدا بۆ کوردە عێراقیەکانی دروست کردبوو، لەوانە حزب اللەی شۆر شگێر[1]، کە بارەگای سەرەکی لە شارۆچکەی دیبانە بوو، لە لایەن پارتە ئێرانییەکانەوە تۆمەتبار دەکرا بەوەی، کە پێشمەرگەی پارتە ئێرانییەکانی دەفراند یان تیرۆریدەکردن[2].
- ئەو پارتە کوردیانەی کوردستانی عێراق کە دەکەوتنە ژێر باری فشارەکانی ئێران، لەوانە (ب.ئ.ك)، کە لە ساڵی ١٩٩٥ (٧) پێشمەرگەی (ح.د.ك.ا)ی رادەستی ئێران کرد[3]. هەروەها (ی.ن.ك) کە سوپای ئێرانی بردە سەر بارەگاکانی (ح.د.ك.ا)[4].
- هاندانی خەڵك لە رێگای بەخشینی پارەوە بۆ دەرکردنی بارەگای پارتە ئێرانییەکان، سکرتێری گشتی (ح.د.ك.ا) عەبدوڵلای حەسەن زادە دەڵێت:" رژێم خەڵکی ناوچەکەی لێ هاندابن و بەڵێنی پێدابوون، کە ماڵی (٣٠٠) هەزار تمەنیان ئەداتێ ئەگەر (ح.د.ك.ا) دەربکەن"[5]. هەمان زانیاری لە نامەیەکی نوێنەری (ب.ئ.ك) بۆ فەرماندەی سەنتەری نەسر جەختی لەسەر کراوەتەوە کە تیایدا هاتووە"دوو ئوتومبێلمان ناردووە بۆ (بۆڵێ) و (پشت ئاشان){بارەگای سەرەکی(ح.د.ك.ا) لێ بوو}، بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی

---

[1] رێکخراوێکی سەر بە بزوتەوەی کوردییە لە باشووری کوردستان و لە ساڵی ١٩٨٣ لە لایەن ئەدهەم عوسمان بەرزانی لە شارۆچکەی نەغەدە لە ئێران پێکهاتوەو ئەندامەکانی لە بەرزانییە ئاوارەکانی ئێران بوون. لە دوای راپەرین بارەگایان لە شارۆچکەکانی دیانەوو چۆمان و حاجی ئۆمەران هەبوو. هاوکات نوسینگەیان لە ئێران هەبوو. دواتر چونە ناو (پ.د.ك). ارکان حمه امین الزرداوی، ص ١٥٩.

[2] منظمة حقوق الانسان فی كردستان: ١ حزیران ١٩٩٥، اربیل.

[3] فەرهاد عێراقی: کوردستانی عێراق و تیرۆری نەیارانی سیاسی ئێرانی، ٢٠٠١، ل ١٦.

[4] کریس کۆچیدا، بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد هیوای سەربەخۆیی، بەرگی یەکەم، ل ١٥٧.

[5] عەبدول رەحمان قاسملۆ هاورێکەی: پەنجا ساڵ خەبات لە پێناوی کوردستان، ل٦١٦

لەسەر معارەزە، بەڵام چاویان پێ نەکەوتبوو، بەڵکو چاویان بە خێڵەکانی ناوچەکە کەوتبوو وە پەیمانیان داوە، کە لە ناوچەکەی خۆیان دەریان بکەن"[1].

ئێران بەردەوام لە دانیشتنەکاندا چەند داواکارییەکی لە پارتە کوردییەکانی عێراق هەبوو، لەوانە لە ڕێگای ئەمانەوە داوای دەکرد، کە پارتە ئێرانیەکان چەك دابنێن، سەرۆکی دەزگای هەواڵگری (جەعفەر رەحیمی)و سەرۆکی دەزگای هەواڵگری سوپای پاسداران لە ڕێگای بارزانیەوە داوایان لە (ح.د.ك.ا) کردبوو، کە چەك دابنێن. هەروەها بەردەوام داوای لە حزبە کوردییەکانی هەرێم دەکرد، کە بارەگاکانی پارتە ئێرانیەکان لەسەر سنووری ئێران بۆ قوڵایی هەرێم دوور بخەنەوە، جگە لەمە فشاریان دەخستنە سەر بۆ داخستنی ئیزگەکانیان‌و هەروەها ئێران لە ڕێگای پارتە کوردییەکانی هەرێمی کوردستانەوە فشاریان حستونەتە سەر بۆ ڕاگرتنی پەیوەندیەکانیان بە دەوڵەتانی ئەوروپاو ئەمریکاوە[2].

ئەم داواکاریانەی ئێران پێش شەری ناوخۆ وەڵامدانەوەیەکی پێویستی لە لایەن دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان نەبوو. نەك هەر ئەوە، بەڵکو پارتەکانی هەرێمەکەو حکومەتی هەرێم‌و پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بە توندی ئیدانەی ئێرانیان کرد لە ئەنجامی تیرۆرکردنی سادقی شەرەفکەندی لە بەرلین[3]، هەر بۆیە ئێران ڕاستەوخۆو بە بێ یاریدەی هەرێمی کوردستان هێرشی دەکردە سەر بارەگاکانی پارتە ئێرانییەکان، بە بەکارهێنانی فرۆکەو تۆپخانەو هەندێك جار سوپای زەمینی، وەك بە درێژای ساڵی (١٩٩٣) ئەم کارەی ئەنجام دا. دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان‌و دانیشتوانەکەی بندەستیان درێخییان لە یارمەتیدانی مرۆیی ئەو پێشمەرگەو خێزانانە نەدەکرد، کە کەوتبوونە بە شاڵاوی سوپای ئێران، لە ڕووی سەربازیشەوە ڕووبەڕووبونەوەی سەربازی لە نێوان سوپای هەرێمی کوردستان‌و سوپای ئێران ڕوویداو لە هەردولا دیل و دەسبەسەر هەبوو[4]. شاندی (ح.د.ك.ا)

---

[1] وثائق الادانة: وثيقة رقم: (٧٦)

[2] کریس کۆچیدا، بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد هیوای سەربەخۆیی، بەرگی دووەم، ل ل١١٧-١١٨.

[3] کوردستانی نوێ "رۆژنامە"، ژمارە(١٩٦)، ١٩٩٢/٩/٢١.

[4] کوردستانی نوێ "رۆژنامە"،(٤٤٧)، ١٩٩٣/٧/٢٨

بۆ لای هەردوو پارتی دەسەڵاتدارانی هەرێم وەڵامی ئەرێنییان وەرگرتبوو بۆ پشگیری کردنیان. عەبدوڵای حەسەن زادە لەو بارەیەوە دەڵێت: " دیموکرات شاندێکی ناردە لای یەکێتیو پارتی، شاندەکە چووەی لای کاك کۆسرەتو پێی وتین: " مام جەلال لێرە نییە، با کاك مەسعود لە جیاتی مام جەلال فەرمان بدات". دواتر چوینە لای کاك مەسعود، ئەو پێی وتین" هێزەکانی یەکێتیو پارتی لەژێر فەرمانی حزبی دیموکراتدان، ئەگەر پێویستیشی کرد بۆ خۆشم وەك پێشمەرگەی حبزبی دیموکرات بەرامبەر پەلاماری ئێران دەچمە سەنگەر"[1].

ئەم هەڵوێستەی هەرێمی کوردستان تا دەسپێکردنی شەری ناوخۆ لە ساڵی (١٩٩٤) بەردەوام بوو، بەڵام بە سەرهەڵدانی شەر، فشارەکانی ئێران بۆ سەر (ی.ن.ك) زیاتر بوو، چونکە ئەم پارتەی پێشوو داوای هەڵوێستی بێلایەنی ئێرانی دەکرد لە شەری ناوخۆ، دواتر لەژێر پاڵەپەستۆی گەرموگوڕ بونی شەڕ، هەر ئەم پارتە داوای پاڵپشتی سیاسیو سەربازیو ئابووری لە ئێران دەکرد، مەرجی سەرەکی ئێرانیش کپ کردنی پارتەکانی ئێران بوو.

(ی.ن.ك) هەوڵی دەدا کە بالآنسێك رابگرێت لە نێوان داواکارییەکانی ئێرانو فشار خستنە سەر پارتە ئێرانییەکان، لە لایەك داوای لە ئێران دەکرد، کە هەڵوێستی نیشتمانی پارتەکەی رێگە نادات هێندە فشار بخاتە سەر (ح.د.ك.ا)و کە بە هۆیەوە ئەو پارتە ئێرانییە روو بکاتە ناوچەکانی بن دەسەلآتی (پ.د.ك). کە ئەمەش لە قازانجی پێگەی سیاسی (ی.ن.ك) نابێت. لە لایەکی تر فشاری دەخستە سەر ئەو حزبە واتە (ح.د.ك.ا)، بۆ ئەوەی دەسبەرداری کاری چەکداری بێتو رازی بێت بە دانوستان لەگەڵ ئێراندا[2]. (ی.ن.ك) لەم هەولآنەی خۆی بەردەوام بوو، بەڵام بە گەرمبوونی جەنگی ناوخۆو توند بونی گەمارۆ ئابووریەکانی (پ.د.ك) لەسەر ناوچەی (ی.ن.ك)، ئەم پارتەی دوایی رێگای بە سوپای پاسدارانی ئێراندا، کە لە خاڵی سنوری باشماخەوە هێرش بکەنە سەر (ح.د.ك.ا) لە شارۆچکەی کۆیە، لە ٢٧ی یۆلیۆی ١٩٩٦. لەم بارەیەوە فوئاد معسوم کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك) بوو وتی، "ئێمە پێشتر دەمانزانی کە دێن(مەبەستی سوپای ئێرانە)، بەڵام نەماندەزانی کەیو چۆن.

---

[1] عەبدول رەحمان قاسملۆو هاورێکەی: پەنجا ساڵ خەبات لە پێناوی کوردستان، ل ل٦١٠-٦١١

[2] الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، کیف اندلع ومن المسؤل عنه، ص٣٤٩-٣٥٠.

ئێران وتبوی ئەگەر ئەوان چارەسەری دیموکرات (ح.د.ك.ا) نەکەن ئەوا خۆیان دێنو ئەو کارە دەکەن.ئێمە بە دیموکراتمان گوتبوو کە دەبێت بە شێوەیەك کار بکەن کە ئێران شەڕی ئابووریمان نەکات. بە تایبەت ئێمە هیچ ڕێگەیەکی دیکەمان بۆ هێنانی کەلوپەلو هاتوچۆو چارەسەری نەخۆشو بریندارنیە"[1].

ئەم پرۆسەیەی ئێران دوو ئەنجامی لێکەوتەوە، یەکەمیان ڕێکەوتنامەی نێوان (ی.ن.ك)و (ح.د.ك.ا) بوو لەسەر ئەوەی، کە (ی.ن.ك) ئاسایشی بارەگاو ئەندامەکانی (ح.د.ك.ا) لە هەرێمی کوردستان دەپارێزێت لەبەرامبەردا ئەم پارتەی دوایی بەرنامەی کارو تێکۆشانی دووبارە دابڕێژێتەوە بە شێوەیەك، کە بەرژەوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو ئێران بپارێزێت[2]. ئەنجامی دووەم ئەوە بوو، کە ئێران لەبەرامبەر ڕێگەخۆشکردنی (ی.ن.ك) بۆ پرۆسە سەربازییەکەی، پشگیری لۆجستی (ی.ن.ك)ی کرد لە جەنگی ناوخۆدا. ئەم پشگیریە هۆکاری سەرەکی بوو بۆ نزیکبونەوەی (پ.د.ك)و بەغداد، کە بە هۆیەوە لە ٣١ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦، سوپای عێراقی هەولێری داگیر کردو رادەستی (پ.د.ك) کرد. هێزی (ی.ن.ك) لەبەردەم ئەم هاریکاری بەغدادو (پ.د.ك) خۆی بۆ ڕانەگیراو لە ماوەی ١٠ ڕۆژدا سەرجەم ناوچەی دەسەلاتی خۆی لەدەستداو چونە سنوری ئێرانەوە[3].

( ی.ن.ك) لە جەنگی ناوخۆدا بەردەوام لەژێر فشاری ئێراندا بوو بۆ سنوردارکردنی چالاکییەکانی (ح.د.ك.ا). ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٩٨و دوای هاتنی سەرۆك کۆماری نوێ محەمەد خاتەمی، توانی شاندێکی ئێران لەگەڵ کەسایەتی سیاسی کوردی ئێران، سەلاحەدینی موهتەدی کۆبکاتەوە، لە بنکەی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) لە قەلاچوالان بۆ گرتنە بەری چۆنیەتی دەسپێکردن بە دانوستان لەگەڵ پارتە ئێرانییەکان. ئەم هەوڵە بە پارتە ئێرانییەکان ڕاگەیەنراو بوو بە هۆی ناکۆکی لەسەر چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ دانوستاندا. لە ناو کۆمەڵەی ئەم ناکۆکیانە لە نێوان ڕەوتی پاڵپشتیکەر لە دانوستانو ڕەوتی

---

[1] کوردستانی نوێ. ڕۆژنامە. ژمارە (١٣٥٢)، ١٩٩٦/٨/٦

[2] کوردستانی نوێ. ڕۆژنامە. ژمارە (١٣٥١)، ١٩٩٦/٨/٥

[3] **جوناثان راندل: امة فی شقاق، ص٢٨٨.**

دژایەتی کردنی دانوستان پەیدابوو کە دواتر بوو بەهۆی دابەشبونیان بۆ دوو بەش[1]. لە ناو (ح.د.ك.ا) ئەو دانوستانە رەتکرایەوە چونکە دوو سکرتێری پارتەکەیان لە میانی دانوستاندا تیرۆر کرابوون. بەلاّم لە ناو کۆمەڵەدا ناکۆکی دروست کردوو کە بەهۆیەوە دابەشبون رویداو پارتێك بە ناوی (کۆمەڵەی شۆرشگێرانی زەحمەتکێشانی کوردستان) لە کۆمەڵە جیابونەوەی خۆیان لە ساڵی ۱۹۹۹ راگەیاند[2]. لە سەرو بەندی هەڵسەنگاندنی دانوستان لە لایەن پارتە ئێرانییەکان، رەوتی توندرەوی ئێران و ئەفسەرەکان گەیشتنە هەرێمی کوردستان، کە دانوستانیان لەگەڵ هێزە کوردییەکان هەڵوەشاندەوە[3].

[1] حەسەن رەحمان پەنا: عەبدولای موهتەدی بە واتایەکی دیکە، وەرگێرانی: جەلال حەسەن زادە، ئینتشاراتی مەرکەزی کۆمەڵ، ۱۳۸۹، ل۱۰.

[2] بەهمەن سەعیدی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل ۲۹۹- ۲۳۱.

[3] چاوپێکەوتن لەگەڵ سەلاحەدینی موهتەدی. ۱۱ی یۆنیۆی ۲۰۱۰.

# بەشی سێیەم

## پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان و تورکیا

-تەوەری یەکەم-تورکیا لە کۆتایی سەدەی بیستدا.

-تەوەری دووەم- پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و تورکیا (١٩٩١-٢٠٠٣)

-تەوەری سێیەم-کێشەی کورد لە تورکیا

-تەوەری چوارەم- پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا

# تەوەری یەکەم
# تورکیا لە کۆتایی سەدەی بیستدا

کۆماری تورکیا لە سەرەتای نەوەدەکاندا زیاتر هەنگاوی بەرەو کرانەوە هەڵهێناو خاوەن ڕۆڵو پێگەی سیاسی بەهێز بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەو فاکتەرانەی وایانکرد تورکیا خۆی لەم بارە نوێیەدا ببینێتەوە ئەمانەی خوارەوە بوون:

یەکەم: جوگرافیای سیاسی

تورکیا ڕووبەرەکەی (٧٧٩.٤٥٢) کم دووجایە. (٩٦، ٩٦٪) لە کیشوەری ئاسیایە، کە بە ئەنەدۆڵ ناو دەبرێت، (٣.٠٤٪) لە ئەورووپایە کە بە تراقیا ناو دەبرێتو گەروەکانی بەسفۆرو دەردەنێل دەکەوێتە نێوان هەردوو بەشەکە. گرنگی تورکیا لە ڕووی جوگرافییەوە لەوەدایە، کە ڕێگای سەرەکی نێوان ئاسیاو ئەورووپایە لە وشکانیدا. ئەمە وایکردوە ببێتە پردێك لەو نێوەندەدا، هەروەها لە ڕۆژهەڵاتەوە بەستراوەتەوە بە بانی ئێرانو لە باشوریشەوە بە نیشتمانی عەرەب، کە ڕۆڵی ناوەندی ئێرانی عەرەبی بۆ دروست بووە. هاوکات جوگرافیای تورکیا بووەتە بەربەستێك لەبەرامبەر کشانی دەوڵەتی ڕوسیا بۆ دەریای ناوەڕاستو ناوچە نەوتییەکانی کەنداوی عەرەب. پێگەی ئاویی تورکیاش شێوەی نیمچە دورگەیەکی گەورەی پێبەخشیوە. دەریای ڕەش لە باکورو دەریای ئیجە لە ڕۆژئاوا، دەریای ناوەڕاست لە باشور وایکردووە کە ٢٦١٥ کم کەناری ئاوی هەبێت. گەروەکانی دەردەنێلو بەسفۆر کە تورکیا بەسەریدا دەڕوانێت، وایکردووە کە کۆنترۆڵی ئەو دەوڵەتانەی، کە لەسەر دەریای ڕەشن بە تایبەت ڕوسیا بەڕووی دەریای ناوەڕاستدا بگرێتە دەست. هەموو ئەمانە

وایكردووە كە یەكێك بێت لە ناوچە زیندووەكانی جیهان، هەروەها بووەتە هۆی ئەوەی كە سیاسەتی توركیا، چ لەرووی جیهانیو چ لە رووی ناوچەییەوە كاریگەری تایبەتی هەبێت[1].

لەرووی ئابوریشەوە، درێژی كەنارە ئاوییەكانی توركیا، كە دەروانێت بەسەر دەریای ناوەراست، پێگەیەكی ئابووری گرنگی پێبەخشیوە. كەنارە ئاوییەكان لە تێروانینی (جوگرافیای سیاسی)یەوە توركیای كردۆتە خاوەن سامانێكی ئابوری دینامیكی، چونكە لە رێگای كەنارەكانەوە دەسەلاتی بەسەر لوولە نەوتییەكانی رۆژهەلاتی ناوەراستدا بۆ پەیدا بووە[2]. توركیا لە باكوورەوە هاوسنوری ناوچە نەوتییەكانی روسیایە ، لە رۆژهەلاتیەوە بیرەكانی ئێرانە ، بیرەكانی دەوڵەتە عەرەبییەكانیش كەوتووەتە خوارویەوە. بۆیە دەوڵەتە رۆژئاواییەكان لە رێگای هاوپەیمانی ناتۆوە مەبەستیانە توركیا بەشدار بكەن لە پێناو مانەوەی هەژمونی خۆیان بەسەر سەرچاوە نەوتیەكانی ناوچەكەدا. ئەم پێگە ئابوریو جوگرافییەدا، بایەخی سەربازی توركیای بەرزكردووەتەوە. سەركردەی بالای هێزەكانی هاوپەیمانان لە ئەوروپا (جەنەراڵ ئەلكسەندەر هیگ) دەلێت: "پارێزگاریكردن لە رۆژهەلاتی توركیا دەبێتە هۆی پاراستنی سەرچاوە نەوتییەكانی رۆژئاوا لە رۆژهەلاتی ناوەراستو كەنداوی عەرەبیدا، كە بە تەواوی پشت بە سوپای توركی دەبەستێت". لەرووی جوگرافیای سیاسیشەوە توركیا لە چەقی بازنەیەكدایە كە پێكهاتووە لە ناوەراستی ئەوروپاو سوریاو عێراقو ئێرانو دەریای رەشو روسیادا، كە ناوچەیەكی زیندووی ستراتیجییە[3].

دووەم: سەركردایەتی توركۆت ئۆزاڵ[4]

---

[1] عبد الزهرة شلش العتابي: توجهات تركيا نحو اقطار الخليج العربي، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٢، ص ص٢٠-٢٤ . احمد داود اوغلو: العمق الاستراتيجي، موقع تركيا ودورها في الساحة الدولية، ت: محمد جابر الثلجي وطارق عبدالجليل، مركز جزيرة للدراسات، الدوحة،٢٠١٠، ص١٤٢.

[2] عبد الزهرة شلش العتابي: المصدر السابق، ص ص ٣٤-٣٥.

[3] المصدرنفسه: ص ٣٢-٣٣

[4] توركۆت ئۆزاڵ (١٩٢٧-١٩٩٣)، لە مەلاتیە لە دایك بووە، دەرچوی بەشی كارەبا لە كۆلیجی ئەندازیاری سەر بە زانكۆی تەكنیكی ئەستەمبوڵە لە ساڵی ١٩٥٠. لە ساڵی ١٩٨٣ سەركردایەتی پارتی

لەم ماوەیەدا لەسەر دەستی ئۆزاڵ، تورکیا ئەزموونی کرانەوەی بەرووی ڕۆژهەڵاتدا بەخۆوە بینی، هەر لەژێر سایەی ئەمدا ئیسلامی سیاسیو بزوتنەوەی کوردی لە ئاستی ناوخۆدا زۆر چالاکانە لە هەڵبژاردنو لە حکومەتدا ڕکەبەری هێزە عەلمانییە نەتەوەییەکانیان دەستپێکرد، دواجار سوپای تورکیاش ئەوپەڕی چالاکیی خۆی لە ناو خۆوو دەرەوەی تورکیا نواند. هەر ئەمە وادەکات، کە ماوەی دەسەڵاتی ئۆزاڵ وەك سەرۆکی حکومەت (١٩٨٣–١٩٨٩) هەروەها وەك سەروك کۆمار(١٩٨٩–١٩٩٣) بە "سەردەمی ئۆزاڵی" ناو ببرێتو خودی ئۆزاڵیش لە دوای کەمال ئەتاتورك (١٩٢٣–١٩٣٧) بە دووەمین مۆدێرنگەرای تورکیا ناو ببرێت[1].

گۆڕانکارییەکانی ئۆزاڵ لەسەر دوو ئاست بوو، ئاستی ناوخۆییو ئاستی دەرەکی. لە ئاستی ناوخۆیدا تێروانینی بۆ کێشە ناوخۆییەکان لیبراڵیانە بوو، کە بۆ سێ بەش دابەشی کردبوو، ئەوانیش ئازادی بیر کردنەوە، ئازادی ئاینی، ئازادی ئابووری. ئەو لە ماوەی سەرۆکایەتی کردنی حکومەتدا توانی بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانی سۆزی جەماوەر بۆخۆی رابکێشێت، بە تایبەتیش ئەو جەماوەرەی، کە لە ناوەڕاستی ئەنادۆڵ بوونو بە درێژایی مێژووی کۆماری تورکیا لە پەراوێزی گرنگی پێدانی دەسەڵاتدا بوون، بۆیە لەڕێگای خۆ نزیك کردنەوە لە سەرمایەدارەکانی ئەو ناوچەیەو گروپە کۆنە پارێزەکانی بواری سیاسەتو کۆمەڵگا هەوڵەکانی لەپێناو فراوانکردنی بنکەی جەماوەری خۆی، خستبووەگەڕ. لە وتە دیارەکانی ئۆزاڵ بریتی بوو لە (خزمەتکردنی خەڵك، خزمەتکردنی خوا). لەم ڕێگایەوە توانی مەیلی زۆرینەی خەڵك بەلای خۆیدا کێش بکاتو دەستەبژێرێکی نوێ لە تورکیا، کە زیاتر ئیسلامخوازی نەتەوەیی بوون، دروست بکات. ئەم ڕاستیانە لە کاتی مردنی ئۆزاڵ بە تەواوی

---

نیشتمانی دایکی کردووە (Ana Vatan Partisi)و توانیویەتی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٣ و ١٩٨٧دا، سەرکەوتن بەدەست بهێنێتو لە ١٣ی سێپتەمبەری ١٩٨٣–٩ی نۆڤەمبەری ١٩٨٩ بە بێ هیچ هاوپەیمانێك حکومەتی پێکهێناوە، لە ساڵی ١٩٨٩ بووەتە سەرۆکی کۆمار، لە ١٧ی ئەپریلی ١٩٩٣ مردووە. http://ar.wikipedia.org

[1] ئیریك جەی. زوچەر: مێژووی هاوچەرخی تورکیا. و: یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیڤا، سلێمانی، ٢٠٠٩. ل٤٦٩

دەرکەوت، کاتێك زیاتر لە یەك ملیۆن کەس ئامادەی مەراسیمی ناشتنەکەی بوون و دروشمە ئیسلامییەکانیان دەوتەوە. ئۆزاڵ بیروڕاکانی خۆی بەم شێوەیە دەربڕی بوو:" ئێمە وڵاتێکی ئیسلامین، هاوکات پردی پەیوەندیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاواین و پێویستمان بە زانست و تەکنیك و تێگەیشتنی رۆژئاوا هەیە. بەڵام هاوکات دابونەریتی خۆمان هەیە، کە رۆژئاوا نییەتی". هەموو ئەم شتانە لە لایەن دەستەبژێری باوی تورکیا بە دەستکاریکردنی حەرامەکانی سیستەمی کۆماری تورکیا دادەنرا. دەستەبژێری کەمالی کە زیاتر نوێنەرایەتی دانیشتوانی ئەستەنبوڵ و شارە کەناریەکانی دەریای رەش و دەریای ناوەڕاستیان دەکرد، بە خۆیان دەوت تورکە سپییەکان و دانیشتوانی ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵیان بە تورکە رەشەکان ناودەبرد، بە چاوێکی سوك سەیری جەماوەری ئۆزاڵ و هەتا خودی ئۆزاڵیشیان دەکرد و تانەیان لێدەدا، کە بە سمێڵێکی گەورەوە سەرۆکایەتی دەوڵەتی تورکیا دەکات و پێیان وابوو نموونەی دواکەتوییە و هەمان کات کەسێکی ئیسلامی و جووداخوازە[1].

گۆرانکارییەکانی ئۆزاڵ لە ئاستی دەرەکیدا هاوکاتی دوو رووداوی گرنگ بوون کە لە سەرەتای نەوەدەکاندا بەسەر جیهاندا هات ئەویش دووەمین جەنگی کەنداو و هەروەها رووخانی یەکێتی سۆڤیەت بوو لە ساڵی ١٩٩١دا. ئەم دوو رووداوە ئۆزاڵی خستە سەر هێڵێکی چالاك لە پەیوەندییە دەرەکییەکاندا. لێرەدا ناتوانین ئەوە بە تەواوی یەکلا بکەینەوە، کە ئایا روداوە نێودەوڵەتییەکان کاریگەر بوون بۆ ئەوەی ئۆزاڵ سیاسەتی دەرەوەی تورکیا چالاك بکات، یاخود خودی بۆچوونەکانی ئۆزاڵ بوو، کە داهێنەری گۆرانکاری بوو لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا، بەڵام دەتوانین ئەوە بڵێین، کە لە سەروبەندی روخانی یەکێتی سۆڤیەت و دوومین جەنگی کەنداودا، ئۆزاڵ توانی وەك پاڵەوانێك خۆی بنوێنێت.

سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بە درێژایی مێژووی کۆماری تورکیا بریتی بوو لە پشت کردنە رۆژهەڵات و روو کردنە رۆژئاوا و بەستنی هاوپەیمانی سیاسی و ئابووری و سەربازی لەگەڵ

---

[1] Muhittin Ataman: Leadership Change: Ozal Leadership and Restructuring in Turkish Foreign Policy Alternatives. Turkish journal of international relations. Volume 1 number 1 spring 2002. P6.

ڕۆژئاوا، بەمەش تورکیای لە ڕۆژهەڵاتدا کەنارگیر کردبوو. ئۆزاڵ ئـەم نەریتـەی گـۆڕی‌و ڕووی تورکیای لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات وەرچەرخان. ئۆزاڵ باوەڕی وابوو کە تورکیا پێویستە "پێگەی راستەقینە"ی خـۆی لـە جیهـانی ئیسـلامی‌و ڕۆژهـەڵاتی ناوەراسـتدا هـەبێت، ئـەو کاتەش تورکیا دەبێتە پردێك لە نێوان ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا، کە چـۆن پـەیوەندییـەکانی لەگـەڵ ڕۆژئـاوا باشـە بەهـەمان شـێوە لەگـەڵ ڕۆژهـەلاتیش وابێـت. کەسـێتی ئـۆزاڵش کـە لـە ژێـر کاریگەری ئاینی ئیسلام‌و ڕێبازی لیبرالی ئابووری ئەمریکیـدا بـوو، هۆکـار بـوو بـۆ باشـکردنی پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ ولاتانی بەلکان‌و ئاسیای ناوەڕاسـت‌و ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت‌و دەوڵەتەکانی قەفقاس. ئامانجیشی ئەوە بوو تورکیا بکاتە سـەنتەری سیاسـی‌و ئـابوری ئـەو دەوڵەتانە[1]. هەر ئەمەشە وادەکات کە تورکیا لـە سـەردەمی ئۆزاڵـدا بـە دووەمـین کۆمـاری تورکیا ناو ببرێت، چونکە تورکیا لە سەردەمی ئۆزاڵدا لـە سیاسـەتی نـاوخۆو دەرەوەدا زۆر جیاواز بوو لە کۆماری یەکەمین، کە کەمال ئەتاتورك دایمەزراندبوو[2].

سێیەم: ڕووداوە نێودەوڵەتییەکان

گرنگترین روداوی نەوەدەکان بریتی بووله هەڵوەشاندنەوەی یـەکێتی سـۆڤیەت لـە سـاڵی ١٩٩١دا، کە جیهانی لە دوو جەمسەرییەو کرد بـە یـەك جەمسـەر، ڕووداوێکـی تـر بـەرپابونی دووەمین جەنگی کەنداو بوو لە یەنایری ١٩٩١، کە ئەمریکای کـردە تاکـە زلهێـزو سیسـتەمی نوێی جیهانی بەسەرکردایەتی خۆی ڕاگەیاند. لـە بەرئـەنجامی ئـەم دوو روداوەدا پارسـەنگی هێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت گۆرانکـاری گـەورەی بـەخۆوە بینـی. تورکیـا، کـە وەك گـەورە هێزێکی هاوپەیمانی ناتۆو وەك دەوڵەتێکی سەنتەر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، زۆر بە خێرایی لە بەرامبەر کێشەی کورد لـە هـەرێمی کوردسـتان‌و کێشـەی ئەرمـەن‌و کۆمارەکـانی ئاسـیای ناوەڕاست‌و قەفقاس‌و وردە دەوڵەتەکانی بەلکان خۆی بینییەوە. تورکیا بۆ ئـەم کێشـانە بـە سەرکردایەتی ئۆزاڵ بیری "عوسمانی نوێ"ی هێنایە بەر باس، کـە مەبەسـتی ئـەوە بـوو بـە

---

[1] Muhittin Ataman: op.cit. P7.

[2] محمد نورالدین: ترکیا فی الزمن المتحول: قلق الهویة و صراع الخیارات، ریاض الریس للکتب والنشـر، لبنان،١٩٩٧،ص ١٨-١٩.

وێنەی دەوڵەتی عوسمانی، تورکیا رۆڵێکی کاراو زیندوو ببینێت، هەر لە بەلکانەوە دەسپێبکاتو لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە تێپەڕ بکاتو تا سنووری شورای چین بگات[1].

روخانی یەکیەتی سۆڤیەتو بەزینی عێراق لە دووەمین جەنگی کەنداودا ئەو باوەڕەی لای تورکیا دروستکرد، کەهەلومەرج بۆ خۆدەرخستنی وەك هێزێکی گەورە لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لەبارە. لێرەوە تورکیا قۆناغی یەك ئاراستەیی رووەو رۆژئاوایی لە سیاسەتی دەرەوە تێپەڕاند، کە تەنها گرنگی بە پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکاو ئەوروپا دەدا، بەڵکو لە پاڵ رۆژئاوادا سیاسەتی فرە ئاراستەیی پەیڕەو کرد. ئەوەی یارمەتیدەری ئەم سیاسەتە بوو لە لایەکیش بەستنی بوو بە هاوپەیمانی سیاسیو سەربازی لەگەڵ رۆژئاوا هاوکات سود وەرگرتن بوو لە بیری پان تورکیزم رووەو ئاسیای ناوەڕاستو هەروەها کلتوری عوسمانی ئیسلامی رووەو رۆژهەلاتی ناوەڕاست کە توانی بە درێژایی نەوەدەکان رۆڵی (دەوڵەتی ناوەند–راگری بالآنس–بنکەی سەربازی) لە ناوچەکەدا ببینێت[2].

---

[1] گراهام فۆللەرو ئەوانی تر: جیۆپۆلەتیکی نوێی تورکیا، وەرگێرانی: عەتا قەرەداغی، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١١١

[2] عقيل سعيد محفوض: سورية وتركيا الواقع الرهن واحتمالات المستقبل، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٩، ص ص١٩٢–١٩٤

# تەوەری دووەم

# پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و تورکیا

عێراق و تورکیا وەك دوو دەوڵەتی هاوسێ کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش و بەرژەوەندیی هاوبەش کۆی کردونەتەوە، تورکیا بۆ عێراق ئەو پردەیە، کە دەیبەستێتەو بە ئەوروپاوە، هاوکات عێراق جگە لەوەی بازاڕێکی باشە بۆ کالآی تورکی، ئەو پردەیە، کە تورکیا بە دورگەی عەرەبی دەبەستێتەوە. تورکیاو عێراق هیچ کێشەی سنووریان نییە، وەك ئەوەی لە نێوان تورکیاو سوریا هەیە، ئەویش بەهۆی کێشەی لیوای ئەسکەندەرۆنەوەیە. هەروەها ئەگەرچی تورکیا لەگەڵ ئێران ناکۆکن بەهۆی جیاوازیی بیرو باوەری دەوڵەت، بەلآم عێراق و تورکیا لە ئایدۆلۆجیەتی دەوڵەتدا بێ کێشەن و عێراق عەلمانیەتی تورکیا بە بارێکی ناوخۆیی تورکیا دەزانێت. خاڵێکی تری هاوبەشی نێوان عێراق و تورکیا کێشەی کوردە، ئەم دوو دەوڵەتە بەدەست ئەم کێشەیەوە دەناڵێنن و هەست بە هەرەشەیەکی توند دەکەن بەهۆی ئەم کێشەیەوە، بۆیە ئارەزوی گۆڕینەوەی یارمەتییان زۆرە[(1)]. ئەگەرچی عێراق، بەهۆی دووەمین جەنگی کەنداو رۆڵێکی گرنگی لە گەمەی نەوت لە جیهاندا دەستدابوو، بەلآم تورکیا گرنگی بە عێراق دەدا، لەو روانگەیەوەیە، کە لە داهاتودا ئەم دەوڵەتە رۆڵێکی گرنگ لە

---

[1] حامد محمد طه أحمد السويداني: العلاقات العراقية التركية ١٩٨٠-١٩٩٠، رسالة الماجستير غيرمنشورة، قسم التاريخ، كلية التربية، جامعة الموصل، ٢٠٠٣، ص ص٦٧-٦٨.

گەمەکەدا دەبینێت[1]. ئەم دوو دەوڵەتە چەندین رێکەوتن لە بواری ئاسایشو بازرگانیو ئابوری لە نێوانیاندا هەبوو، بەلاًم لە دوای داگیرکردنی کوەیت لە ٢ئۆگستۆسی ١٩٩٠، پەیوەندیەکانی تورکیاو عێراق بە ساردترین قۆناغدا گوزەری کردو تا روخانی رژێمی سەدام حسین لە ٩ی ئەپریلی ٢٠٠٣ درێژەی کێشا.

دەتوانین پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت لە سەرەتای قەیرانی داگیرکردنی کویت تا رووخانی رژێمی بەغداد(١٩٩٠-٢٠٠٣)، بەسەر سێ قۆناغدا دابەش بکەین:

یەکەم: قۆناغی دابڕان لە پەیوەندییەکان (١٩٩٠-١٩٩٣)

ئەم قۆناغە تایبەت بوو بە نەبوونی سەرجەم پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیا. ئۆزال بەئاشکرا لە کاتی دووەمین جەنگی کەنداو، داوای ڕووخانی رژێمی عێراقی کردو لەگەڵ لێدانی سەربازیو دژی بەکارهێنانی چارەسەری دیپلۆماسی بوو،ئەو پێی وابوو کە ئەستەمە بتوانێت باوەڕ بەمانەوەی سەرۆکێك بکات لەماوەی (١٢)ساڵدا (واتە ١٩٧٩-١٩٩١)، (٩)ساڵ گەلەکەی خستبێتە جەنگەوە[2].

هەڵوێستی تورکیا لە دوومین جەنگی کەنداو لە یەك ئاستدا نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی پلە بە پلە هەڵوێستی توند تر دەکرد. لە یەکەم رۆژی داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە لە ٢ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠، سەرەك وەزیرانی پێشووی تورکیا یەڵدرم ئاکبوڵت (٩نۆڤەمبەری١٩٨٩-٢٣یۆنیۆی١٩٩١)، وتی: "کێشەکە دڵەراوکێیەکی زۆری دروست کردووە، هیوادارم قەیرانەکە لە ماوەیەکی کەمدا نەمێنێت، چاوەرێی گەڕانەوەی خاكو سەروەری کوەیت دەکەین". لەم لێدوانانەدا تورکیا نەرمییەکی پێوە دیار بوو ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە تورکیا لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی کوەیتو عێراق خاوەن پەیوەندییەکی باشی سیاسیو ئابووری بوو، هاوکات ئەگەری چارەسەرکردنی کێشەکە لە کەناڵە

---

[1] Reşat Arım: Foreign Policy Concepts Conjuncture, Freedom of Action, Equality Ambassador (Rtd.) Dış Politika Enstitüsü – Foreign Policy Institute Ankara, 2001. P31.

[2] Amikam Nachmani: Turkey In The Wake of The Gulf Ware ،1999.www.faind articles .com.

دیپلۆماسییەکانی جیهان‌و ناوچەکە هێشتا لە ئارادا بوو[1]. جگە لەوەی، کە تورکیا چاوەڕێی کاردانەوە جیهانییەکان بوو وێرای ئەمە بەهۆی کتوپڕی ڕووداوەکەوە، خاڵی سەرەتایی بەرژەوەندییە بالآکانی لەم قەیرانەدا لەلا روون نەبوو.

تورکیا لەو جەنگەدا چاوەڕێی بەدەستهێنانی زۆرترین بەرژەوەندی بوو. دوای یەك ڕۆژ لە دەرچونی بڕیاری ژمارە (٦٦٠) نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠، کە داوای لە عێراق کرد بە بێ هیچ پێش مەرجێك لە خاکی کوەیت بچێتە دەرەوە، لەسەر ئەم پرسە ئۆزاڵ‌و سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆشی باوك (١٩٨٩-١٩٩٣)، گفتوگۆو راوێژێك لە نێوانیاندا دروست بوو. تورکیا دەیویست بۆ بەدەسهێنانی ئیمتیازی سیاسی‌و ئابووری ئەم هەلە لەدەست نەدات‌و بێ بەرامبەر نەچێتە بەرەی ئەمریکا، بۆ ئەم مەبەستە هێڵی نەوتی عێراق تورکیای دانەخست، جگە لەمە لە ٥ی ئۆگستۆسدا پێشوازی لە جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیرانی عێراق تەها یاسین رەمەزان[2]، کرد، کە بۆ مەبەستی ئەوە هاتبوو تورکیا لە شەرەکەدا بێلایەن بێت‌و هێڵی نەوتی دانەخات. وێڕای ئەمەش ئەنکەرە رێگای بە بەکارهێنانی ئەنجەرلیك نەدا بەو بیانووەی ئەو بنکەیە تەنها بۆ کاروباری ناتۆ بەکار دێت‌و عێراق لە سنوری گرنگی دانی ناتۆدا نییە[3].

خاڵی دەسپێك لە هەڵوێستی دژ بە عێراق لە لایەن تورکیاوە لە ڕۆژی ٦ی ئۆگستۆس دەسپێدەکات، کە بڕیاری ژمارە (٦٦١) ی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٦ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠، دەرچوو، گەمارۆی ئابووری بەسەر عێراقدا سەپاند. ئەمە پاڵپشتێکی یاسایی‌و

---

[1] میثاق خیرالله جلود: العلاقات الخليجية-التركية ١٩٧٣-١٩٩٠، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٨، ص١٦٣.

[2] تەها یاسین رەمەزان (١٩٣٨-٢٠٠٧). لە دایکبوی پارێزگای موسڵە، لە ساڵی ١٩٥٦ پەیوەندی بە حزبی بەعس کردووە. لە دوای ساڵی ١٩٦٨ بووە بە ئەندامی سەرکردیاتی شۆرش‌و پاشان بووە بە سەرکردەی سوپای میللی لە عێراق. پاشان پلەی بەرز بوو تاجێگری سەرۆك کۆمار گەیشت. لە ساڵی ٢٠٠٣ لە لایەن (ی.ن.ك) گیراو پاشان رادەستی سوپای ئەمریکا کرا. لە ساڵی ٢٠٠٧ لە سێدارە درا. http://www.aljazeera.net

[3] ابراهيم محمد حسن: المصدر السابق، ص ١٤٧

نێودەوڵەتی بوو بۆ هەڵوێستی نوێی تورکیا، هاوکات هەر لەم ماوە کورتەدا، هەریەك لە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا جیمس بیکەر[1]، هەروەها وەزیری بەرگری ئەو دەوڵەتە دیك چینی، کۆمەڵێك بەرژەوەندیی سیاسیو ئابوری بۆ تورکیا خستە روو کە دەتوانین بڵێین بەرگێکی نوێی بە قەد بەرژەوەندیە ستراتیجیەکانی نێوان ئەمریکاو تورکیای کردەوە. تورکیا هەر لە سەرەتادا چەند دەسکەوتێکی بەدەست هێنا، (٥٠) فرۆکەی جۆری (F16)ی لە ئەمریکا وەرگرت (١٢) دەبابەی (لیوبارد)ی دروستکراوی ئەڵمانی وەرگرت. لەگەڵ ئەوشدا لەگەڵ ئەمریکا بۆ نوێکردنەوەی سوپاکەی گەیشتە رێکەوتنێك، هەروەها کوەیتو سعودیە (٢) ملیار دۆلاری زیانی تورکیایان لە داخستنی نەوتی عێراقی گرت ئەستۆ. هاوپەیمانی ناتۆ لای خۆیەوە لە ١٨ی ئۆگستۆس ناتۆ بریارێکی دەرکرد بۆ بەرگری کردن لە تورکیا لە کاتێکدا توشی هێرشی دەرەکی بێت، ئەمەش متمانەیەکی باشی بە تورکیا دا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جەنگەکە. دواجار ئەمریکا پشگیری بوون بەئەندامی تورکیای لە (کۆمەڵەی ئەورووپی) کرد، کاتێك لە ١٨ی دیسەمبەری١٩٨٩ داواکەی رەتکرابووەوە[2].

لێرە بە دواوە قۆناغی دووەمی هەڵوێستی تورکیا دەستپێدەکات، ئەویش ئەوە بوو بازرگانی لەگەڵ عێراق راگرت، هەروەها بۆرییە نەوتییەکانی بەست، رێگای لە کەشتیەکی بارهەڵگری خۆراکی عێراقی گرت لە بەندەرەکانیدا بووەستێت، لە لایەکی تر بۆ گونجاندنی ئەم هەڵوێستەی لەگەڵ دەستووری دەوڵەت، ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورکیا گەڕایەوە بۆ مادەی (٩٢) لە دەستوور کە رێگای دەدات، شەر لە کاتی پێویستدا رابگەیەنرێتو

---

[1] جیمس بیکەر لە ساڵی ١٩٣٠ لەدایك بووە. لە ولایەتی تەکساس، دەرچوی زانکۆی تەکساسە لە یاسادا. رۆڵی گرنگی بینی لە ناو لە هەڵمەتی هەڵبژاردنی رۆناڵد ریگان لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکانی ١٩٨١. لە ساڵی ١٩٨٤ بوو بە وەزیری خەزێنە ی ئەمریکی. پاشان لە ١٩٨٩-١٩٩٣ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو. ئێستا سەرۆکی پەیمانگای بیکەرە بۆ پەیوەندی نێوان توێژینەوەی دەزگا ناحکومییەکان لەگەڵ دەزگاکانی حکومەت لە پەیوەندییە سیاسیەکاندا.
http://www.moqatel.com/

[2] Amikam Nachmani :Turkey in the wake of the Gulf war ،www.faind Articles.com.

حکومەت سوپای سەربازی بەکار بهێنێت، بە زۆرینەی دەنگ ئەم مادەیە کارا کراو ئۆزال لەم سۆنگەیەوە لە ٢٢ی ئۆگستۆس رایگەیاند، کە دەوڵەتەکەی ئامادەیە بەشداری سەربازی لە دژی عێراق بکاتو هێز رەوانەی سعودییە بکات. ئەوە بوو لە دوای دەرچوونی بریاری ژمارە (٦٦٥) نەتەوە یەککرتووەکان لە ٢٥ی ئۆگستۆس، رێگای بە بەکارهێنانی هێز لە دژی عێراق دا، ئەنجومەنی نیشتمانی تورکیا لە ٥ی سێپتەمبەر بڕیاری جولاندنی ١٠٠ هەزار سەربازدا، کە لەسەر سنووری عێراقی تورکی وەك خۆ ئامادە کردنێك.بۆ هەر دژە هێرشێکی عێراقی مۆڵ بێن [١].

دەتوانین گرنگترین ئامانجەکانی تورکیا لەم جەنگەدا بەم شێوەیە دەستنیشان بکەین:

١. رێگا لە عێراق بگرێت، کە بە داگیر کردنی کوەیت ببێتە خاوەنی زۆرترین نەوتی یەدەك لە جیهاندا.

٢. لاوازکردنی عێراق لە رووی سەربازییەوە بۆئەوەی نەبێتە هۆی هەرەشە بۆ سەر هاوسەنگی هێز لە ناوچەکەدا، لەجیاتی ئەو تورکیا ببێتە جێگرەوەی هێزی عێراقی لە ناوچەکە.

٣. تورکیا بۆ ئەوەی کارتی ئاوی تورکیای بەرامبەر نەوتی عێراقی لە دەستدا بێت، دەیویست عێراق لاواز بێت و بە دۆڕاوی لە شەڕ بچێتە دەرەوە.

٤. تورکیا وەك ئەندامێکی هاوپەیمانی ناتۆ بەشداری کرد بۆ ئەوەی رۆڵی لەو جەنگەدا بەرچاوبێتو ئەو هاوپەیمانیە دەسبەرداری تورکیا لە ناوچەکەدا نەبێت.

٥. دروستکرنی دیالۆگی (تورکی-کەنداوی) کە پشت بە رێوشوێنە ئاسایشیەکانی ناوچەکە بەستبێتو تورکیا پشکی لە پاراستنی ئەو ئاسایشەدا هەبێت [٢].

هەڵوێستەکانی ئەنکەرە جێگای نارەزایی بەغداد بوو هەربۆیە کاتێك سەرۆك وەزیرانی تورکیا یەڵدرم ئاکوبولۆت لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٠ وەك هەوڵێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە سەردانی بەغدادی کرد، لە لایەن سەرۆکی عێراق سەدام حسین پێشوازی باشی

---

[١] ميثاق خير الله جلود: المصدر السابق، ص ١٦٥-١٦٦

[٢] عبد الزهرة شلش العتابي: المصدر السابق، ص ٢٢٢-٢٢٣

لێنەکراو پێی وت: "هاوپەیمانی ناتۆ کاریگەریی لەدەست داوە، ئەوان بە هاناتانەوە نایەن، ئەگەر ئەوەی ئێمە داواتان لێدەکەین، جێبەجێی نەکەن سەبارەت بەو کێشانەی بە لای ئێمەوە گرنگە، ئەوا کێ فریاتان دەکەوێت"[1]. لە بەرامبەردا هەڵوێستی تورکیا رۆژ بە دوای رۆژ توند تر دەبوو بەرامبەر عێراق. لە رێگای ئەم هەڵوێستانەوە تورکیا وەك هێزێکی ناوچەیی خۆی دەنواند. ئەوە بوو ئۆزال لە ٢٤ی سێپتەمبەری ١٩٩٠ سەردانی سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بوشی لە واشنتن کردو لیستێکی داواکاری سەربازیو ئابووری پێشکەشی واشنتن کرد. لێرەدا ئۆزاڵ نەوەستا لەسەر داواکاری، بەڵکو پێشنیاری کرد، تورکیا لە رۆڵی پشگیری هەنگاو هەڵنێت بۆ رۆڵی بەشداریکردن لەگەڵ هاوپەیمانان بۆ هێرش کردنە سەر عێراق لە باکوورەوە[2].

دەتوانین بڵێین ئۆزاڵ لەم قۆناغەدا بناغەیەکی کۆنکرێتی دارشت لە سیاسەتی تورکیا بەرامبەر عێراق کە دوای مردنیشی دروستکەرانی بریار لە تورکیا نەیانتوانی ئەو بناغە تێك بشکێنن. ئەوە بوو لەدوای تەواو بونی جەنگ نەگۆرێکی خستە سەر پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت ئەویش دەستێوەردانی ئاشکراو دیار بوو لە سەروەری خاکی عێراق لە رێگای (ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی–Operation Provide Comfort)، کە کورتکراوەکەی (OPC) بوو. ئەم پۆسەیە لە رێگای هێزی هاوپەیمانان لە بنکەی ئەنجەرلیکی تورکیاوە ئەنجام ئەدرا. ئەرکەکەی وەك سەرۆك وەزیرانی تورکیا مەسعود یەڵماز[3]، لە ٢٨ی یۆلیۆی ١٩٩١ ئاماژەی پێکرد، بۆ گۆرینی رژێمی عێراقی یان لە دژی سوریاو ئێران بەکار نەبوو، بەڵکو تەنها بۆ پارێزگاری ئاوارەکانی کوردە[1].

---

[1] Kemal Kirisci: Post Cold-War Turkish Security and the Middle East. MERIA. Volume 1, No. 2 - July 1997. P25

[2] ابراهيم محمد حسن: المصدر السابق، ص ١٤٩

[3] مەسعود یەڵماز لە ١٩٤٧ لە ئەستەنبوڵ لە دایك بووە، دەرچوی کۆلیژی زانستە سیاسییەکانی ئەنکەرەیە، لە دامەزرێنەرانی پارتی نیشتمانی دایکەو لە ساڵی (١٩٩٠-١٩٩٨) سکرتێری ئەو پارتەبووە، یەکەمجار سەرۆکایەتی حکومەتی کردووە لە (٢٣یۆنیۆی١٩٩٠-٢٠ئۆکتۆبەری١٩٩١). دواتر لە

مەرجەکانی تورکیا لە بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیك لە لایەن هاوپەیمانان ئەمانەی خوارەوە بوو:

١. یەکێتیی خاکی عێراقی نەخاتە بەرهەرەشەو دەستکاریکردن، ئەمەش هێندەی لەبەر دەسکارینەکردنی نەخشەی عێراق بوو، زیاتر لەمە، بۆ ئەوە بوو، کە دەوڵەتێکی کوردی بە هۆی(OPC) دانەمەزێت کە لە داهاتوودا تورکیا بەزەو دابەشبون بەرێت.

٢. هەموو سیاسەتێك بوەستێنرێت کە یارمەتی کورد بدات بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لە باکوری عیراق، پێویستە سەرکردە کوردەکانیش لەسەر ئەو خەتە رابهێنرێن.

٣. پەیرەوی تەواوەتی یاسای نەتەوە یەکگرتووەکان بکرێت.

٤. ئەمریکا جەخت لەسەر پرۆسە سەربازییەکان تورکیا لە دژی (پ.ك.ك) بکات[٢].

لەسەر بنەمای تێگەیشتنی نێوان تورکیاو هاوپەیمانان، پەرلەمانی تورکیا لە ئەپرلی١٩٩١، ڕەزامەندی لەسەر بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیك لە لایەن هاوپەیمانانەوە دەربڕی، کە بۆ ماوەی شەش مانگ (ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی) (OPC)، تیایدا ئەنجام بدرێت. تورکیا بە چوار فرۆکەی جەنگی بەشداری تیادا کردو بە بەردەوامی ٧٤ سەربازی تورکی بوو، هەروەها لە نوسینگەی (MCC) هەمیشە لە کۆی (١٠) ئەفسەری هاوپەیمانان دوو ئەفسەریان سەر بەسوپای تورکیا بوون[٣]. تا ساڵی ١٩٩٦ فرۆکەی هاوپەیمانان(٨٠) جار گورزی پێشوەختیان لە سوپای عێراقی وەشاند[٤].

(ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی) (OPC) لە ١ یەنایر١٩٩٧ بەدواوە گۆڕا بۆ پرۆسەی چاودێریکردنی باکوور–Operation Northern Watch، کە کورتکراوەکەی

---

٣٠یۆنیۆی ١٩٩٧–١١ی یەنایری ١٩٩٩ سەرۆك وەزیران بووە. جلال عبدالله معوض، المصدر السابق، ص ٩٣-٩٤.

[١] احمد حسين: المصدر السابق، ص٩٤.

[٢] المصدر نفسه، ص٩٦.

[٣] رواء محمد ملا: المصدر السابق، ص١٢٣–١٢٤.

[٤] ميخائيل م. جونتر: الاكراد ومستقبل تركيا، ترجمة: سعاد محمد ابراهيم خضر،مركز كردستان للدراسات استراتيجية– سليماية، ٢٠٠٧، ص١٤٤

(ONW) بوو، لەم پرۆسەیەدا فەرەنسا پاشەکشەی کردو تورکیاش تەنها لە سنووری ئاسمانی تورکیادا یاریدەی فرۆکەکانی بریتانیاو ئەمریکایان ئەدا بۆ چاودێریکردنی باکوری عێراق. هۆکاری ئەم گۆڕانکارییەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کاتێك راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان باسیان لەوە کرد، کە بنکەی ئەنجەرلیك بەکار هاتووە وەك تۆڵە کردنەوە لە عێراق لەبەرامبەر هاریکاری نەکردنی لەگەڵ بەرنامەی پشکنینی چەك(UNSCOM)، کە بەڕای فەرەنسا ئەمە لادان بووە لە ئەرکی سەرەکی (OPC) کە پاراستنی کوردەکان بوو[1].

ئۆزاڵ لەم قۆناغەدا (١٩٩٠–١٩٩٣) گەورەترین بەربەست بوو لەبەردەم بەرژەوەندیو ئاسایکردنەوەی پەیوەندییەکانی عێراق لەگەڵ تورکیا، چونکە بە شێوەیەکی گشتی ئەو پشتگیری لە بەردەوامبونی سزاکانی سەر عێراق دەکرد، هاوکات رێگای خۆشکرد کە هاوپەیمانان لە تورکیاوە بە بەردەوامی هێرش بکەنە سەر خاکی عێراق[2].

بۆیە دەتوانین بڵێین، لەم قۆناغەدا تورکیا هێندەی پیوەندیەکانی لەگەڵ هەرێمی کوردستان بەهێز بوو، هێندە لەگەڵ عێراقدا پەیوەندیەکان باش نەبوو، ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو رایەی، کە بڵێین تورکیا لە روانگەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەرێمی کوردستان دەیڕوانییە عێراق. بە واتایەکی تر ئۆزاڵ، کە رۆڵێکی گەورەی لە دروستکردنی بڕیاری تورکیادا هەبوو. ئەو باوەڕی بە فیدراڵیەت هەبوو بۆ عێراق، کە لە پشتگیریکردنی فیدراڵیەتی هەرێمی کوردستانەوە دەیڕوانییە فیدراڵیەت بۆ هەموو عێراق. هەر بۆیە دەبینین ئۆزاڵ پێشنیاری کۆنفدراڵی کوردی تورکی عەرەبی لە عێراقدا کرد، کە یەکەمیان هەولێرو

---

[1] SEAN BOYNE :ARGUMENTS IN FAVOUR OF TURKEY'S CONTINUING SUPPORT FOR OPERATION NORTHERN WATCH :PERCEPTIONS JOURNAL OF INTERNATIONAL AFFAIRS. December 1997-February 1998 Volume II – Number 4. P 2

[2] Henri J. Barkey :TURKEY AND IRAQ SINCE THE GULF WAR HEMMED IN BY CIRCUMSTANCES ‹MIDDLE EAST POLICY, VOL. VII, NO. 4, OCTOBER 2000. P113.

سلێمانیو دهۆك بێت، ئەوەی تر کەرکوكو موسڵ بێتو ئەوی دەمێنێتەوە بۆ عەرەبی عێراقی بێت[1].

دووەم– قۆناغی چەق بەستن(١٩٩٣–١٩٩٧):

ئەم قۆناغە لەدوای مردنی ئۆزال دەستپێدەکات دوای ئەوەی تەمەنی ڕژێمی عێراقی لەسەر کورسی دەسەلآت درێژەی کێشا، هاوکات هەرێمی کوردستانیش وەك دەسەلآتێك لە ناوچەکە بەردەوامی هەبوو. ئەم قۆناغە بەوە لە قۆناغی یەکەم جیا دەکرێتەوە، کە پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ عێراق نەبچڕانی تەواوەتی بوو نە ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانە.

ئەو کەسانەی، کە لە دوای ئۆزاڵ بوون بە خاوەن بریار لە تورکیادا، سەرجەمیان بە شێوازی جۆراوجۆر دژی سیاسەتی دەرەوەی ئۆزاڵ بوون لە دووەمین جەنگی کەنداو. ئۆپۆزسیۆنی تورکیا سەرجەمیان ئیدانەی داگیرکردنی کوەیتیان کرد، بەلآم هەڵوێستیان جیاواز بوو، سلیمان دیمیریل[2]، کە ئەوکات خۆیو پارتەکەی (پارتی رێگای راست Dogru Yol Partisi) لە پەرلەمان بەرهەڵستکار بوون، لە ١٧ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠ وتی:" پێویست ناکات بۆ رازیکردنی هەندێك، تورکیا لە ئاگرەوە تێوە بگلێنین.... ئۆزاڵیش نە نوێنەری تورکیایەو نەنوێنەری گەلە....بێ ئابڕووییە بۆ تورکیا کە بۆ پڕکردنەوەی زیانەکانی، رازی بوو پارە لە میری کوەیت وەربگرێت، ئەوە مانای فرۆشتنی سوپای تورکیایە لە بەرامبەر هەژموون.....ئێمە جەندرمەو پاسەوانی بەکرێگیراو نین". نەجمەدین

---

[1] احمد حسين: المصدر السابق: ص٩٣

[2] سلیمان دیمیریل لە ١٩٢٤ لەدایك بووە لە پارێزگای ئەسپارتە لە باشوری رۆژئاوای تورکیا، دەرچوی کۆلیجی ئەندازیاریە لە زانکۆی ئەستەنبوڵ لە ساڵی ١٩٤٦، حەوت جار سەرۆکایەتی حکومەتی کردووە، لە ساڵی ١٩٧١، ١٩٨٠ لە رێگای کودەتاوە حکومەتەکەی لەکار کەوتووە، لە داوی مردنی ئۆزاڵ، نۆهەمین سەرۆکی تورکیا بووە لە (مایۆی ١٩٩٣–مایۆی ٢٠٠٠). جلال عبدالله معوض: المصدر السابق، ص ٣٤–٣٥

ئەربەکانیش[1]، وەك سەرۆکی کوتلەی پارتی رەفاهی بەرهەڵسکار وتی: "سەرۆك بریار دەردەکات بەبێ ئەوە راوێژ بە پەرلەمان و حکومەت بکات و دەست دەکات بە جێبەجێکردنی وەك ئەوەی کە تورکیا رژێمێکی کۆماری سەرۆکایەتی بێت، ئەمە پێشێلکردنی دەستورە، تورکیا پێویستە بە روانگەیەکی رۆشنەوە بچێتە و ناو کێشەکە نەك بە قازانجی لایەنێك و بە دەستگرتن بە بریارەکانی بۆش"[2].

ئەم هەڵوێستانە هەڵویستی پەرلەمانی بوون، بەڵام لەکاتی وەرگرتنی دەسەلاتدا گۆرانی بەسەردا هات. دیمیریل وەك سەرۆك کۆمار (١٩٩٣–٢٠٠٠) لەمیانەی سەردانی بۆ میسر لە ٦ی مایۆی ١٩٩٤ وتی: " تورکیا پێشبینی ئەوە دەکات، کە لەگەڵ ئەمریکا رێکەوتن بکات بۆ هەلگرتنی سزای ئابووری، بۆرییە نەوتییەکان، کە لەژێر هەرەشەی خراپ بوندایەو نزیکەی (١١) ملیۆن تەن نەوتی لەناودایە، بۆیە پێویستە بخرێنەوە کار. جگە لەوە، کە تورکیا بەهۆی گەمارۆی سەر عێراق، زیانەکانی بە (٢٠) ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێت"[3].

دیمیریل لە بەرژەوەندییە ئابوریەکانی تورکیاوە دەیروانییە هەلگرتنی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق، هاوکات لە بەرژەوەندییە سەربازییەکانی تورکیاوە دەیروانییە سنوری نێودەوڵەتی نێوان عێراق و تورکیا. لە ساڵی ١٩٩٥، کە رووبەرووبونەوەیەکی گەرم لەسەر سنوری عێراق–تورکیا لە نێوان سوپاو (پ.ك.ك) لە ئارادا بوو، لەم کاتەدا دیمیریل سێ جار باسی لە سنوری تورکیاو عێراق کرد. لە لێدوانێکی بۆ رۆژنامەنوسان لە ٣ی مارتی ١٩٩٥،

---

[1] نەجمەدین ئەربەکان (١٩٢٦–٢٠١١)، خاوەنی بروانامەی دکتۆرایە لە ئەندازیاریدا لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەڵمانیا، گەورەترین رۆڵی هەبووە لە سەرکردایەتی کردنی ئیسلامی سیاسی لە تورکیاو سێ پارتی دامەزراندووە کە هەرسێکیان لە لایەن دەوڵەتەوە داخراوە، ئەویش پارتی سیستەمی نیشتمانی(١٩٧٠)، پارتی سەلامەتی نیشتمانی( ١٩٧م)، پارتی رەفاه ١٩٨٣. لە هەڵبژاردنەکانی دیسەمبەری ١٩٩٥، زۆرترین کورسی پەرلەمانی بەدەست هێناو لە ٢٩ی یۆنیۆی ١٩٩٦ وەك یەکەم سەرۆك وەزیری خاوەن بیروڕای ئیسلامی دەستبەکار بوو تا بەکودەتا لە ٣٠ یۆنیۆی ١٩٩٧ لەکار خراو داواتر دادگا لە کاری سیاسی دورخستەوە. جلال عبداللة معوض: المصدر السابق، ص ٨٦-٨٧

[2] میثاق خیر الله جلود:المصدر السابق، ص١٦٤.

[3] جلال عبدالله معوض: المصدر السابق، ٤٩

ووتی:"ئەم سنورە هەڵەیە، وولایەتی موسڵ بەشێك بوو لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی". لە چاوپێکەوتنێکی تر لە ٢ی مارتی ١٩٩٥: سنوری سەر بەرزاییەکان هەڵەیە، لەراستیدا سنوری تورکیا لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کە سنوری ناوچە نەوتیەکان کۆتایی دێت. من وتومە کاتێك ئێمە پاشەکشە لە باکووری عێراق دەکەین، .....دووبارە تیرۆریستەکان دەگەڕێنەوەو ئێمە دوای دوو تا سێ مانگی تر توشی هەمان بارودۆخ دەبینەوە، بۆیە لێگەڕێن با ئەو سنورە راست بکەینەوە. پێویستە هێڵی سنور بچێتە ناوچە نزمەکان. ئەگەر سنور لە ناوچە نزمەکانی کەنار چیاکان بێت، ئەوا چەکدارەکانی (پ.ك.ك) ناتوانن لەو ناوچەیەدا خۆیان حەشار بدەن"[١].

هەڵوێستی عێراق لە لایەن وتەبێژی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشی عێراقی بوو، کە وتی:"عێراق هەموگفتوگۆیەك لەم بارەوە رەتدەکاتەوە، تورکیاش ئاگادار دەکاتەوە لە هەموو هەنگاوێکی تاك لایەن، کە سنوری نیشتمانی ببەزێنێت، عێراق بەرگری لە هەموو کارێکی لەو جۆرە دەکات بە گرتنە بەری هەموو جۆرێك لە رێگا شەرعییەکان". رۆژنامەنوسێکی عێراقی لە رۆژنامەی بابلدا تورکیای بە پیاوە نەخۆشەکە ناوزەد کردبوو، نوسیبوی " دەستی هەر کەسێك دەبرین، کە بیەوێت ئازارمان بدات". وەزیری دەرەوەی میسر (عەمرو موسا) بەرهەڵستی دەوڵەتەکەی خۆی لەم بارەیەوە دەربڕیو کۆمکاری ولاتە عەرەبیەکانیش بەهەمان شێوە رەخنەی توندیان لە وتەکانی دیمیریل گرت. لە وەلامی ئەمانەدا دیمیریل چەند راگەیاندنێکی دەرکرد، لە (٨ی مایۆی ١٩٩٥) وتی:" پێویستە گۆرینی سنور لە رێگای گفتوگۆو هەماهەنگی بێت لەگەڵ ولاتانی دەوروبەر". دواتر کاتێك زانی، کە وتەکانی هێشتا جێگای رەزامەندی دەوڵەتانی دراوسێ نییە، بۆیە رایگەیاند: ئەم بۆچوونە خراپ لێکدرایەوە. سنوری نێوان تورکیاو عێراق کێشەیە. ئەم کێشەیە ئێستا چارەسەر ناکرێت. تورکیا پلانی نییە بۆ بەکارهێنای هێز بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانو ئەم کێشانە بە هاریکاری هاولاتی هەردوو دەوڵەت چارەسەر دەکرێت. من ئەمەم وتووەو

---

[1] Daniel Pipes: Hot Spot: Turkey, Iraq, and Mosul: Middle East Quarterly .VOLUME II: NUMBER 3 SEPTEMBER 1995 .WWW.meforum.org.

مەبەستم ئەو بوو". دیمیریل بۆ رۆژنامەیەکی عەرەبی وتی:" تورکیا هیچ چاوتێبڕینێکی ناوچەیی نییە لە ناویشیاندا عێراق. کێشەی موسڵ لە ساڵی (١٩٢٦) چارەسەر کراوەو ئێستا ئەمە پرسێکی بەردەم سیاسەتی دەرەوەی تورکیا نییە". ئەم وتانەی دیمیریل پەیوەندیەکانی بردەوە باری ئاسایی‌و جێگری سەرۆك کۆماری عێراق تەها یاسین رەمەزان لەو بارەیەوە وتی" حکومەتەکەیان بە گرنگییەوە دەروانێتە پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا"[١].

دیمیریل لە پێناوی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا ئامادەیی خۆی دەربری بۆ دەسکاریکردنی سنووری نێودەوڵەتی‌و فراوانکردنی خاکی تورکیا لە رێگای بەکارهێنانی هێز، بۆیە ئەمە سیاسیەتێکی زۆر نزیك بوو لە سیاسەتی ئۆزاڵ بەرامبەر عێراق، بەڵام واقعی نەبوو. عێراقیش هەستی بە گۆرانێك دەکرد لە بۆچوونی تورکیا بەرامبەر پەیوەندییەکان. بۆیە وەزیری دەرەوەی عێراق محەمەد سەعید سەحاف بۆ یەکەم جار لە دوای دووەمین شەری کەنداو لە فەبرایەری ١٩٩٥ سەردانی ئەنقەرەی کرد، داوای لە تورکیا کرد مۆڵەتی مانەوەی هێزی نێودەوڵەتی ناوچەی دژەفرین درێژ نەکەنەوە، هەروەها کێشەی کورد وەك کێشەیەکی ناوخۆیی لە هەردوولادا سەیر بکرێت‌و هیچ لایەنێکی نێودەوڵەتی دەستێوەردان نەکات[٢].

بە دەستبەکاربوونی ئەربەکان وەك سەرۆکی حکومەت لە ئەپریلی١٩٩٦– ئەپریلی١٩٩٧، پەیوەندییەکان قەڵەمبازێکی بەخۆوە بینی. ئەمەش لەو باوەرەی ئەربەکانەوە بوو کە پێی وابوو، پێویستە تورکیا رووبکاتەوە رۆژهەڵات‌و پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامییەکان‌و دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست بەتین بکات بە تایبەتیش دەوڵەتانی دراوسێ[٣]. هەر لە سەرەتای دەسبەکاربوونی وەك سەرۆکی حکومەت، کەوتە پەیوەندییەکی خێرا لە نێوان سعودیەو عێراق‌و کوەیت لە سێپتەمبەری ١٩٩٦، بۆ

---

[1] Ibid

[٢] عومەر نورالدین : سەرچاوەی پیشوو، ل ٣١٢.

[٣] رضا هلال:السیف والهلال ترکیا من اتاتورك الی اربکان، دار الشرق، قاهرة، ١٩٩٩،ص ص ١٨٥– ١٨٧

چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان، لە روانگەی ئەوەی، کە ئەم کێشانە کێشەیەکی دەوڵەتە ئیسلامیەکانە، رێگە بە ئیمپریالیزم نەدرێت دەست وەربداتە ئەو کێشانە. هاوکات وەك هەنگاوێکی تاك لایەنە لە ناوچەکەدا، ئەربەکان وەزیری دادی کابینەکەی، شەوکەت کازانو وەزیرێکی تری کابینەکەی راسپارد بۆ سەردانی بەغداد. لەوێوە کازان لە ١٤ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦ رایگەیاند "ولاتەکەی یەکێکە لەو دەوڵەتانەی لە ئەنجومەنی ئاسایش بۆ هەلگرتنی سزای ئابووری لە پاڵ عێراق دەوەستێت.....تورکیاش یەکێکە لەو دەوڵەتانەی بەرگری لە مافی عێراق لە دژی ستەمکاری دەکات، کە تورکیاش توشی هاتووە.". ئامانجی تورکیا لە سیاسەتی هەلگرتنی گەمارۆی ئابووری بریتی بوو لە بەدەسهێنانی قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی، کە بە هۆی گەمارۆوە توشی بووە. لە لایەکی تر بۆ رێگا خۆشکردن بۆ دروستکردنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ عێراق بە تایبەت پەیوەندییە ئابوررییەکان[1]. هاوکات باشکردنی پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ عێراق، یەکێك بوو لە پرۆژە چاکسازیە ئابوورییەکانی ئەربەکان لە تورکیادا. ئەنکەرەو بەغداد لەسەر هەناردەکردنی کالای تورکی، بەتایبەتیش خۆراكو دەرمانی پزیشکی، لە بەندەرەکانی ئەسکەندەرۆنەو مێرسینەوە بۆ عێراق رێکەوتبوون. لەم بارەیەوە ئەربەکان وتی"حکومەت هەموو رۆژێك کرانەوەی دەرگای نوێی بازرگانی لە نێوان تورکیاو عێراق رادەگەیەنێت[2].

لە لایەکی تر وەك هەوڵێکی تورکیا بۆ پتەوکردنی پەیوەندیەکان، ئەربەکان لە سەرەتای دەسبەکاربونی وەك سەرۆکی حکومەت وادەی (OPC) درێژ کردەوە، بەلام لە جاری دووەمدا، واتە لە سەرەتای یەنایری ١٩٩٧، لەگەڵ ئەمریکاو بریتانیاو فەرەنسا کەوتە وتووێژ لەسەر ئەم پرسەو ئەوە بوو ناوەکەی گۆرا بۆ ئۆپەراسیۆنی چاودێریکردنی باکور(ONW). لە چاوپێکەوتنێکدا وتی :"لە کاتی دواین درێژکردنەوەدا چەند مەرجێکمان بۆ ئەمریکا داناوە لەوانە، هەلگرتنی سزای ئابوری سەر عێراق، کە پەیوەندی بە بازرگانی لەگەڵ تورکیادا

---

[1] جلال عبدالله معوض: المصدر السابق، ص١٣٧

[2] امال محمد صالح الحمداني: نجم الدين اربكان و دوره في السياسة التركية ١٩٦٩-١٩٩٧، رسالة ماجستير، كلية التربية، جامعة موصل، ٢٠٠٨، ص٢٣٧

هەبێت بە هاوشێوەی ئەردەن. زۆرکردنی نەوتی ڕۆشتوو لە ڕێگای تورکیاوە. پاراستنی یەکێتی خاکی عێراقی. ئەمریکا پابەند بێت بە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دور لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی. یەکخستنی هەوڵەکان لە پێناو دژایەتی کردنی تیرۆر.کەمکردنەوەی فرینە ئاسمانییەکان لە ناوچەی بامەرنی بۆ نیو ئەوەندە، هەروەها گواستنەوەی فرینەکان بۆ سلۆپی"[1]. ئەربەکان وەك هێزی داگیرکەر سەیری (OPC) دەکردو بە پشگیری (پ.ك.ك)ی ناو دەبرد. هاوکات دەیوت ئەمریکا لە ڕێگای ئەنجەرلیکەوە یارمەتی پرۆژەی ئەتۆمی ئەرمینیای داوە کە نەیارێکی تورکیایە. بەرای ئەو خەڵکی موسوڵمانی تورکیا لە دژی مانەوەی ئەو هێزە داگیرکەرانەن لە تورکیا[2].

لەم قۆناغەدا ئامانجی تورکیا بریتی بوو لەوەی، کە زامنی مانەوەی حکومەتی بەغداد بکات، چونکە لە داهاتوی پارچە پارچە بوونی عێراق لە دوای ڕژێمی سەدام حسین دەترسا. هاوکات ئامانجێکی تریش کۆتاییهێنان بوو بە خەونی فدراڵی یان دەسەڵاتی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا. ئەویش لەرێگای هاندانی کورد بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ بەغداد، هەروەها خواستی ئەوە بوو، ڕژێمەکەی بەغداد دەسەڵاتی بگاتەوە سنورەکانو یارمەتی ئەنکەرە بدات لە کپکردنەوەی چالاکی (پ.ك.ك) لەسەر سنور[3]. وەزیری دەرەوەی تورکیا تانسۆ چیلەر[4]، لەمبارەیەوە وتی: وڵاتەکەی پشتگیری بەغداد دەکات بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی لە هەرێمی کوردستان، بەمەرجێك ئەگەر بتوانێت، ڕێگە لەبەردەم هێرشەکانی

---

[1] امال محمد صالح حمدانی: المصدر السابق، ص٢٣٧-٢٤٠

[2] Henri J. Barkey :TURKEY AND IRAQ SINCE THE GULF WAR.p116

[3] Ibid

[4] تانسۆ چیللەر لەدایکبوی ساڵی ١٩٤٧ لە شاری ئەستەنبوڵ خاونی بڕوانامەی دکتۆرایە لە ئابوریدا لە ئەمریکا، مامۆستای زانکۆ بووە لە زانگۆی بەسفۆر لە تورکیا، لە یۆنیۆی ١٩٩٣ بۆتە سەرۆکی پارتی ڕێگای ڕاست، لە ٢٥ی یۆنیۆی ١٩٩٣-٦مارسی ١٩٩٦، سەرۆکایەتی سێ کابینەی یەك لەدوای یەکی حکومەتی کردووە، لە کابینەکەی ئەربەکانیش جێگری سەرۆکی حکومەتو وەزیری دەرەوە بووە. جلال عبد الله معوض: المصدر السابق، ص ٩١-٩٢

(پ.ك.ك) بگرێت[1]. ئەربەکان بە ئاشکرا ئەوەی خستەڕوو، کە ئەمریکا پرۆژەیەکی دیاریکراوی نییە نە لە هەرێمی کوردستانو نە عێراقدا، بۆیە حکومەتی تورکیا کار بۆ گەشەسەندنی پەیوەندییە ناوچەیەکانی دەکات[2].

ئەم سیاسەتەی ئەربەکان جێگای دەستخۆشی بەغداد بوو، ئەوە بوو سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییە عەرەبیو نێودەوڵەتییەکان لە ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق، قاسم حەمودی:"گەرانەوەی دەسەلاتی ناوەندی زامنی ئاسایشی سنورەکانو وەستانی دزە کردنە لە ناو عێراقەوە بۆ تورکیا"[3].

لەگەڵ هەموو ئەو هەولانەی ئەربەکان، بەلام نەیتوانی پەیوەندییەکان بخاتە بارێکی ئاساییەوە، چونکە لە لایەك سوپا سور بوو لەسەر پێشێلکردنی سەروەری خاکی عێراق لە رێگای لەشکرکێشییەکانەوە. لە سەردەمی حوکمی ئەربەکان یەکێك لە گەورەترین لەشکرکێشی تورکیا لە ناو خاکی هەرێمی کوردستانو سنووری عێراقدا روویدا ئەویش ئۆپەراسیۆنی فولاز بوو لە ١٩٩٧. عێراق لە رۆژانی ١٥–٢٥ی مایو ١٩٩٧و لەمیانەی ئەو لەشکرکێشیەدا، (٢٧) یاداشتنامەی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆمکاری عەرەبی، رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی ناردووە. هاوکات نوێنەری عێراق لە کۆمکاری عەرەبی رەتیکردەوە، کە نوێنەری عێراقی پێش لەشکرکێشیەکە ئاگادار کرابێتەوەو رایگەیاند، "ئەوەی رویداوە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا سەفیری عێراقی بانگ کردووەو پاساوی لەشکرکێشیەکە بۆ هێناوەتەوەو هەموو جارێك لە کاتی لەشکرکێشیەکان ئەمە دوبارە دەبێتەوە"[4].

---

[1] EU aid ban highlights shaky Turkey rights record 08:04 Sep 22، 1996. www.kurdistanobserver.com.

[2] جلال عبدالله معوض: المصدر السابق: ص ١٥٣–١٥٤ .

[3] عايدة العلي سرالدين: دول المثلث بين فكي الكماشة التركية الاسرائيلية، دار الفكر العربي، بيروت، ١٩٩٧،ص ١٧٨ .

[4] جلال عبدالله معوض: المصدر السابق ١٨٦

هاوکات گرفتی سەرەکی عێراق لەبەرامبەر تورکیا لەوەدا بوو، هەرێمی کوردستان بەربەستێکی جوگرافی بوو لەبەردەم بەریەککەوتنی سنورو پەیوەندییە ڕاستەوخۆکانی لەگەڵ تورکیا، هەروەها گرفتی لەگەڵ هەرێمی کوردستان بریتی بوو لەوەی، کە بەپێی بڕیاری (٦٨٨) پاریزراویەکەی نێودەوڵەتی بۆ پەیدا ببوو کە ڕێگربوو لەبەردەم گەڕانەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بەغداد لە هەرێمی کوردستان. بۆیە دەتوانین بڵێین سیاسەتی دەرەوەی ئەربەکان بەرامبەر عێراق پێچەوانەی سیاسەتی ئەمریکا بوو بەرامبەر عێراق. هەر بۆیە ئەربەکان زۆر بە روونی وتی، ناتوانین جوڵەی گەورە بە پەیوەندییەکانی عێراقی–تورکی بکەین[1]. لێرەدا دەتوانین بڵێین بەشێك لە هۆکاری لەکارخستنی ئەربەکان لە سەرۆکایەتی حکومەت، ئەنجامی ئەو سیاسەتە بوو کە بەرامبەر عێراقو هەرێمی کوردستان پەیرەوی لێدەکرد.

سێیەم: قۆناغی بەرەو ئاساییبوونەوەی پەیوەندییەکان (١٩٩٧–٢٠٠٢)

تورکیا لە سەردەمی بولەند ئەجەڤید[2]، چ وەك جێگری سەرۆکی حکومەتەکەی مەسعود یەڵماز، چ وەك سەرۆکی وەزیران (١٩٩٧–٢٠٠٢) لە هەوڵی ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکان بوو. ئەجەڤید لە کاتی دووەمین جەنگی کەنداودا سەردانی سەدام حسینی کردو نارەزایی خۆی بۆ سیاسەتی هاوپەیمانان بەرامبەر عێراق دەربڕیو ئەم سەردانانەی لە ساڵانی(١٩٩١–١٩٩٢)دووبارە کردەوە. ئەو پێی وابوو، کە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر عێراق لە لایەك زیانی ئابوری لە تورکیا داوە لە لایەکی تر ئەو سیاسەتە داهێنەری هەرێمی کوردستان بووە،

---

[1] Henri J. Barkey :TURKEY AND IRAQ SINCE THE GULF WAR. P118

[2] بولەند ئەجەڤید (١٩٢٥–٢٠٠٦)، لە دایکبوی ئەستەنبوڵە، دەرچوی کۆلیجی ئەدەبیاتی ئەو شارەیە لە ١٩٤٤، لە ساڵی ١٩٧٢ بۆتە سکرتێری پارتی گەلی کۆماری، لە حەفتاکاندا سێ جار حکومەتی پێکهێناوەو حکومەتی چوارەمو پێنجەمیش لە ل١ی یەنایری ١٩٩٩ بۆ ١٨ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢ بوو. جلال عبدالله معوض: المصدر السابق، ص ٩٥–٩٦

بۆیە دژی بوونی ئەمریکا بوو لە بنکەی ئەنجەرلیك[1]. عێراق وای لە ئەجەڤید چاوەروان دەکرد، کە بە پەیداکردنی پۆستی جێگرو دواتر سەروکی حکومەت، پەیوەندییەکانی تورکیا عێراق لە سەردەمی ئەربەکان زۆر باشتر بێت. ئەمەش بەهۆی پەیوەندیی کەسێتی لەگەڵ سەدام حسێن، هەروەها نارەزایی توندی بەرامبەر بونی ئەمریکا لە ناوچەکەداو دژایەتی کردنی ئەجەڤید بۆ هەرێمی کوردستان. لە راستیشدا ئەم ئاسۆیە کاتێك دەرکەوت، تورکیا لە ئەنجامی رێکەوتنامەی واشنتنی نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) لە ساڵی ١٩٩٨، رایگەیاند، کە پەیوەندییە دیپلۆماسیەکانی تا دوا ئاستی تەواوەتی لەگەڵ بەغداد ئاساییدەکاتەوە. ئەجەڤید لە ١١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ رایگەیاند :"ئەوە وەلامی رێکەوتنی واشنتن بوو کە عێراقیان پێ دابەش دەکرد". زیاتر لەوەش ئەجەوید، تاریق عەزیزی جێگری سەرۆکی حکومەتی عێراق، بانگێشتی تورکیا کرد. عەزیز لە ١٢شوباتی ١٩٩٩ گەیشتە تورکیاو وتی "نابێت هەل بدەینە دەست دوژمنەکان کە هەوڵ لە پێناو تێکدانی پەیوەندییکانی تورکیاو عێراق دەدەن"[2]. لە ماوەی سەردانەکەی عەزیز، تورکیا بە یاریدەی تەواوی ئەمریکا عەبدولا ئۆجالانی دەسگیر کرد، ئەمە وایکرد ئەو دەوڵەتە وەك سوپاسێکی هەوڵەکانی ئەمریکا بە گەرمی پێشوازی لە تاریق عەزیز نەکەن. بە تایبەت دیمریل، کە نەیهێشت تارق عەزیز سەردانی بکات لە کۆشکی کۆماری. لەم هەڵوێستە بالآتریش پەسەندکردنی ئەجەڤید بوو بۆ گورز وەشاندنی فرۆکەکانی هاوپەیمانانی لە هێلی (٣٦)وە لە دژە ئاسمانیەکانی عێراق. هەروەها ئۆپەراسیۆنێکی تری لە هەرێمی کوردستاندا ئەنجام دا. ئەمانە وایکرد پەیوەندییەکان زۆر ئالۆز بێتو تەها یاسن رەمەزان لە ١٧ی فەبرایەری ١٩٩٩ وتی،

---

[1] Henri J. Barkey :TURKEY AND IRAQ SINCE THE GULF WAR.P122

[2] ئەم سەردانە دوای پێشکەشکردنی داوایەی رەسمی تورکیا بوو بۆ (پ.د.ك) کە زامنی سەردانی عەزیز بەناو خاکی بن دەستی خۆی لە برایم خەلیلەوە بکات. مجموعة باحثين روس وعرب: العلاقات الدولية فی الشرقین الادنی والاوسط، وسیاسة روسیا علی عتبة القرن الحادی والعشرین، ترجمة دار المساعدة السورية للتاليف والترجمة والنشر، دمشق، ٢٠٠٢، ص ص١٤٨-١٤٩.

"لەمەودوا عێراق ئەنجەرلیك دەکاتە ئامانج"[1]. هەروەها عێراق نارەزایی خۆی لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەربڕی‌و داوای لەو رێکخراوە کرد کە دەستوەردان لە کێشەی لەشکرکێشی تورکیا بۆ سەر عێراق بکەن، بەلاّم سەرەك وەزیران (بوڵەند ئەجەڤید) رایگەیاند، کە ئەوان پێشتر عێراقیان لەو کارە ئاگادار کردووەو مۆڵەتیان وەرگرتووە[2].

دەتوانین بڵێین سیاسەتی ئەجەڤید بەرامبەر عێراق بریتی بوو لە پشگیریکردنی سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر عێراق بە تایبەت لە بواری رێگە دان بە (ONW)، هاوکات سود وەرگرتن لە عێراق لە رووی ئابوورییەوە تا ئەو کاتەی رژێمی سەدام حسین دەمێنێتەوە. دەوڵەتی عێراقیش لەبەر ئەوەی سیاسەتی (الاحتواء المزدوج)ی بەسەردا سەپا بوو، کە لە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان توشی کەنارگیری هاتبوو، هاوکات هێزی بەرگری‌و ئابووری لەدەست چوو بوو، هەموو ئەوانە وای کردبوو، عێراق توانای هەڵبژاردنی ئەگەرەکانی زۆر کەم بێت. بۆیە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا زۆر زاڵ بوو بەسەر سیاسەتی دەرەوەی عێراقدا. لە کاتێکدا، کە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی تورکیا بۆ خاکی عێراق بەردەوام بوو، هەروەها هاوپەیمانان بە بەردەوامی لە تورکیاوە هەڵمەتی ئاسمانیان دەکردە سەر عێراق، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا تورکیا شاندێکی بازرگانی بەرەو عێراق بەرێخست سەرەتای یەنایری ٢٠٠٠دا[3]. دواتریش بریکاری وەزیری دەرەوەی تورکیا فاروق ئۆغلۆ، سەردانی بەغدادی کرد لە ٥ی مایوی ٢٠٠٠دا و لە لە کاتی پێشوازیلێکردندا تەها یاسین رەمەزان وتی : عێراق دەخوازێت پەیوەندییەکی ستراتیجی لەگەڵ تورکیادا ببەستێت[4].

---

[1] Henri J. Barkey :TURKEY AND IRAQ SINCE THE GULF WAR.p124

2 Published: February: Turks Press Attacks On Rebel Kurd Basesk, 1999 .http://www.nytimes.com. الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية العدد(١٢٢٧) ١٩٩٩/٥/١٥

[3] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٤٦٤)، ٢٠٠٠/١/١٤.

[4] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٥٩٧)، ٢٠٠٠/٦/٦.

لە وەڵامی ئەم سەردانانەدا وەزیری نەوتی عێراق عامر محەمەد رەشید لە٢ی یۆلیۆی ٢٠٠٠ گەیشتە ئەنکەرە. ئامانجی سەرەکی ئەم سەردانە بۆ دەسپێککردنی کاری لیژنەی ئابوری عێراقی–تورکی بوو کە هەردوولا لە کاتی سەردانەکانی تورکیا بۆ بەغداد لە سەری رێکەوتبوون. هەروەها چالاککردنی ئەو گرێبەستانە بوو کە کۆمپانیا تورکییەکان لەگەڵ حکومەتی عێراقی بەستبوویان دور لە بریاری نەوت بەرامبەر خۆراك[1]. هەر لەم سەردانەدا تورکیا پێشنیاری راکێشانی لولەیەکی گازی بە تەنیشت لولە نەوتیەکان بۆ عێراق کردبوو. وێرای ئەمە تورکیا بە سەرکردایەتی ئەجەڤیت دەیویست، کە کێشەی هەرێمی کوردستان لە رێگای دانوستانی نێوان بەغدادو کورد چارەسەر بکات، بەوەی بەغداد دان بە هەندێك لەو مافانەدا بنێت، کە ئێستا کورد لە هەرێمەکەدا هەیەتی. هەر لەم روانگەی تورکیا بوو، کە سەدام حسێن پێشنیاری رێکەوتنی لەگەڵ کورد کردووە بە شێوەیەك کورد لە داهاتوودا مەترسی هەرەشەی بەغدادیان بە تەواوی لابرەوێتەوە[2].

---

[1] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٩٦٦)، ٢٠٠١/٧/٥.

[2] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٩٦٧)، ٢٠٠١/٧/٢٦.

# تەوەری سێیەم
# کێشەی کورد لە تورکیا

بۆ باسکردنی تێروانینی تورکیا بۆ هەرێمی کوردستان پێویستە کورتەی پاڵنەرەکانی سیاسەتی دەرەوەی تورکیاو ئامانجەکانیمان لەبەر چاو بێت. ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لە چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا هەڵێنجراوە. ئاسایشی نەتەوەیی تورکیاش بە پێی یاسای (٢٩٣٥)ی ساڵی (١٩٨٣) بریتیە لە "پارێزگاریو پاراستنی دەوڵەت لە هەموو جۆرە هەرەشەیەکی دەرەکیو ناوخۆیی بۆ سەر رژێمی دەستوری، یەکێتی، کیانی نیشتمان، لەگەڵ هەموو بەژەوەندیو مافەکانی دەوڵەت لەسەر ئاستی سیاسیو کۆمەلایەتیو ئابوریو رۆشنبیری". لەم روانگەیەوە سیاسەتی ئاسایشی نەتەوەیی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی دیاری دەکات کە بریتیە لە :

أ- هاوپەیمانیو بەشداریکردن لەگەڵ رۆژئاوا لەو سیاساتانەی، کە لە ناوچەکەدا دەیگرێتەبەر، هەروەها کارپێکەوەکردن لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ بۆ بەرگرتن لە خواستە سیاسییو دابەشکارییەکانی کورد، بە ئامانجی قۆرخکردنی هەستی سەربەخۆخوازی لای کوردەکانی تورکیا.

ب- تەواوکاری ناوخۆیی هێزو پێکهاتە کۆمەلایەتیو سیاسییە جیاوازەکان، لەوانە کوردو عەرەبو ئەرمەنو یۆنانەکان. مەترسی لە خواستە دابەشکاریەکانی ئەو نەتەوانە، وای کردووە کە سیاسەتی دەرەوە چالاکانە تێبکۆشێت لە پێناو یەکێتیی خاکو خەڵکی تورکیا.

ت- دەوڵەتی نمونەی باڵا: یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی تورکیا ئەوە بوو کە خۆی وەك نمونەیەکی باڵا لەروی سیاسیو نوێگەری پیشانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا بدات.

پ- زامن کردنی سامانو ئیمکانیەتەکان:واتە هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجانەی کە سروشتیکی ئابوریان هەیە وەك وەبەرهێنانو قەرزو یارمەتی ئابووریو ئاسانکاری دارایيو هەناردە کردن. ئەمەش لە رێگای جیاکردنەوەی سیاسەتو کێشە سیاسیەکان لەگەڵ ئابوریو پەیوەندیە ئابوریەکان بەدی دێت. وەك ئەوەی پەیوەندیە ئابوریەکانی لەگەڵ سوریاو عێراقو ئێران بە هۆی ئاڵۆزییە سیاسیەکان تێك نەدا[1].

لێرەوە بەرونی دیارە یەکێك لە ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بریتییە لە پاڵنەری کوردی. لەم پێناوەدا تورکیا زۆرترین هاوپەیمانێتيو هاریکاری لەگەڵ ولاَتانی دراوسێ بەهۆی کێشەی کوردەوە بووە. بە واتایەکی تر ململانێ لەگەڵ کێشەی کورد هەڵوێستێکی ئایدۆلۆجيو نەتەوەيیو دەرونی بووە لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا. یەکەم هەنگاوی ئەم سیاسەتەش لە شۆرشی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی ١٩٢٥ دەسپێدەکات تا شۆرشی ئاگری داغ ساڵی ١٩٣٠و هەروەهاراپەرینی دەرسیمی ساڵی١٩٣٧. سەرکوتکردنی هەموو ئەمانە بە هاریکاريو لە کاتی رێکەوتنی لێکتێگەیشتن یان هەندێك جار دەستێوەردان لە هەریەك لە ئێرانو سوریاو عێراق بووە، بەشداریکردنی تورکیاش لە پاکتی سەعد ئاباد لە ساڵی١٩٣٧، پاکتی بەغداد لە ساڵی ١٩٥٥، لەم روانگەیەوە بووە[2]. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو دروشمەی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بلَندی کردووە کە دەڵێت " ئاشتی لە ناوخۆ، ئاشتی لە دەرەوە"، ئەو کاتە دەچەسپێت، کە بزوتنەوەی کوردی لە ناوخۆو دەرەوەی تورکیا بە تەواوی سەرکوت دەکرێت. راستی ئەم رایەی ئێمەش لەو وتەیەی کەمال ئەتاتورك دەردەکەوێت، کە ئەو دروشمەی پێشوی لێهەڵێنجراوە، کاتێك، کە بە تەواوی شۆرشی شێخ

---

[1] عقیل سعید محفوض: سوریة وترکیا الواقع الرهن واحتمالات المستقبل، ص١٧٦-١٨٠.

[2] مایکل م. گونتر: العامل الکوردی فی السیاسة الخارجیة الترکیة، ماخوذ من: هنری بارکی واخرون: القضیة الکردیة فی ترکیا، ترجمة: هڤاڵ ، مؤسسة موکریانی، اربیل،٢٠٠٧ص ٩٣. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: سەرچاوەی پێشوو،ل٥٦-٦٠.

سەعیدی پیرانی سەرکوت کردووە، ئینجا لە١ نۆڤەمبەری ١٩٢٨ دەڵێت:"دەوڵەت، کە لە ناوەندی چاکسازیوگەشەکردنی سیاسیدایە، بە راستی پێویستە خواستی ئاشتیو ئارامی هەبێت لە ماڵی خۆیداو لە جیهاندا"(١).

ئەم سیاسەتەی دەرەوە تورکیا لە زۆری ژمارەی کورد لە تورکیا سەرچاوەی گرتووە کە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٥ ئامارە فەرمیەکانی دەوڵەت، ژمارەی کورد لە ساڵی ١٩٨٥ لەو پارێزگایانەی، کە کورد تیایدا زۆرینەیە ، ژمارەیان (٨,٥) ملیۆنە، لە و پارێزگایانەی، کە کەمینەن ٢,٧ ملیۆنە، کە بە هەموی دەگاتە(١١,٢) ملیۆن. بە پێی ئاماری فەرمی دەوڵەت ژمارەی دانیشتوان لەم ساڵانەدا بە رێژەی (٤٪) لە تورکیا زیادیکردووە کەواتە لە ساڵی ١٩٩٧ کورد لە تورکیا گەشتونەتە (١٨) ملیۆن(٢). بەڵام توێژەرە تورکەکان رێژەی کورد تورکیا بە (٨.٥٪)ی تورکیا دادەنێن کە ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی تورکیا (٦٠,٤) ملیۆن کەس بێت ئەوا کورد (٥,٩) ملیۆن کەس بوونو زازاش کە لە نەتەوەی کوردیان جیا کردۆتەوە (٠.٥٪) بوون، کە بە نزیکی (٣٧١.٠٠٠)کەس دەبن(٣). سەرچاوە کوردیەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن، لەساڵی (٢٠٠٠)، (١٩) ملیۆن کورد لەتورکیا هەبووە، رێژەی (٥٤.٩١٪)ی دانیشتوانی کوردستانی گەورە پێکدەهێنن(٤). بە واتایەکی تر لەگەڵ زۆری

---

[1] Bilge Criss and Pinar Bilgin: TURKISH FOREIGN POLICY TOWARD THE MIDDLE EAST. MERIA. Volume 1, No. 1 - January 1997. http://www.biu.ac.il

[٢] میر قاسم موئمنی: بارودۆخی کوردەکانی تورکیا لە سایەی حکومەتو سوپالا تورکیادا، وەرگێرانی : هاورێ یاسین محەمەد ئەمین،چاپخانەی پەیوەند، ٢٠١١، ل ل٤٦-٤٧.

[3] M. Hakan Yavuz and Nihat Ali Özcan :THE KURDISH QUESTION AND TURKEY'S JUSTICE AND DEVELOPMENT PARTY،MIDDLE EAST POLICY, VOL. XIII, NO. 1, SPRING 2006, P117.

[٤] ئازاد محمد ئەمین نەقشبەندی: پرۆژەی (گاپ)و کاریگەری لەسەر دەوڵەتی ناوچەکەو کوردستان، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٠٨.

ژمارەی کورد لە تورکیا کە بە نزیکەیی نیوەنی دانیشتوانی کوردستانی گەورەن، هاوکات ئەم نەتەوەیە نیوەکەی تریان بەسەر دەوڵەتە دراوسێکانی عێراق‌و سوریاو ئێراندا دابەش بوون. هاوکاری یان دەستێوەردانی تورکیاش لە کاروباری ئەو دەوڵەتانە لە بوونی نەتەوەی کورد لەو دەوڵەتانە سەرچاوە دەگرێت.

لەگەڵ بوونی ئەم ژمارە زۆرەی کورد لەتورکیا، خاوەنی کەمترین مافی نەتەوەیین، لەدەستوری ساڵی (١٩٨٢) لەپێشەکیەکەیدا هاتووە "چەمکی سەروەری بەشێوەیەکی ڕەهاو بەبێ هیچ مەرجێك بۆ ئوممەی تورکیە"، هەروەها نوسراوە: "هەموو ئەو کەسانەی پەیوەندیان بەڕەگەزنامەی دەوڵەتەوە هەیە، تورکە"، لەمادەی(٢٤) هاتووە: "نابێت خوێندن لەدەزگا فێرخوازییەکان بەهیچ زمانێکی تر بێت، تەنها تورکی نەبێت، چونکە زمانی دایکە"[١]. ئەم دەقە دەستوریەی تورکیا وایکردووە کورد لە ململانێ لە پێناو مانەوەدا، توشی دابەشبونی سیاسی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری بێت، بە تایبەت لە نێوان ڕەوتی عەلمانی‌و ئیسلامیدا.

یەکەمین ڕەوت، کە زۆرترین کاریگەری هەیە بریتیە لە (پ.ك.ك)و پارتە لایەنگرەکانی وەك پارتی دیموکرات(Demokrasi Partisi, DEP)[٢]، پارتی گەلی دیموکراتی (Halkin Demokrasi, Partisi, HADEP)، پارتی جەماوەری دیموکراتی Demokrati (Halk Partisi, DEHAP)، پارتی کۆمەڵگای دیموکراتی( Demokratik Toplum Partisi, DTP). ئەمانە بە شێوەیەکی گشتی (پ. ك. ك) ڕابەرایەتیان دەکات‌و

---

[١] المسألة الكردية في تركيا بعد أنقلاب ١٩٨٠،منطقة الاكراد "كردستان" موضوعات سياسية www. Almoqatel.com

[٢] لە ساڵی ١٩٩٤ لە جێگای پارتی کرێکارانی گەل دامەزراوە، ئەمانە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥ ، ١٩٩٩ نەیانتوانی بچنە ناو پەرلەمان چونکە ڕێژەی ١٠٪ کەمتریان هێنا کە ڕێژەیڕێپێدراوی بەشداری پەرلەمان بوو. لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ١٩٩٩ی شارەوانییەکان، ٣٠ سەرۆکایەتی شارەوانی بەدەست هێنا. ئەم پارتە هەمیشە لە لایەن تورکیاوە تۆمەتبار بوو بەوەی کە باڵێکی (پ.ك.ك)یە لە ناو پرۆسەی سیاسی تورکیا ئەوە بوو لە ساڵی ٢٠٠٣ داخرا. مایکڵ گەنتەر: فەرهەنگی مێژووی کورد، و/ مامکاك، ٢٩٢، دەزگای ئاراس ، ٢٠٠٧، ل ٢٩٢.

لایەنگرەکانیان لە ناو شارەکانداو لە خوێنەوارەکانو پەیوەندی عەشایەریان لاوازە. ئەمانە عەلمانینو دژی بیروڕای کەمالیو پێکهاتەی خێڵەکی کوردین. لە سەرەتادا بۆ سەربەخۆیی خەباتیان دەکرد، هەروەها بەلایەنی کەم خەباتیان لە پێناو گۆڕانی بنەڕەتییە لە دەستوری کۆماری تورکیاو بارێکی دوو دەسەڵاتی (کوردی-تورکی)یە لەناو تورکیادا. پاشان ستراتیجیان گۆڕا لە بۆ داواکاری گۆڕانی ڕیشەیی لە دەستوری کۆماری تورکیا. کە زمانو ناسنامەو مافە گشتییەکانی کۆمەڵگای کوردی لە تورکیا بە فەرمی بناسێنێت.

دووەم لایەن بریتین لەو کوردانەی کە ئاوێتەی تورکیا بوونو لە ڕیزی ڕەوتی ڕاسترەوی مامناوەند یان چەپرەوی مامناوەند چالاکی دەنوێنن. کە یان لە داموو دەزگا فەرمییەکانەوە یان لە پەیوەندییە خێلایەتیەکانەوە دەچنە ناو پەرلەمانو شوێنە نزیکەکانی دروستکەری بریار لە تورکیا، کە ئەمانە بە شێوەی سەرەکی لە شارەکانی ڕۆژئاوای تورکیا دەژینو پەیوەندیان لەگەڵ شارە کوردییەکانی ڕۆژهەلاتدا هەیە. ئەمانە کێشەیان نییە لەگەڵ دەوڵەت، بەڵکو ئامانجیان ئەوەیە، کە لە تورکیادا پێگەی خۆیان هەبێت.

سێیەمین بەش یان گروپ بریتین لە کوردە موسوڵمانەکان، کە ئامانجەکانیان ئاینین نەك نەتەوەیی، بەلام لەو کاتەدا کوردن، کە باس لە ناسنامەی تورکی دەکرێت. ئەمانە دژی باوەری عەلمانیو نەتەوەیی کۆماری تورکیانو حەزیان بە کارە لە چوارچێوەی کۆمەڵە ئیسلامیەکاندا. کوردە ئیسلامیەکان دوو بەشن، یەکەمیان نەقشبەندیو نورەسییەکانن، کە لەگەڵ تورکە هاو ڕێبازەکانیان دژی عەلمانیەتو نەتەوایەتی تورکین. هاوکات گروپێکی تریان سەر بە ئێرانیە توندرەوەکانن کە ناویان (حیزب اللە)[1] یە دژایەتی گروپی یەکەمو سێیەم دەکەن[1].

---

[1] ڕێکخراوێکی نهێنی توندرەوی ئیسلامییە سەرەتای دامەزراندنیان بۆ سەرەتای هەشتاکان دەگەرێتەوە لە باکوری کوردستان. ئەم پارتە لە دامەزراندنییەوە تا کۆتایی نەوەدەکان رۆڵێکی گرنگی بینیوە لە تیرۆرکردنی ئەندامانی (پ.ك.ك) وچالاکوانەکانی کورد. چونکە ئەم پارتە دژی دابەشبونی تورکیا خەباتی دەکرد. هاوکات لەم هەوڵەدا دەوڵەت بە نهێنی پشگیری لێدەکرد. دوای دەستگیرکردنی ئۆجالان لە فەبرایری ١٩٩٩، حکومەت هەڵمەتی لەناوبردنی ئەم ڕێکخراوەی دەسپێکردو ئێرانی بە پشگیری ئەم پارتە تۆمەتبار

وێڕای ئەم دابەشبونانەی کورد لە تورکیا، بەڵام هەموویان پێکەوە کێشەی ناسنامەی نەتەوەییان هەیە، ئەم کێشەیە پەرەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی لەبەر رۆشنایی گۆرانکارییە ناوچەییەکان‌و نێودەوڵەتییەکان. لە ئاستی ناوخۆییدا لە دوومین جەنگی کەنداوو کۆڕەوی باشوری کوردستان لە ساڵی (١٩٩١)و بریاری (٦٨٨)ی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە کورد، خۆی نواند. لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا سەرهەڵدانی داواکاری سەربەخۆیی لە کۆمارەکانی پاشماوەی یەکێتی سۆڤیەت‌و هەڵوەشاندنەوە خودی یەکێتی سۆڤیەت، سەرهەڵدانی ئاسۆیەکی روون لە ململانێی عەرەب-ئیسرائیل، هەروەها بڵاوکردنەوەی گەڵاڵە نامەی تایبەت بە کەمینەکان لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان‌و یەکێتیی ئەوروپاوە، دەرکەوت. هەموو ئەمان فاکتەری گرنگی دەرەکی بوون بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوی کوردایەتی لە تورکیا. لە ناوخۆشدا ناشتنی تەرمی گەریلاکانی (پ.ك.ك) بە شێوازی مەراسیمێکی نارەزایی، هێندەی تر کێشەی کوردی لە ناوخۆی تورکیادا خستە بەرچاو[٢].

کێشەی کورد لە ژێر کاریگەری ئەم گۆرانکاریەداو لە سایەی بیری لیبرلی ئۆزاڵدا هەنگاوی گەورەی هەڵهێناو دەرگای چارەسەری پرسی کورد لە لایەن لایەنە جیاوازەکانەوە دەستی پێکرد. ئەوە بوو لە ١٢ی ئەپریلی ١٩٩١ رێگە بە بەکارهێنانی زمانی کوردی درا، بەرەتکردنەوەی یاسای ژمارە(٢٩٣٢)ی ساڵی ١٩٨٣، کە جگە لە زمانی کوردی هەموو زمانێکی تر قەدەغە دەکات. ئەمە هەنگاوێکی گەورە بوو لە تورکیا بۆ کێشەی کورد . لێرەوە دەرگای چارەسەرکردنی کێشەی کورد کرایەوەو گفتوگۆ لەم بارەیەوە لە لایەن

---

کورد. ابراهیم خلیل علاف: خارطة التوجهات الاسلامیة فی ترکیا المعاصرة، مرکز الدراسات الاقلیمیة، جامعة الموصل، ٢٠٠٥، ص ص٤٧-٤٨

[1] M. Hakan Yavuz and Nihat Ali Özcan :THE KURDISH QUESTION AND TURKEY'S JUSTICE AND DEVELOPMENT PARTY. P107-108.

[٢] بیار مصطفی سیف الدین: کێشەی کورد لە پەیوەندیەکانی ئەمریکا-تورکیا، وەرگێرانی: سەرمەد ئەحمەد، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ل ١٩٥-١٩٨.

لایەنە جیاوازەکانەوە دستی پێکرد. ئۆزاڵ ئەم هەڵەی قۆستەوە بۆ ئەوەی کوردەکان بە شێوەیەکی دیموکراتی لە وڵاتەکەیدا بەشداری پێبکات[1]. ئەوەش لە رێگای گفتوگۆیەکی دیموکراسی لە نێوان کوردە بەرهەڵسکارەکانی تورکیا لە ناوخۆ، کە پارتی کرێکارانی گەل (Halkin Emek Partisi, HEP) لەگەڵ پارتی دیموکراتی[2] (DEP) دەگرتەوەو لە دەریشەوە، کە (پ.ك.ك). ئەو باوەری وابوو کە ئاشتی دەچەسپێت لە رێگای گفتوگۆ لەگەڵ (پ.ك.ك)، ئەم ئاشتیەش بە هەنگاوی ئاگربەست دەستپێدەکات[3].

هەریەك لە چیلەرو دیمیریل سور بوون لەسەر نەبوونی کێشەی کورد لە تورکیاو بە کێشەی تیرۆریان ئەژمار دەکردو بۆ چارەسەر کردنیشی رادەستی فەرماندە سەربازیەکانیان کردبوو[4]. دیمیرل هەرچەندە دانی بە (واقعی کوردی) نابوو، بەڵام ئەوەی رەت دەکردەوە کە کورد لە تورکیا کەمینەن، بەڵکو کەمینە تەنها ئەوانە دەگرێتەوە کە لە رێکەوتنامەی لۆزان هاتووە. هەر جۆرە باسێك لە کەمە نەتەوەیی کوردی و بە دامەزراوە کردنیان لە

---

[1] گولستان کوربای: تطور الحركة القومية الكوردية في تركيا منذ ثمانينيات القرن العشرين. في: هنری بارکی واخرون: القضية الكردية في تركيا، ترجمة: هڤال، مؤسسة موكرياني، اربيل،٢٠٠٧، ص ٤٧، بيار مصطفى سيف الدين: سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٠١

[2] پارتی کرێکارانی گەل لە ساڵی ١٩٩٠ وەك یەکەم پارت لە لایەن کۆمەڵێك کوردەوە دامەزرا. لە ئەندامە دیارەکانی لەیلا زاناو خەتیب دیجلەیە. ئەم پارتە لەگەڵ پارتی گەلی سۆسیال دیمکرات لە ساڵی ١٩٩١ بەشداری پەرلەمانی کردوو ئەندامەکانی بە کوردی سوێندی یاساییان خوارد. لە ساڵی ١٩٩٣ داخرا. لە هەمان ساڵدا پارتی دیموکرات وەك جێگرەوەی پارتی گەل . دامەزرا ئەمیش بە ناوی لایەنگیری بۆ سیاسەتی (پ.ك.ك) لە ساڵی ١٩٩٤ داخرا. پەرلەمانتارانی ئەم دوو پارتە کەوتنە بەر شاڵاوی تورکە توندڕەوەکان. لە ساڵی ١٩٩٣ محەمەد سنجار لە پارتی دیموکرات تیرۆر کرا. لەیلا زاناو حەوت ئەندامی تریان دادگایکرانو تا ساڵی ٢٠٠٣ کێشەکەیان لەناو دادگادا مایەوە. مایکڵ گەنتەر: فەرهەنگی مێژوی کورد، ل ٢٩٤.

[3] گولستان کوربای: المصدر السابق ص٤٨

[4] "Force Won't Solve Turkey's Kurdish Issue", The New York Times, March 21, 1994. http://www.nytimes.com

تورکیا بەرای ئەو دابەشکردنی دەوڵەت بوو. ئەو لەرێگای سوپاوە سەرکوتکاریەکانی لە ناوچە کوردییەکان ئەنجام ئەدا، هەروەها لەو ماوەیەدا بەهۆی پێشێلکاری بەرامبەر رۆژنامەنوسانو رێگری لێیان وای کردووە، کە زانیاری تەواو دروست لە بارەی پێشێلکاریەکانی حکومەت لەو ناوچانە دا بەتەواوی بەردەست نەکەوێت. پەلاماردانەکانی تورکیا بۆ سەر بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی، لە لایەن هێزە جۆراوجۆرەکانی تورکیاوە ئەنجام دەدرا. یەکەکانی کۆماندۆ (لەناو خەڵکی ئاسایدا بە رامبۆ ناودەبران) کە لەسەر شەری ناوچە شاخاویو ساردەکان راهێنرابوون، پشکی سەرەکی ئەو پەلاماردانەیان بەردەکەوت. هەروەها (پاسەوانی دێهاتەکان ,Koy Korucu) کە تا ساڵی ١٩٩٦ ژمارەیان ٦٧ هەزار کەس بوو، دواجار پۆلیسو جەندرمەش بەشدار بوون. پاسەوانی دێهاتەکان جگە لەوەی لە شەرێکی توندا بوون لەگەڵ (پ.ك.ك)، هاوکات بە پشتیوانی دەوڵەت، هۆکاری قوڵبونەوەی کێشە کۆمەڵایەتیو ململانێی خێلەکیەکان بوون. لە لایەکی تر حکومەت سیاسەتی راگواستنی زۆرە ملێ وقەدەغە کردنی خۆراك لەو ناوچانەی کە بە (دێهاتە ستراتیجیەکان) ناو دەبران جێبەجێ دەکرد. راگواستن ئەو دێهاتو ناوچانەی دەگرتەوە کە چالاکیەکانی (پ.ك.ك)ی تیدا گەرم بوو بۆ ئەوەی پشتیوانی ئەم ناوچانە بۆ (پ.ك.ك) نەهێڵێت، بە تایبەت لە ناوچەکانی بۆتان، ماردین، سیرت، هەکاری. کۆچبەرەکانیش رویان دەکردە شارەکان کە بە تەواوی لە لایەن سوپاوە کۆنترۆڵ بوو. ئەم سیاسەتە بە درێژایی سنوری سوریا عێراق ئێران و بە قولایی ١٥–٤٠ کم لە ناو خاکی تورکیدا جێبەجێکرا[1].

ئەم کۆچبەرانە هەمیشە لە شارە گەورەکانی تورکیا لایەن دەوڵەتەوە جێگای گومان بوون. هاوکات جێگای نیشانو پەلاماری ئەو تورك رەگەزانە بوون، کە رۆژانە لە جەنگی دەوڵەت لەگەڵ (پ.ك.ك) توشی زیانی مرۆییو مادی دەبوون. ئەمە وایکردبوو گیانی نەتەوەیی لای تورکو دەوڵەت بەهێزتر بێت، لای کوردیش خواستی تۆڵەسەندنەوە قولتر بووەوە، ئەنجامەکەشی پەرەسەندنی توندو تیژی بوو ،کە بوو بەهۆی سوتاندنو خراپبوونی ١٠ ملیۆن هکتار زەوی کشتوکاڵی، هەروەها دوو ملیۆن کورد دێهاتەکانیان چۆڵکرد،

---

[1] میخائیل م. جونتر: الاکراد ومستقبل ترکیا، ص ٥١-٥٢.

کۆمسیۆنی پەرلەمانی تورکیاش لە ساڵی ١٩٩٧ رایگەیاند، کە ٣٣٨٠ گوند لە ناوچەکە چۆڵ کراوە[١].

چارەسەری کێشەی کورد لای دەوڵەتی تورکیا یەکلایەنە، کە لەم خاڵانەی خوارەوە بەرجەستەبوو بوو:

١. هەوڵدان بۆ تواندنەوەی کورد لەناو کۆمەڵگەی تورکی بەجۆرێك دەستبەرداری مافی نەتەوایەتی خۆی ببێتو هاووڵاتیەکی دڵسۆز بێت بۆ دەوڵەتی تورکیا.

٢. وەڵامدانەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردی، چەکدار بێت یان بێ چەك، بەتووندترین شێوازی سەربازیو بەکارهێنانی چەمکی تیرۆر لەبەرامبەریدا.

٣. چارەسەرکردنی کێشەکانی باکووری کوردستان لەرێگەی پرۆژەی ئابووریو بەستنەوەی کێشەی نەتەوەیی کورد بەدواکەوتووی ئابوری ناوچەکە[٢]. دیمیریل سەرۆك کۆماری تورکیا لەساڵی١٩٩٢ دەڵێت: "کورد لەمافی کەم نییە، ئەوەی ئەوان داوای دەکەن ئیمتیازە، ئێمەش ئیمتیاز بەکەس نادەین، من تورکیا دابەشناکەم". "ئێمە کێشەی کوردمان نییە، بەڵکو کێشەی تیرۆرمان هەیە، فێربوونی زمانی کوردی دەبێتەهۆی بەشکردن، تاکێشەی تیرۆر چارەسەر نەکەین ناتوانین کێشە رۆشنبیریەکان چارەسەر بکەین"[٣].

لە بەرامبەردا سەرکردەی (پ.ك.ك)، عەبدوڵا ئۆجالان لە چاوپێکەوتنێکدا، کە مایکل گۆنتەر لە مایۆی ١٩٩٨ ئەنجامی داوە، دەڵێت:"چارەسەری کوێرانەو توندرەوانەی تورکیا بۆ کێشەی کورد، یارمەتیدەری بەهێزی لەدایکبونی هۆشی نەتەوەیی کورد بووە بە

---

[١] المصدر السابق، ص٥٤-٥٧.

[٢] فليب روبنس: تركيا والشرق الاوسط، ترجمة: ميخائيل نجم خوري، الطبعة الثانية، مكتبة مدبولى، القاهرة، ١٩٩٣، ص٤٤.

[٣] المسألة الكردية فى تركية الامل والخيبات، مجلة (شوون تركية) مركز الدراسات الاستراتيجية والبحوث والتوثيق، العدد٨، ص٣٠.

شێوەیەکی مەزن. من نامەوێت تورکیا دابەش بکەم، دەمەوێت بە دانیشتن بە ڕێگایەکی دیموکراسی ڕێگاچارە بدۆزینەوە. ئەوان دەبێت دان بە ناسنامەی کوردو فدراڵی بنێن [1].

یان لە شوێنێکە تر پێشنیاری خۆی بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو:

١. کێشەی کورد وەك بنەمایەکی دیموکراسی چارەسەر بکرێت کە لە یاساو دەستوردا دانی پێدا بنرێت

٢. زمانو مافی ڕۆشنبیری بە یاسا چارەسەر بکرێت، نابێت سانسۆر لەسەر ڕادیۆو تی ڤیو ڕاگەیاندن هەبێت.

٣. زمانی کوردی زمانی پەروەردە بێت لە خوێندنگاکان.

٤. بەربەستەکانی ئازادی لابرێتو ڕێز لە ئازادی بگیرێت بە تایبەت ئەوەی، کە پەیوەندیی بە کێشەی کورد هەیە.

٥. یاسای هەڵبژاردن دیموکراسی بێتو بەشێوەیەك بێت کورد توانای بەشداری هەبێت.

٦. یاسای ناوچە کارگێڕیەکان پێویستە دابنرێت تا دیموکراسیەت بەربلاو بێت.

٧. پاسەوانی دێهاتەکانو چەتە ناشەرعیەکان نەمێنێت.

٨. گەڕانەوەی ئاوارە دێهاتییەکان بۆ زێدی خۆیانو هەڵمەتی گەشەکردن پەیرەو بکرێت لە ناوچەکانیان.

٩. پێویستە پێگەی کۆمەلایەتیو بەشداری دیموکراسی بۆ گەریلاکان فەراهەم بێت بە دورخراوەکانو زیندانییەکانیشەوە [2].

---

[1] Abdullah Öcalan: "We Are Fighting Turks Everywhere" ،Middle East Quarterly ،June 1998. http://www.meforum.org/

[2] Abdullah Öcalan: Proposals for a Solution to the Kurdish Question in Turkey December 2007 To the International Conference on EU, İmralı Sole Inmate Closed Prison Translation from Turkish original: International Initiative – www.freedom-for-ocalan.com

# تەوەری چوارەم
# پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ هەرێمی کوردستان

تورکیا لە روانگەی بەهێزکردنی رۆڵی خۆی لە ئاستی ناوچەیی و نێودەوڵەتی، خواستی ئەوەی هەبوو کە ببێتە دارێژەری یەکێك لە سیناریۆکانی عێراق لە دوای کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی کەنداو. سیناریۆی ئۆزاڵ بۆ عێراق بریتی بوو لە رووخانی رژێمی سەدام حسێن و دامەزراندنی عێراق لەسەر بنەمای فدراڵی، بەو پێیە عێراق بەسەر کوردو تورکمان و عەرەبدا دابەش دەبوو. لەم روانگەیەوە ئۆزاڵ تورکیای ئامادە کرد کە مامەڵە لەگەڵ بزوتنەوەی کوردیدا بکات کە چاوەروان دەکرێت لەو بەشە فدراڵییەی عێراق بەشیان بەربکەوێت و بە حوکمی جوگرافیای نەتەوەییان، ببنە هاوسێی تورکیا. لە راستیشداو لە میانەی گەلاڵە بوونی چۆنیەتی مامەڵەکردنی تورکیا لەگەڵ داهاتوی عێراق و کورد، راپەرین لە ٥ی مارتی ١٩٩١ دەستی پێکردبوو، کە زۆرێك لە ناوچەکانی سلێمانی و هەولێرو کەرکوکی گرتبووەوە.

ئەمەش پاڵپشتێك بوو بۆ ئەوەی تورکیا پەلە بکات لە کردنەوەی دەرگای پەیوەندیەکان بەرووی سەرکردەکانی ئەو بزوتنەوەیەداو دوای چەند کۆبونەوەیەکی سەرانی کوردو تورك،

لە رۆژی ١١ی مارت١٩٩١ تاڵەبانی كۆبونەوەیەكی نهێنی لەگەڵ ئۆزال كرد، دواتر ڕایگەیاند لە توركیاوە پشتگیریو سۆزی بۆ گەلی كورد دەستكەوتووە"[١].

ئەنجامەكانی ئەم كۆبونەوانە وەرچەرخانێكی گرنگ بوو لە پەیوەندییەكانی نێوان بزوتنەوەی نەتەوایەتی كوردی هەرێمی كوردستانو حكومەتی توركیا، چونكە بۆ یەكەمجار دەرگا لەسەر پەیوەندییەكانی نێوان توركو كورد كرایەوە وەك دوولایەنی خاوەن بەرژەوەندیی هاوبەش، لەكێشەیەكی زۆر ئاڵۆزی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، كەكێشەی كوردبوو. بەدوایدا تاڵەبانی گرێیەكی گەورەی لەستراتیژیەتی توركیا كردەوە، ئەویش ئەوەبوو بزوتنەوەی نەتەوایەتی كورد لە هەرێمی كوردستان ئامانجیان گۆڕینی نەخشەی عێراق نییەو پابەندن بەیەكیەتی خاكی عێراقو سنووری مافەكانیان لەهەرێمی كوردستانەوە بۆ هیچ دەوڵەتێكی ناوچەیی تێپەڕ ناكات، سەرباری هەموو ئەمانە ئۆزال یەكەم سەركردەی جیهان بوو، كە دەرگای لەسەر بە نێودەوڵەتیكردنی كێشەی كورد كردەوە نەك لە ناوچەكەدا، بەڵكو لە هەموو جیهاندا. پێش ئەمریكاو ئەوروپا كۆشكی كۆماری بۆ سەركردە كوردییەكان ئاوەلا كردو ئەو گەمارۆ دبلۆماسیەی لەسەر بزوتنەوەی نەتەوەیی كوردی شكاند، كە لە ساڵی ١٩٧٥ بەسەریاندا سەپا بوو. هاوكات ئەو یەكەم سەركردە بوو، كە رۆڵی كوردی لە دوومین جەنگی كەنداودا دەرخست، چونكە پێشتر كورد خواستی ئەوەی هەبوو كە بەشدار بێت لەو جەنگەدا، بەلام هاوپەیمانان ئامادە نەبوون وەلامی كورد بدەنەوە[٢].

ئۆزاڵ بۆ بەپراكتیككردنی سیناریۆكانی دوو نەخشە رێگای هەبوو ، یەكەمیان لە رێگای هێزەوە بچێتە باكوری عێراقو بەشێك لە عێراق بە ناوی مافی مێژوویی بۆ خۆی ببچرێت كە ئەم پلانە نارەزای سوپاو بەشێكی گەورەی حكومەتی لێكەوتەوە، چونكە نەیاندەویست راستەوخۆ توركیا لە كێشەی عێراقەوە بگلێت، بۆیە پاشەكشەی لەو بیرۆكەیە كرد.

---

[١] (وقائع تطور العلاقات بين تركيا والآكراد العراقين)، اعداد: محمد نورالدين، مجلة (شؤن تركية)، العدد(٢)، ١٩٩٢، ص١٣.

[٢] جوناثان راندل: أمة في شقاق، دروب كردستان كما سلكتها، ترجمة: فادى حمود، دار النهار، بيروت١٩٩٧، ص١١٢-١١٣

دووەمیان بریتی بوو لە پێشگیریکردنی کۆنفدراڵی بۆ کورد لە هەولێرو سلێمانیو دهۆك، بۆ تورکمان لە موسڵو کەرکوك، بۆ عەرەب لە باشور. پەیوەندی کردنیشی بە سەرکردایەتی کوردەوە لەم روانگەیەوە بوو. ئەو دەیویست لە دوای راگەیاندنی کۆنفدراڵی، لە تورکیاشدا فدراڵی رابگەیەنێتو ناوچەی فدراڵی کوردی تورکیا لەگەڵ کۆنفدراڵی کوردو تورکمانی عێراق یەکەیەکی کۆنفدراڵی پێکبهێننو دواتر هەرسێ کۆنفدراڵیەکە بەشێوازێکی خۆویستانە بچنەوە سەر تورکیا، لێرەوە بیرۆکەی (یەك دەدەین، سێ وەردەگرین) لە تورکیا سەری هەڵدا[1]. ئۆزاڵ لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١ وتی: "دەبێت روونو ئاشکرا بێت ئەو کوردانەی لە ناوچە کوردییەکانی عێراقن، خزمو کەسوکاری هاولاتیانی تورکن، بۆیە سنورەکان تا رادەیەك دەسکردنو خەڵکیان کردووە بە دوو بەشی جیاوە". تاڵەبانیش ئەم بیرۆکەیەی پەسەند بوو، لەو روانگەیەوە پێشنیاری ئەوەی کرد کە رەنگە کوردەکانی عێراق داوا بکەن، کە بە تورکیا بلکێنرێنو لەگەڵ تورکیا یەکبگرن[2]. ئەحمەد کوری ئۆزاڵ لە ساڵی ٢٠٠٢ هەمان ئەو رایەی باوکی دوپاتکردەوەو وتی:" خەڵکی ئەو ناوچەیە (مەبەستی هەرێمی کوردستان بوو) لە رێکەوتنامەی لۆزاندا براو کەسو کاری ئەو خەڵکانەن کە ئیستا لە چوار چێوەی ئێرە (مەبەستی تورکیا بوو) دەژین"[3]. ئەم بیرۆکەش کاتێك بڵاو بۆوە پێشوازی لێنەکرا، دیمیرل لەم بارەیەوە پێشوازی لە دانوستانی کورد لەگەڵ بەغداد کرد بە شێوەیەك، کە بارودۆخێکی دیموکراتی بێنێتە کایەوە کە کوردو عەرەبو تورکمانو مەسیحی لە سایەیدا بژین، بەڵام ئەوەی رەت کردەوە کە ئەو مافانەی کە بە کورد لە عێراق دەدرێت تورکیاش پێوەی پابەند بێت[4]. لێرەدا لێدوانی بەرپرسەکانی تورکیا ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە گۆڕانێك لە بۆچونی تورکیا سەبارەت بە کێشەی کورد سەری

---

[1] دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل ١٣١.

[2] مراد خۆشەڤی حەسۆ: سەرچاوەی پێشوو،ل ٨٠-٨١

[3] یەك دەدەین...سێ وەردەگرین، وەرگێرانی: دانا زەندی، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٤٦-٤٧.

[4] احمد حسین: المصدر السابق: ص٩٣

هەڵدا، ئەویش ئەوە بوو، کە سنووری سیاسیی نێوان دەوڵەتە ناوچەییەکان نەیتوانی سنوور بۆ پەیوەندییە سروشتییەکانی ئەو نەتەوەیە دابنێن.

رەشەبای رووداوەکانی هەرێمی کوردستان بەو شێوەیە نەدەرۆشت، کە خواستی کەشتی تورکیا بوو. ئەوەبوو راپەرینی کورد زۆر بە خێرایی تەشەنەی کردو بەهەمانشێوە زۆر بەخێرایی لە لایەن سوپای حکومەتی بەغداوە لە ٢٩-٣٠مارتی١٩٩١کپکرایەوەو شەپۆلێکی گەورەی ئاوارە کە بە نیو ملیۆن کەس خەملێنرا بوون روویان کردە ترکیا[1]. بە سەرهەڵدانی کۆرەو تورکیا کەوتە گێژاوێکی گەورە، کە خۆی بۆ ئامادە نەکردبوو، چونکە ئۆزاڵ خۆی بۆ رووخانی سەدام ئامادە کردبوو نەك کۆرەو. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا، لە ٢ی ئەپریلی ١٩٩١ لە کۆبونەوەیەکدا سەبارەت بەم رووداوە ئەوەی خستەڕوو، مەبەستی عێراق لەئاوارەکردنی دانیشتوانەکەی تێکدانی ئاسایشی تورکیایە، ئەنجومەنەکە ئەو بۆچوونەی لا گەلاڵە بوو، کە بەوێنەی ئاوارەکانی فەلەستین*، کە لە لوبنان‌و ئەردەن نیشتەجێبوون، بەهەمان شێوە کوردە ئاوارەکان لەناو تورکیادا نیشتەجێدەبن‌و کێشەی کورد لەتورکیا هێندەی تر ئاڵۆز دەبێت[2]. هاوکات ئەگەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ئاوارەکان پشتگوێ بخات، ئەوا تورکیا توشی قەیرانێکی گەورەی ئابوری دەبێت[3].

تورکیا لە ٣ی ئەپریلی ١٩٩١ یاداشتنامەیەکی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بەرزکردەوە، کە ژمارەی زۆری ئاوارەکانیان بە هەرەشە بۆ سەر ئاشتی‌و ئاسایشی ناوچەکە لەقەڵەم دابوو[4]. هاوکات دەرگای سنوری کردەوە، کە ئاوارەکان بچنە ناو سنووری تورکیا، بەڵام لە

---

[1] Human Rights Watch :The 1991 uprising in Iraq and its aftermath.

* لە ساڵی (١٩٤٨) بە دواوە ،فەلەستینیەکان لەژێر فشاری ئیسرائیل، دەستە دەستە ئاوارەی دەوڵەتە هاوسێکان دەبن‌و تیایدا نیشتەجێ بوون‌و چەندین گرفتیان بۆ ئەو دەوڵەتانە دروست کردووە.

[2] عبد الرحمن سلیمان زیباری:المصدر السابق،ص٢٦١.

[3] The New York Times, THOMAS L. FRIEDMAN : AFTER THE WAR; Baker Sees and Hears Kurds' Pain In a Brief Visit at Turkish Border ، ، April 9, 1991. http://www.nytimes.com/

[4] بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ٣ ).

بارێکی نالەباری ساردو باراناویدا رێگای نەدا ئاوارەکان لە سنوور دور بکەونەوە. سەربازە تورکەکان بە شێوازێکی توندو تیژ مامەڵەیان لەگەڵ ئاوارەکان دەکردو لێیا دەدان و ئەو یارمەتییەیان دەبرد، کە بۆیان هاتبوو، هەروەها بەهۆی بیرۆکراتی تورکیاوە، رێگری زۆر دەهاتە پێش کاروانی یارمەتییەکان، کە ئەوەش شەپۆلێکی نارەزایی رۆژئاوای پەیدا کردبوو[١]. کاتێکیش وەزیری دەرەوەی ئەمریکا جیمس بیکەر هاتە سەر سنووری نێوان تورکیاو عێراق رایگەیاند کە "کێشەی کورد کێشەیەکە مرۆییەو وەڵامێکی مرۆیی هەیە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە پێویستە"، ئەم پەیامە بە دڵی تورکیا نەبوو، چونکە بە رای ئەوان کاتێك ئاوارەکان (٣٠) هەزار کەس بن، ئەوا کێشەیەکی مرۆییە، بەڵام کە ژمارەکە گەیشتە نیو ملیۆن، ئەوا لە کێشەی مرۆیی دەردەچێت و دەبێتە کێشەیەکی سیاسی. لە لایەکی تر رای گشتی تورکیا بە سەرکردەکانیشەوە وابوو، کە هۆکاری ئاوارەبوون، دەگەرێتەوە بۆ ئەنجامی کارەکانی رۆژئاوا لە عێراقداو خودی هاوپەیمانان لەم کێشەیە بەرپرسن، هەندێکیش پێیان وابوو، کە پلانێکی رۆژئاوایی لە پشتە بۆ تێکدانی باری تورکیاو رێگا خۆشکردنێکە بۆ چالاکردنی کورد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی. ئۆزاڵ بۆ هەڵسەنگاندنی رەوشەکە، خۆی سەردانی ئاوارەکانی کرد لە سلۆپی و رایگەیاند، کە ئەم کارکارەی تورکیا پێویستە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا دەستخۆشی لێبکرێت[٢]. تورکیا لەو کاتەدا بۆ پارسەنگ لە نێوان بەرژەوندیەکانی خۆیی و هەماهەنگی لەگەڵ هاوپەیمانان و کێشەی ئاوارەکان[٣]، لە بری کردنەوەی سنور، پلانی ناوچەی ئارامی پێشنیار کرد، کە تیایدا کورد پارێزراو بن و فرۆکەی عێراقی لە ئاسمانەکەیدا قەدەغە بکرێت. ئەمەش لە لایەن

[1] The New York Times, CLYDE HABERMAN: Turks Angry as Kurd Aid Backfires. May 17, 1991. http://www.nytimes.com

[2] Ibid.

[3] بیار مصطفى سيف الدين: تركيا وكوردستان العراق "الجارين الحائرين"، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، ٢٠٠٨، ص١٧٠

بریتانیاو فەرەنساو ئەمریکا پشگیری لێکرا[1]. تورکیا لە رێگای (OPC) خەونی دەستێوەردانی لە کاروباری عێراق هاتەدی‌و ئەو خەونەشی لە رێگای بریاری (٦٨٨)ی نەتەوی یەکگرتووەکان بە یاسایی کرا. پەرلەمانی تورکیا لەمانگی ئەپرلی١٩٩١، ڕەزامەندی لەسەر بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیك دەربڕی کە بۆ ماوەی شەش مانگ لە لایەن هاوپەیمانان لە میانەی (ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی) بەکاربهێنرێت[2].

لە دوای ساڵێك بەسەر تێپەربوونی کێشەی ئاوارەکان، تورکیا بەرەو رووی کێشەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی‌و دامەزراندنی حکومەت‌و راگەیاندنی فدراڵی بووەوە لە هەرێمی کوردستان. هەڵوێستی تورکیا لەم بارەیەوە ئەوە بوو، کە هەڵبژاردنی پەرلەمانی لەگەڵ سیاسەتی دەرەوەی تورکیا ناگونجێت‌و حکومەتی هەرێمی کوردستان حکومەتێکی ناشەرعییە[3]. لە قۆناغی دامەزراندنی دەسەلات لە هەرێمی کوردستان تا دەسپێکردنی جەنگی ناوخۆ لە ساڵی (١٩٩٤)، سیاسەت دەرەوەی تورکیا لە بەرامبەر هەرێمی کوردستان لە سێ بازنەدا کاری دەکرد. بازنەی یەکەم بازنەی نێودەوڵەتی بوو. تورکیا لە ئەنجامی رێگە دان بە پرۆسەی (OPC)، هەوڵەکانی خستبووە گەر لەپێناو ئەوەی (OPC) تەنها لە چوارچێوەیەکی مرۆیدا بۆیارمەتیدانی خەڵکی کوردستان بمێنێتەوە نەك وەك پرۆژەیەکی نێودەوڵەتی بۆ پشگیری سیاسی‌و ئابوری لە دەسەلاتی هەرێمی کوردستان. ئەوە بوو کاتێك، کە بارزانی سەردانی ئەمریکای کرد لە یۆلیۆی ١٩٩٢ بۆ ئەوەی کە هەرێمی کوردستان بێبەری بکرێت لەو گەمارۆ ئابووریەی کە بەسەر عێراقدا سەپاوە، توشی شۆك بوو کاتێك ئەمریکیەکان پێیان راگەیاند، کە واشنتن‌و پاریس‌و لەندەن ئەم کارە پەسەند ناکەن،

---

[1] ئیریك جەی. زوچەر: سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٥١٩-٥٢٠.

[2] رواء محمد ملا: المصدر السابق، ص ص ١٢٣-١٢٤.

[3] فرسەت ئەحمەد عبدالله‌و ئەوانی تر: کوردستان دیموکراتیەت سیاسەت، چاپی سێیەم، چاپخانەی خەبات، هەولێر، ساڵی ٢٦٩٩ی کوردی، ل ٥٦، وقائع العلاقات بین ترکیا ولاکراد، اعداد: محمد نورالدین، مجلة(شؤون ترکیة)، العدد(٢)، ص١٣

چونکە لە لایەن تورکیاوە بە هەوڵی بوژاندنەوەو پتەو کردنی ژێرخانی ئابووری کورد لە قەڵەم دەدرێت کە ڕێگا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی خۆش دەکات[١].

بازنەی دووەم بازنەی ناوچەیی بوو ئەمەش لە ڕێگای دانیشتنە سێ قۆڵییەکانی تورکیا لەگەڵ ئێران‌و سوریادا کاری لەسەر هەڵوێستێکی یەکگرتووی ناوچەیی دەکرد لە بەرامبەر هەرێمی کوردستان[٢].

بازنەی سێیەم بازنەی پەیوەندییەکانی تورکیا بوو لەگەڵ هەرێمی کوردستان کە پێکهاتبوو لە کارئاسانیکرد بۆ گەیشتنی یارمەتییە مرۆییەکان بۆ هەرێمی کوردستان، لە بەرامبەر یارمەتیدانی هەرێمی کوردستان بۆ بنەبرکردنی کێشەی (پ.ك.ك) لە تورکیا. لە میانەی سەردانی تاڵەبانی بۆ دامەزراندنی بناغەی پەیوندی نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان لە مانگی یۆنیۆی ١٩٩٢، دیمیریل وەك سەرۆکی حکومەت، مەرجی ئەم پەیوەندییەی بە باری جێگیری ئاشتی‌و ئاسایشی هەرێمی کوردستان بەستەوە، کە ئەو بارە جێگیرییەش بە نەهێشتنی مەترسی (پ.ك.ك) بەدی دێت[٣]. بە واتایەکی تر، تورکیا چۆنیەتی پەیوەندیەکانی لەگەڵ هەرێمدا بە چەندێتی هاوکاریکردنی هەرێم بۆ لەناوبردنی (پ.ك.ك) بەستبووەوە . وتەبێژی بەرەی کوردستانی هۆشیار زێباری لەم بارەیەوە ووتی" تورکیا لە خەباتی دژە سەدام، شادەماری ژیانی ئێمەیە بەرووی رۆژئاواو جیهاندا، ئێمە لە ڕێگای هاوکاریکردنمان لەگەڵ تورکیا پشگیری نێودەوڵەتی‌و پارێزگاری ئاسمانی بەدەست دەهێنین. خۆ ئەگەر ئۆپەراسیۆنی (OPC) ڕەتکرایەوە، ئەوا هێزەکانی سەدام دووبارە دەست بەسەر ناوچەکەدا دەگرێت‌و هەموو شتێك دەدۆڕێنین". هاوکات تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٩٢ وتی: "کوردی عێراق بە هیچ شێوەیەك یارمەتییەکانی حکومەت‌و گەلی تورکیایان لە

---

[1] بیار مصطفی سیف الدین: ترکیا وکوردستان العراق، ص ص ١٧٢-١٧٣

[2] بروانە بەشی ئینجەم، تەوەری دووەم، ل ١٩٨

[3] هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: سەرچاوەی پێشوو: ل ل ١٠٣-١٠٤

کاتە ناخۆشەکاندا لەبیر ناچێت"، بەڵکو لەوە زیاتری وت کە داوای "فدراڵی لەگەڵ تورکیادا" کرد[1].

لەم تێگەشتنەی بڕیارکردەکانی کوردەوە، هەرێمی کوردستان بە ناچاری کەوتە ژێر باری فشارەکانی تورکیا بۆ هاوکاریکردنی تورکیا لە چارەسەرکردنی کێشەی (پ.ك.ك). ئەوە بوو حکومەتی هەرێم شەری لە دژی (پ.ك.ك) لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢راگەیاندو بە هاریکاری تورکیا، (پ.ك.ك) شکستی هێناو خۆیان رادەستی هێزەکانی (ی.ن.ك) کردو لە سنوری هەرێم– تورکیاوە پەرینەوە بۆ سنوری هەرێم–ئێران. سەرۆك ئەرکانی تورکیا (جنراڵ دۆگان غوراس) کوژراوەکانی (پ.ك.ك)ی بە (٤–٥) هەزار مەزەندە کردبوو، بەڵام دەرکەوت، کە لە چەند سەد کەسێك تێپەری نەدەکرد[2].

ئەم شەرە بە بەشداری (١٥–٢٠) هەزار پێشمەرگەو (٥) هەزار سەربازی تورك کە بە یارمەتی فرۆکەی ( F-4 Phantoms)، (F-104Starfighters)، هەلیکۆپتەری ( Super Cobra)، فرۆکەی چاودێری (Awacs) لە دژی (پ.ك.ك) ئەنجام درا. گروپی مافی مرۆڤ لە رۆژهەلاتی ناوەراست (Human Rights Group Middle East Watch) لە راپۆرتێکدا کە لە ٢١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ بلاوی کردەوە، ئیدانەی حکومەتی تورکیاو کوردەکانی عێراقیان کرد. زۆرێك لە گەریلا ئافرەتەکانیش خۆیان کوشت، بۆ ئەوەی نەکەونە دەستی پێشمەرگەو سوپای تورکیا. دەتوانین بلێین تورکیا بە پشتگوێخستنی لە راگەیاندنی فدراڵی لە لایەن پەرلەمانی هەرێمی کوردستانەوە، هاوکاری هەمیشەیی تالەبانیو بارزانی بۆ دژایەتیکردنی (پ.ك.ك)، بەدەست هێنا. ئۆجالانیش لەم بارەیەوە ووتی کە: " ئەو رێکەوتنە لەسەر نەفەقەی کوردی تورکیا بوو"[3].

[1] میخائیل م. جونتر: الاکراد ومستقبل ترکیا، ص ١٤٦–١٤٧

[2] میخائیل م. جونتر: الاکراد ومستقبل ترکیا، ص ١٧٨ .

[3] The New York Times, VERA BEAUDIN SAEEDPOUR :On Iraq-Turkey Border, Kurds Are Being Used to Kill Kurds,November 14, 1992 : http://www.nytimes.com/

ئەگەر چی تورکیا بە یارمەتی هەرێم لە شەڕەکەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو (پ.ک.ک) لە بەرەکانی جەنگ لاواز بوو، بەڵام نەیتوانی کۆتایی بە جەنگی کوردی–تورکی بهێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ململانێ نەتەوەییەکان تا دەهات لە تورکیا توند تر دەبوو، وێرای ئەمەش هەرێمی کوردستان لە بری هاریکاری شەڕانگێزی بۆ تورکیا، ویستی هاریکاری ئاشتیانە لەگەڵ تورکیا بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد تاقیبکاتەوە. بەواتایەکی تر لاوازی (پ.ک.ک)و ئاڵۆزبونی رەوشی ناوخۆی تورکیاو بونی نێوەندێکی وەك هەرێمی کوردستان کە بەرژەوەندی خۆی لە ئاشتی نێوان دەوڵەتی تورکیاو بزوتنەوەی کوردی باکوری کوردستان دەبینییەوە، هاوکات پەیوەندی باشی تاڵەبانی لەگەڵ ئۆزاڵو ئۆجالان ئەم هەولانەی بەرەو پێشەوە برد.

ئەرجان ورالهان، کە وەزیری بەرگری دووەمین حکومەتی ئۆزاڵ بوو هەروەها پەیوندیی کەسێتی لەگەڵ تاڵەبانیدا هەبوو، پردی پەیوەندی نێوان بیروڕاکانی ئۆزاڵو تاڵەبانی بوو. دوای ئەوەی تاڵەبانی چەند جارێك بانگهێشتی تورکیا کرا، توانی بیرۆکەی ئاشتی نێوان (پ.ک.ک)– تورکیا وەگەڕ بخات. ئەوە بوو سەردانی ئۆجالانی لە بقاع کردوو توانی ئۆجالان بە ئاگربەست رازی بکات لە ١٧ی مارتی١٩٩٣. دواتریش راوێژکاری دیمیریل ( عیسمەت ئیمیست) رۆژنامەنوس و راوێژکاری ئۆزاڵ (جەنگیز چاندار) لەگەڵ چەند پەرلەمانتارێکی پارتی (DFP) لە بقاع چاویان بە ئۆجالان کەوت، جارێکی تر ئاگربەست لە ١٦ی ئەپرەلی١٩٩٣ درێژکرایەوە[1].

تاڵەبانی کە لەو کاتەدا دوژمنێکی سەرسەختی ئۆجالان بوو لە ٨ی مارتی ١٩٩٣ دەسپێشخەری ئاشتی کردو پێشنیارەکانی ئۆجالانی گەیاندە دەستی دیمریل و ئۆزاڵ. هاوکات توانی کمال بورقای سکرتێری پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا لەگەڵ ئۆجالان کۆبکاتەوە لە دیمەشق بۆ دروستکردنی بەرەیەکی کوردی، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە شێوەیەکی ئاشتیخوازی. ئەو کۆبونەوەیە دوو گەلاڵەنامەی

[1] المحادثات السرية بين PKK حزب العمال الكردستاني والدولة التركية، دار الشمس للدراسات والتوزيع، دمشق، ٢٠٠٠، ص ص ٣٨-٣٩

لێکەوتەوە: یەکەمیان بریارو پێشنیارەکان، کە بۆ کورد خۆی بوو، کە باسی لە پێویستی هاریکاری نێوان پارتە کوردییەکانی کردبوو، هەروەها ئەو پارتانە لە ڕێگای دانوستانەوە کێشەکانیان چارەسەر بکەنو کار لە پێناوی بەرەیەکی کوردستانی بدەن، لە باسی پەیوەندیی نێوان تورکو کورد بەشێوەیەکی یەکسانی، ئەو دوو پارتە لەو باوەڕەدا بوون کە کوردو تورك وەك دوو نەتەوە دەتوانن لە سایەی سیستەمێکی دیموکراسی فدراڵیدا لە پاڵ یەکدیدا بژین. لە گەڵاڵە نامەی دووەم باسیان لە ٧ هەنگاو کردبوو، کە پێویستە بۆ چەسپاندن ئاشتیو دیموکراسیو یەکسانی، حکومەتی تورکیا بیگرێتەبەر[1].

ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەی تورکیا لە ١ی ئەپریلی١٩٩٣ بەئامادەبوونی ئۆزاڵو دیمیریلو سەرەك ئەرکانی سوپا، چەند بڕیارێکیان بەناوی (پلانی کوردی حکومەت) دەرکرد، تیایدا ئاماژە بەچەند خاڵێکی گرنگ کرابوو، لەوانە: ڕاستکردنەوەی یاسای لێبوردن بەشێوەیەك ئەندامانی (پ.ك.ك) بگرێتەوەو ڕەتکردنەوەی باری نائاسایی لە چەند پارێزگایەكو زیادکردنی دەسەلاتی پارێزگاکانو بەهێزکردنی وەبەرهێنان لە باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیاو چەند بڕیارێکی تر[2]. لە توێژینەوەیەکیشدا، باس لەوە دەکات کە ئۆجالان لە میانەی دادگایکردنەکەیدا لە ١٩٩٩، دان بەوەدا دەنێت، کە لە کاتی گفتوگۆکانی ١٩٩٣دا لەگەڵ ئۆزاڵ چاویان بەیەك کەوتووە[3].

ئاگر بڕی نێوان (پ.ك.ك)و حکومەت لە ٨ی یولیۆی ١٩٩٣ کۆتایی پێهات، لە ئەنجامی چەند هۆکارێك، لەوانە مردنی ئۆزال لە ١٧ی ئەپریلی١٩٩٣، کە پشتیوانی سەرەکی پرۆژەی ئاشتی بوو لەناو دەوڵەتی تورکیا، لە جێگەیدا دیمیریل، لە١٦ی مایۆی١٩٩٣دا بوو بەسەرەك کۆماری تورکیاو لەگەڵ خۆیدا چەندین کەسایەتی کۆنەپارێز لە ناوەندی دەسەلاتدا بوون بە بڕیار بەدەست، کە دژی پرۆژەی ئاشتی بوون. دیارترین هۆکاری دەستپێکردنەوەی

---

[1] میخائیل م. جونتر: الاكراد ومستقبل تركيا، ص١١٣

[2] المسألة الكردية في التركية امل وخيبات : مجلة (شؤون التركية )، اعداد:محمد نورالدين، العدد(٨)،١٩٩٣، ص٣١ .

[3] المحادثات السرية بين PKKحزب العمال الكردستاني والدولة التركية، ص ص١٠٢

توندوتیژی، کوشتنی (٣٣) سەربازی بێ چەك بوو لەلایەن شەمدین ساکیکی سەرکردەی (پ.ك.ك)، لە ٢٥ی مایۆ١٩٩٣. ئەم ڕوداوە سەرکردە سەربازییەکانی تورکیای هاندا زنجیرەیەك کاری سەربازی لەدژی سەنگەرەکانی (پ.ك.ك)و ئەندامەکانیان دەستپێبکەن[1]، کە کۆتایی بەماوەی ئاشتی نێوان هەردوولا هێنا.

لەگەڵ ئەوەی پرۆژەی ئاشتی سەری نەگرت، بەڵام ئەو باوەڕەی سەلماند، کە گەشەکردنو بەرەوپێشەوەچوونی دۆسیەی کورد لە هەر پارچەیەك، کاریگەری دەبێت بۆ پارچەکانی تری کوردستان، هەروەها گەشتاندنی بیری فیدرالی باشوور بوو بۆ باکوری کوردستان، وەك ڕێگە چارەیەکی کێشەی کورد لە تورکیادا. لە لایەکی تر ناوبژیوانی تاڵەبانی لە نێوان تورکیاو (پ.ك.ك)، سۆزو هۆشی کوردەکانی تورکیای بەرامبەر کوردی عێراق بەدەست هێنا، کە ئەمە زەنگێکی خەتەرناك بوو بۆ تورکیا. بۆیە ئەمە هۆکارێکی گرنگ بوو، کە دوای مەرگی ئۆزاڵ، تورکیا دەسبەرداری سیاسەتی ئەم سەرۆکە ببێت بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ کێشەی کورددا.

پەیوەندییەکانی تورکیاو هەرێمی کوردستان هێشتا لە قۆناغی یەکەمی سەرەتایدا بوو، لە کاتێکداو دوای مردنی ئۆزاڵ، کۆنە پارێزەکان جڵەوی سیاسەتیان بەدەستەوە گرت، تەریب لەگەڵ ئەم گۆڕانانە هەرێمی کوردستان توشی جەنگی ناوخۆ بوو لە ساڵی ١٩٩٤دا. کە ئەم دوو پێشهاتە چاوەڕوان نەکراوە، پەیوەندییەکانی بە ئاقارێکی سەختتدا برد. تورکیا جەنگی ناوخۆی هەرێمی کوردستانی بە مەترسیی دادەنا بۆ سەر ئاسایشی تورکیا، ئەوە بوو بە پشتبەستن بەومافەی لەڕێگەی خاکەکەیەوە سەرپەرشتیاری هەرێمی کوردستان دەکات، خۆیکردە دادوەر لە نێوان لایەنە شەرکەرەکانداو شارۆچکەی سلوپی کردە یەکەم خاڵی کۆکردنەوەی تاڵەبانیو بارزانی بۆ دانوستانو ڕێکەوتن لە ١٢ی یۆنیۆی ١٩٩٤. هاوکات وەزیری دەرەوەی تورکیا حیکمەت چەتین لە میانەی کۆبونەوەکاندا بێلایەنی تورکیای

---

[1] المسألة الكردية فى التركية امل وخيبات، ص٣٢-٣٣ .

خستە روو، هەمان کات وتی ڕوداوە هەنوکەییەکانی هەرێمی کوردستان بەگرنگ وەردەگرینو (پ.ك.ك) نابێت سود لەو بارودۆخە وەربگرێت[1].

لەم سەروبەندەدا فەرەنسا بەمەبەستی ڕاگرتنی شەری ناوخۆ، وەك دەوڵەتێکی زلهێزی جیهانو لە ٢٣ی یۆلیۆی ١٩٩٤دا لە کۆشکی کۆماری ئەلیزییە لە پاریس زنجیرەیەك دانوستاندنی ڕێکخست، کە دەقەکەی بەناوی ڕێکەوتنامەی پاریس ڕاگەیەنرا، بڕیار بوو تاڵەبانیو بارزانی بە ئامادەبوونی سەرەك کۆماری فەرەنسا فەرانسۆ میتەران واژۆی بکەن[2]. بە پێی ڕێکەوتنەکە هەرێمی کوردستان جگە لە دامەزراوەی پەرلەمانو حکومەت، دەبوو بە خاوەنی سەرۆکی هەرێمو دەستوورو ڕێکخستنی تایبەت لەپەیوەندییەکانی دەرەوەدا، تورکیا بەئاشکرا ئەم ڕێکەوتنەی بەچالاکی دژە بەرژەوەندیەکانی تورکیا ناوبرد، چونکە ئەمەی بە هەوڵێکی فەرەنسا بۆ بە نێودەوڵەتیکردنی کێشەی کورد دەزانی، دواجار هەوڵی فەرەنسا بۆ بازنەی هێڵی (٣٦) بۆ بازنەی (٣٤)و لابردنی گەمارۆی کوردستان بەمەترسیەك دادەنا[3]، چونکە لەلایەك بازنەی (٣٤) پارێزگای کەرکوکی دەگرتەوە کە دەوڵەمەند بوو بە نەوت، لەلایەکی تر لابردنی گەمارۆی ئابووری هەرێمی کوردستان، دەبووە هۆی بەهێزکردنی ژێرخانی ئابوری هەرێمو پایەیەکی سەرەکی لەبنەمای دەوڵەتی کوردی دەچەسپاند.

تورکیا بۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتنەکە هەوڵێکی بێوچانیدا، سەرۆك کۆماری تورکیا دیمیرل ڕایگەیاند: "ئەگەر ئەم پرۆژەیە بڕیاری لەسەر بدرێت، کەواتە هەموو شتێ کۆتایی هات(کورد دەڵەت پێکدەهێنن)"[4]، دواتر وەزیری نوێی وەزارەتی دەرەوە (مومتاز

---

[1] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارەی( ٦٩٦)، ١٩٩٤/٥/٣١.

[2] الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، کیف اندلع ومن المسؤل عنه، الجزء الاول، مکتب الدراسات والبحوث المرکزی، هەولێر، ١٩٩٧، ص٤١٩ .

[3] نەوشیروان مستەفا ئەمین:لە پاریسەوە بۆ دبلن بۆ دواوە چونێکی خەمناك: ڕۆژنامەی کوردستانی نوی،ژمارە ،.١١٧، ٢٠\١٢\١٩٩٥. هوشیار زیباری: من الذی افشل اتفاقیة باریس، الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، ل٤١٥-٤١٦.

[4] جلال عبد الله معوض: المصدر السابق، ص٤٢ .

سویسال)، بەگەشتێك چووە پاریس‌و بە پاڵپشتی ئەمریکاو بەریتانیا، فەرەنسای ڕازیکرد دەستبەرداری پرۆژەکەبێت، هاوکات ڕێی لە تاڵەبانی‌و بارزانی گرت‌و ڕازی نەبوو لە تورکیاوە بەرەو پاریس بڕۆن بۆ واژۆکردنی ڕێکەوتنەکە، مومتاز سویسال لەلێدوانێکدا وتی، "با کوردی باکوری عێراق، دەسبەرداری خەونەکانیان بن‌و بە ئارامی لە شوێنی خۆیان دابنیشن، تورکیا ئامادەنیە لە پێناو بەرژەوەندی ئەمریکا، بەرژەوەندی گەلی تورکیا ژێر پێ بخات، ڕێگە بەهیچ کەس‌و ڕێکخراوێك نادرێت بچێتە ناو هەرێمی کوردستان، تا لەئامانجی سەردانەکەی ئاگادارنەبین‌و ڕەزامەندی ئێمە وەرنەگرێت)[1].

ڕێکەوتنامەی پاریس تورکیای هاندا تاوەکو چاو بەسیاسەتی خۆیدا بخشێنێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم-ئامادەبوونی تەواو لەسەرجەم ڕێکەوتنەکانی نێوان (ی ن ك)و (پ د ك)دا: لەساڵانی (١٩٩٤، ١٩٩٥، ١٩٩٦) چەندین دانوستان‌و ڕێکەوتنی دەرەکی لەنێوان لایەنە سەرەکیەکاندا لەوانە، (درۆهیدا)، (تاران)و (پرۆژەی ئاشتی مستەر دویچ) سازکرا. تورکیا تەنها لە ڕێکەوتنامەی (تاران) ئامادەیی نەبوو، لەوانی دیکەدا هەندێك واتاو تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لەناواخنی ئەو پرۆژەی ڕێکەوتنانەنەی سەرەوە چەسپاند، گرنگترینیان چەمکی (حکومەتی هەرێمی کوردستان) بوو، کە گۆڕی بە (بنکەی کارگێڕی پارێزگاکانی باکوری عێراق)، لەسەرجەمیاندا خاڵێك جێگیرکرا، بریتی بوو لە "هەموو خاڵی ڕێکەوتنەکە پێویستە بەرژەوەندیە ئاسایشیە مەشروعەکانی تورکیا لە بەرچاوبگیرێت"[2]. دوای سەرنگرتنی ئەو ڕێکەوتنانە، تورکیا هەردوو لایەنی کۆکردەوەو (ڕێکەوتننامەی ئەنکەرە)ی لە نێوانیاندا واژۆ کرد لە ٣١ی ئۆکتۆبەری١٩٩٦[3]. ڕێکەوتنەکە (٢٢) خاڵی گرنگی لەخۆگرتبوو، زۆرینەی داڕشتنی تورکیای پێوە دیار بوو، کە گرنگترین خاڵی سنوری نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) بەفەرمی دیاریکردو لە لایەن هێزی چاودێری ئاشتی Peace

---

[1] ڕۆژنامەی (ئاڵای ئازادی): ژمارە٢٧، ١٢٧، ١\١\١٩٩٦.

[2] بڕوانە دەقی ڕێکەوتنامەکان: الاقتتال الداخلي في كوردستان العراق.، ص ٣١٥، ص ٣٨٤-٣٨٦.

[3] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١١).

Monitoring Force ناسراو بە(PMF)[1] بریاری چاودێری دەکرا. ئەم هێزە لە ناوخۆی کوردستاندا بنکەی سەرەکی لە شاری هەولێرو لەدەرەوە بنکەیەکی لەئەنقەرە بوو. هەروەها هەردوو خاڵی (٢١)و (٢٢) پێناسەی ئاسایشی مەشروعی تورکیای کردبوو، کە دژایەتیکردنی (پ.ك.ك)و کارکردن بوو بۆ گێرانەوەی ئاوارەکانی کەمپی ئەتروش. کۆی گشتی رێکەوتنەکە بە بەراوردکردن لەگەڵ رێکەوتنامەی (پاریس)، پاشەکشە بوو لە ستراتیجی نەتەوەیی کورد، کە هەرێمی کوردستانی بەشێوەیەکی (فەرمی یاسایی) لەنێوان (کورد–کورد) دابەشکرد. هەروەها رێکەوتنەکە تەنها ئاگربڕێك بوو، تورکیا مەشروعیەتی بەرژەوەندی سەربازیو سیاسی خۆی سەلماند، ئەوەبوو لە ٢٩ی ئەپریلی١٩٩٧ سەرەك ئەرکانی تورکیا ئەوەی خستەڕوو (٤٠٠) سەرباز بەتانکەوە چونەتە هێڵی رووبەڕووبونەوەی نێوان لایەنە شەڕکەرەکان[2]، هەردوو لایەنی شەڕکەر لەدوای ڕاگەیاندنی رێکەوتنامەکە چوارجار بۆ جێبەجێکردنی بەندەکان کۆبونەوە، بەڵام لەبری چارەسەرکردن گرفتی نوێ سەریهەڵدا، لەوانە تورکیا (ی.ن.ك)ی بە پشتیوانی (پ.ك.ك) تۆمەتبار کرد [3].

دووەم– بەشداریکردنی لە جەنگی ناوخۆدا:

هەرچەندە تورکیا ڕایگەیاندبوو لەڕووداوەکانی هەرێمی کوردستاندا بێلایەن دەبێت، بەڵام لە (رێکەوتنامەی پاریس)ەوە ئەوەی لاگەلاڵەبوو، پارتەکانی هەرێمی کوردستان لەباری ئاشتیو یەککەوتندا پرۆژەی دەسەلاتی کوردی بەرەوپێش دەبەن، بۆ ئەم مەبەستە پشتگیری (پ.د.ك) لە دژی (ی.ن.ك) کرد، چونکە (پ.د.ك) هاوسنوری تورکیا بوو،

---

[1] هێزێکی تورکمانی بوو لە ئەنجامی رێکەوتنامەی ئەنکەرە سەریهەڵدا. ئامانجی تورکیا لەم هێزە لەوەدا بوو، کە دەیویست سەنگێکی سیاسیو سەربازی بدات بە بەرەی تورکمانی، لە رێگای ناوبژی کردن لە نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك). پێبەخشی ، سەرکردایەتی هێزەکە ئەفسەرێکی تورکی بە سەرپەرشتیاری هێزەکە بەناوی حەسەن کەپلان. ئەم هێزە بەهۆی کەمی ژمارەی سەربازو لایەنگیربوونی لە جەنگی ناوخۆدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.

[2] جلال عبد الله معوض: المصدر السابق، ص١٧٢.

[3] Michel Verrier :A trump card for، Turkey- Kurdish guerrillas.1997-2006 ، Le Monde diplomatique. http://mondediplo.com

هەروەها هاوهەڵوێستی توندبوون لەبەرامبەر (پ.ك.ك)و بەپارتێکی تیرۆرستی ناو دەبردو بەگەورەترین هەڕەشەی دادەنا بۆ سەر هەرێمی کوردستان[1]، بەلام (ی.ن.ك)و تاڵەبانی لە ناو بازنەی سیاسەتی تورکیادا نەبوون، چونکە تورکیا سنوری جوگرافی لەگەڵ دەسەلاتی (ی.ن.ك)دا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا تاڵەبانی لە لێدوانەکانیدا جەختی لەسەرئەوە دەکردەوە کە (پ.ك.ك) تیرۆرست نییە، بەڵکو کاری تیرۆری ئەنجام دەدەن[2]. فڕۆکەکانی تورکیا لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٧و لە کاتی هەوڵی (ی.ن.ك) بۆ بەزاندنی ئەو سنورەی لە رێکەوتنامەی ئەنکەرە دیاری کردبوو، هێرشێکی چەند رۆژییان لە هێڵی ڕووبەڕووبوونەوەی شەڕ، بۆ سەر هێزەکانی (ی.ن.ك) ئەنجام دا. سەرچاوە تورکیەکان ئەو ڕاستیەیان دووپاتکردەوە، کە هێزی پیادەی تورکی یارمەتی بارزانی لەدژی تاڵەبانی کردوە[3]. تاڵەبانی لای خۆیەوە نامەیەکی ئاڕاستەی وەزیری دەرەوەی تورکیا ئیسماعیل جەم کرد، لە ناوەڕۆکدا هاتبوو فڕۆکەو سەربازی تورکیا (١٢) چەکداری (ی.ن.ك)و (٨) سیڤیلیان کوشتووە[4].

سێیەم- هەلقۆستنەوەی جەنگی ناوخۆ بۆ هێرش کردنە سەر (پ.ك.ك):

بارودۆخی چالاکبوونی (پ.ك.ك) لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٤دا تورکیای هەراسان کردبوو، ئەوە بوو لە ٢٩ی یەنایری١٩٩٤ بە فڕۆکە بۆردومانی ئۆردوگاکانی (پ.ك.ك)ی لە زەڵێ کرد[5]، هەروەها لە دەسپێکی شەڕی ناوخۆ لە١٧ی مایۆی١٩٩٤دا جارێکی تر بۆردومانی هەمان شوێنی کردو (٥٨) کەسی لێکوشتن[6]، دواتر لە مانگی (نۆڤەمبەر-دیسەمبەری

---

[1] رۆژنامەی (کوردستانی نوێ): ژمارە٦٠٠، ١٩٩٤/١٠/٣٠.

[2] رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (١٣٠٦) ،١٢\ ٦\ ١٩٩٦ .

[3] القتال العنيف بين الفئات الكردية من جهود تركية وبريطانية وامريكية، العراق، الجيش، www.arabicnews.com. ١٩٩٧\١٠\١٦

[4] بروانە پاشکۆی ژمارە (١٢).

[5] رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٦٠٠ )، ٣٠/ ١/ ١٩٩٤.

[6] هاورێ باخەوان: هاورێنامە بۆ مێژووی کوردستان، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٣٦٧.

١٩٩٤) هێرشێکی بەربلاوی بۆ سەر گوندەکانی باکوری کوردستان دەستپێکرد، سەرئەنجامی توندوتیژی سوپا دوو هەزار خێزانو خەڵکی سڤیل بەرەورووی سنوری هەرێمی کوردستان هەڵهاتن[١]. سەرباری ئەوە ژمارەیەکی زۆر گەریلای ناوچە سنوریەکانی تورکیا، هاتنە ناو هەرێمی کوردستان، ئەمە هۆکاری سەرەکی ئەنجامدانی گەورەترین لەشکرکێشی تورکیابوو، بەژمارەی (٣٥)هەزار سەربازی پرچەکراو بە هەموو پێداویستیەکی ئاسمانیو زەمینی، لەقولایی(٤٠کم)و بەدرێژی (٢٤٠کم) سنوریان بەزاند، لەماوەی مانەوەیان (٢١ی مارت-٤ی مایوی١٩٩٥)دا تەواوی تواناکانیان بۆ پێکانی بنکەکانی (پ.ک.ك)، لەناو خاکی هەرێمی کوردستان بەکارهێنا[٢].وێرای ئەمە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا بە سەرۆکایەتی (دیمریل لە سێپتەمبەری١٩٩٦ بڕیاری لەسەر پێکهێنانی پشتێنەی ئاسایش داو بە قولایی(٥کم)و بە درێژایی سنوری هەرێمی کوردستان- تورکیا نەخشەی بۆ کێشراو[٣] لە ئۆکتۆبەری١٩٩٧ چووە بواری جێبەجێکردنەوەو، (١٠٠) تانکی تورکیو (٨)هەزار سەرباز بەیەکجاری لەهەرێمی کوردستان نیشتەجێبوون[٤]

وێرای ئەمەش سوپا لە ١٤ی مایۆ-٢١ی یونیۆ١٩٩٧، (٥٠) هەزار سەربازی بەتەواوی چەکی ئاسمانیو زەمینی لەژێر ناوی ئۆپەراسیونی (فولاز) ڕژاندە ناو هەرێمی کوردستان، کە ئامانجی خۆیان بە بنەبڕکردنی تەواوەتی بنکەکانی (پ.ک.ك) دیاری کرد، بەپێی ڕاگەیاندنی سوپای تورکیا لەم ماوەیەدا، (٢٦٠١) گەریلایان کوشتووەو، لەریزی سوپای تورکیا (٩٩) کوژراو (٣١٣)بریندار هەبووە، لەگەڵ کەوتنە خوارەوەی دوو کۆپتەر[٥].

---

[1]Nivisingeha peywendiyan u ragehandine li parezgeha duhuk: KAMPa ETRUS، RASTIYAEN PIRSE U KIRYAREN P .K .K E ، kolica seria، duhuk ،1999، p29.

[٢]جلال عبدالله معوض: المصدر السابق، ص ٤٥-٤٦ .

[٣]المصدر نفسه، ص١٦٢-١٦٣.

[4]Alain Gresh: from the Golf to Kurdistan، winds of war ruffle the Middle East1997-2006 Le Monde diplomatique.www.mondediplo.com

[٥]پاشکۆی ژمارە (١٣).

چوارەم–هاندانی کورد بۆ دانوستان لەگەڵ بەغداد:

تورکیا لە دوای بێئەنجامی ڕێکەوتنەکان، فشاری خستە سەر کورد بۆ دەسپێکردنەوەی دانوستان لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا، ئەوە بوو سامی عەبدولرەحمان لەم بارەیەوە وتی، ئێمە چارەسەری کورد لە چوارچێوەی عێراق دەبینین[1]. حکومەتی تورکیا بە سەرۆکایەتی ئەربەکان، سیاسەتی دەرەوەی بریتی بوو لە کرانەوەی بەڕووی دەوڵەتی جیهانی ئیسلامیو عێراق بەتایبەتی، بۆ ئەم مەبەستە یەکەمین جار لە دوای یەکەمین جەنگی کەنداو، دوو وەزیری حکومەتەکەی بۆ تاوتوێکردنی هەناردەی نەوتی عێراقی بەرەو تورکیا، ڕەوانەی بەغداد نارد[2]، ئەمە وەك هەنگاوێك بۆ هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری عێراقو قەرەبوکردنەوەی زیانە ئابوریەکانی تورکیا لەم ڕێگەیەوە. هاوکات سەرۆکایەتی حکومەت هاوڕای ئەو پرۆژەیەی ئەجەڤیت بوو لە ئەپریلی١٩٩٦ پێشکەشی پەرلەمانی کردبوو، کە شەش خاڵی لەخۆ گرتبوو، لە گرنگترینیان: پێویستە کورد لە هەرێمی کوردستان لەگەڵ ڕژێمی بەغداد ڕیکەوتن ساز بکەن[3]. (پ.د.ك) لەبەرامبەر هەرەشەکانی (ی.ن.ك)و فشاری تورکیادا لە٢٥ی یۆلیۆی ١٩٩٦دا لەگەڵ بەغداد، لەسەر چەند خاڵێك ڕێکەوتن، کە گرنگترینیان بریتی بوو لە ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری سەربازی، هەماهەنگی بیرو بۆچوونی سیاسی، ئامادەکردنی (پ.د.ك) لە ڕووی سەربازییەوە[4]. ڕاپۆرتە هەواڵەکانیش ئەوەی لەسەرزاری وەزیری دەرەوەی تورکیا تانسۆ چیلەر ئاشکرا کرد، ولاتەکەی پشتگیری بەغداد دەکات بۆ گێڕانەوەی دەسەلاتی ناوەندی لە هەرێمی کوردستان، بەمەرجێك ئەگەر بتوانێت

---

[1] مراد خۆشەڤی حسۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٠–١٢١

[2] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(١٣٥٦)،١٩٩٦/٨/١١.

[3] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(١٢٦٣)، ١٩٩٦/٤/١٥.

[4] وثيقة التضامن: وزارة الدفاع، مديرية الاستخبارات العسكرية، العدد: ٨٤/ف/ص، التاريخ: ١٩٩٦/٨/١.

ڕێگە لەبەردەم هێرشەکانی (پ.ك.ك) بگرێت[1]، هەڵوێستی ئاشکرای ئەربەکان ئەوە بوو، کە حکومەتەکەی کار بۆ گەشەسەندنی پەیوەندییە ناوچەیەکانی دەکات[2].

تورکیا هەرچەندە لە سەرەتاوە جەنگی ناوخۆی هەرێمی کوردستانی بە مەترسییەك بۆ تورکیا دەروانی، بەڵام لە میانەی چوار ساڵی جەنگەکەدا هەژموونی خۆی لە هەرێمەکەدا سەپاند، لە روی سەربازیەوە جەنگی (تورکیا–پ.ك.ك)ی بردە ناو خاکی هەرێمەوەو سوپای تورکیا بە دەستکراوەیی ئەم شەرەی ئەنجام دەدا. لە لایەکی ترەوە توانی لەم جەنگە تورکیاو هاوپەیمانەکەی لە هەرێم (پ.د.ك) وەك براوە دەربکەون‌و ئێران‌و (ی.ن.ك) لە باری شکستدا بن، چونکە لایەنی یەکەم پایتەخت‌و پارێزگای دهۆکی کەوتە بن دەست‌و هاوکات دەرچەی ئابوری‌و جوگرافیای سیاسی هەرێمەکەی کۆنترۆڵ کرد، لە کاتێکدا (ی.ن.ك) بە تانها لە پارێزگای سلێمانیدا دەسەڵاتدار بوو، کە لە بارێکی ئابوری‌و جوگرافیای سیاسی داخراودا بوو. جگە لەمە بە پێی ڕێکەوتننامەی ئەنکەرە تورکیا دەستی ئێرانی لە هەرێمەکەدا کورت کردەوە، لە کاتێکدا مافی خۆی لە هەرێمەکەدا زامنکرد.

جەنگی ناوخۆ لە قازانجی تورکیادا بوو، بەڵام لە زیانی پرۆژەی ئەمریکی بوو لە عێراقدا، کە دەیویست عێراق بۆ گۆرانکاری ئامادە بکات، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بە سەقامیگیری‌و ئاشتی بوو لە هەرێمەکەدا، لە لایەکی تر تورکیا بە درێژایی ئەو چوار ساڵە بە فەرمی بێلایەن بوو، بەڵام لە راستیدا لایەنگر بوو، ئەو لایەنگریەشی درێژەی بە شەر دەدا نەك کۆتایی پێبهێنێت‌و هاوکات بازنەی شەرەکەی فراوانتر کردبوو، کە بۆ ململانێی ناوچەیی تورکیاو ئێران‌و سوریاو عێراق پەلی کێشا بوو، هاوکات (ی.ن.ك) لە دوای ساڵی ١٩٩٧ ناوەندێتیی تورکیای لا پەسەند نەبوو، هەموو ئەمانە هۆکاری ئەوە بوو کە ئەمریکا بارزانی‌و تاڵەبانی بانگهێشتی واشنتۆن کردو لە ١٧ی سێپتەمبەری ١٩٩٨ بە ئامادەبونی وەزیری

---

[1] EU aid ban highlights shaky Turk rights record 08:04 Sep 22، 1996. www.kurdistanobserver.com.

[2] جلال عبدالله معوض: المصدر السابق، ١٥٣–١٥٤ .

دەروەی ئەمریکا مادلین ئۆڵبرایت سەرکردەی هەردوو پارتەکە (رێکەوتننامەی واشنتن)یان لە ئەمریکا راگەیاند.

تورکیا بە گومانەوە لە رێکەوتنەکەی دەروانی، چونکە ئەم رێکەوتنە جیاواز لە رێکەوتنەکانی پێشوو، بەبێ بەشداری تورکیا بەڕێوە چوو، جێگری سەرەك وەزیران ئەجەڤیت وەك هەڵوێستێکی تورکیا ئەوەی خستەڕوو، کە پێویستە رێکەوتنەکە لەلایەن تورکیاوە تاوتوێ بکرێت[1]، بارزانی دەوڵەتانی ناوچەیی دڵنیاکردەوە کە رێکەوتنی واشنتن نابێتە هەڕەشە بۆسەر هیچ دەوڵەتێك[2]، بۆ ئەم مەبەستە هەریەك لە بارزانیو تاڵەبانی لە ٩ی نۆڤەمبەری ١٩٩٨ لەگەڵ سەرەك وەزیرانو جێگرەکەیو وەزیری دەرەوە بۆ تاوتۆێکردنی رەواندنەوەی مەترسیەکانی تورکیا لە رێکەوتنەکە کۆبوونەوە[٣].

لە دوای رێکەوتنامەی واشنتن، هەروەها دەستگیرکردنی ئۆجالان لە فەبرایری ١٩٩٩، هاوکێشەی پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ هەرێمی کوردستان گۆرانکاری گەورەی بەخۆوە بینی. تورکیا بە هاریکاری (پ.د.ك) گرنگترین ئامانجی لاوازکردنو نیمچە قەلاچۆکردنی (پ.ك.ك)ی بوو، کە لە رێگای ئۆپەراسیۆنەکانەوەو پشتێنەی ئەمنی بەدیهێنا، هاوکات تورکیا بە گرتنی ئۆجالان ئەوەی هاتە پێش چاو، کە (پ.ك.ك) روو لە نەمانەو چیتر پێویستی بە (پ.د.ك) نەماوە. تەریب بەم بۆچوونە (پ.د.ك) ئەو پێویستییەی بە تورکیا نەما بوو، چونکە گرنگترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ تورکیادا ململانێ ئێرانو (ی.ن.ك) بوو لەگەڵ دژایەتی کردنی (پ.ك.ك)، رێکەوتنامەی واشنتن کۆتایی بە ململانێی لەگەڵ (ی.ن.ك) هێنابوو، هەروەها بە لاوازبوونی (پ.ك.ك)و نەمانیان لە سنوری دەسەڵاتی (پ.د.ك)، بەهانەیەك نەمابوو بۆ لەشکرکێشی تورکیا لە سنوری دەسەڵاتی (پ.د.ك). بە واتایەکی تر بەهاری پەیوەندیەکانی تورکیاو (پ.د.ك) روو لە پایز بوو.

---

[1] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ١٧٠٦، ١٩٩٨/٩/٢٧.

[2] Albright، talabani، barzanik remarks, www.vsi washingtonfile.com, ،27-9-1998.

[3] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٥٧١١)، ١٩٩٩/١٠/١٠.

هەر بۆ ئەم مەبەستەو بۆ باسکردنی پەیوەندییەکان، شاندێکی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا بە سەردکردایەتی فەرەیدون سنرلی ئۆغلۆ سەردانی هاوینەهەواری سەلاحەدینی کرد بۆ چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو پاشماوانەی (پ.ک.ک)، کە بەشێوەی پەرتوبڵاو لە ناوچەکەدا ماونەتەوە، بەڵام بارزانی بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە رەوانەکردنی هێزێکی زۆرو لەشکرکێشی بەپێویست نەزانیو بە رای ئەو هێزانەی (پ.ک.ک) گەرۆکنو لە ناوچە چیاییە سەختەکانن[1]. ئەم هەڵوێستەش ئەوەی لێدەخوێنرایەوە، کە بارزانی چیتر خواستی لەشکرکێشی تورکیای لە سنوری دەسەڵاتی نەمابوو، لە بەرامبەردا تورکیا بارزانی بە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی تاوانبار کرد[2].

تورکیا دەیویست بە هەر بەهانەیەك بێت بوونی خۆی لە هەرێمی کوردستان بهێڵێتەوە، ئەوە بوو چەند کارتێکی فشاری بەرامبەر (پ.د.ك) بەکار هێنا بە ئامانجی لاوازکردنو قۆرخکردنی دەسەڵاتی (پ.د.ك)، لە رێگای بەهێزکردنی پێگەی تورکمان لە سنور دەسەڵاتی (پ.د.ك)، هەروەها بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقی، هەروەها خۆنزیك کردنەوە لە رکەبەری (پ.د.ك) لە هەرێمی کوردستان، کە (ی.ن.ك) بوو.

تورکمانەکان بەم شێوەیە باسی مێژووی خۆیان دەکەن، کە لە عێراق لە ناوچەی تورکمانەیلی، "Turkmeneli" کە بە لاتینی "Turkmenia" پێدەوترێت، دەژین، واتای ئەم چەمکە زەمینی تورکمان دەگەیەنێت کە لە تەلەعفەرەوە تا مەندەلی درێژ دەبێتەوەو ١٢% عێراقنو ژمارەیان لە نێوان ٢.٥-٣ ملیۆن کەسە. ئەم نەتەوەیە سەر بە رەگەزی ئۆگۆز (Oguz) لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیەوە بە سێ قۆناغ هاتونەتە عێراقو لە سەردەمی پاشایەتیدا (١٩٢١-١٩٥٨) توشی راگواستن بوون بۆ ناوچە عەرەبیەکانو لە پۆستە حکومییەکاندا بێبەش کراون. لە سەردەمی حوکمی کۆماریشدا لەگەڵ نەتەوەی کورد توشی سیاسەتی تەعریب بوون. لە ساڵی ١٩٧٢ حکومەتی عێراقی خوێندنی زمانی تورکمانی لە قوتابخانە تورکمانەکان قەدەغە کرد. لە سێپتەمبەری ٢٠٠١ بریاری ١٩٩ی دەرکرد کە هەر

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٩٥٣)، ٢٠٠١/٧/١٢.

[2] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (٢٢٣٥) ، ٢٠٠٢/٥/١٢

هاولاتیەکی ناعەرەب رەگەزی خۆی بکات بە عەرەب، زیاتر لە ۱۸ مافی پێدەدرا کە نا عەرەبی نەدەگرتەوە[١].

بە پێی ئاماری ساڵی ۱۹۷۷، لە قەزای دهۆك رێژەی (۰.۳٪) بوون، زۆرترین رێژەیان لە هەولێر بوو کە (۳.۲٪)، لە زاخۆ (۰.۲٪)، ئامێدی (۰.۱٪)، شەقلاوە (۰.۱٪) رەواندوز (۰.۲٪)، کفری (۵.۲ ٪)[٢]. ئەم کەمینەیە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە بەردەوام بەشێوازی جۆراوجۆر هەوڵیداوە کە لەئامارەکاندا رێژەیان کەمبکاتەوەو لە ناو دەستووریشدا خاوەنی هیچ مافێکی نەتەوەی نەبوون. ئەمەش لە لایەك بۆئەوە بوو وەك نەتەوەیەکی تایبەتمەند لەعێراقدا مافییان نەبێت[٣]، هاوکات بۆ بەرگرتن لەدەستتێوەردانی تورکیا لەکاروباری عێراق.

تورکمان لەعێراقدا بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی چەند پارتێکی نهێنیان پێکهێناوە، بەلام لەلایەن حکومەتی عێراقیەوە زۆر بەتوندی بەرپەرچیان دراوەتەوە، بەتایبەتی لەسالانی (۱۹۵۸—۱۹۹۰)، بەلام لەدوای ساڵی (۱۹۹۱)و پەیدابوونی هەرێمی کوردستان، تورکمان لەم سنورەدا سودێکی زۆری لێبینیو بەئاشکرا چەندین پارتیان پێکهێنا لە گرنگترینیان پارتی یەکیەتیو برایەتی تورکمان لە ساڵی ۱۹۹۲، پارتی یەکبوونی تورکی (تورکمان بیرلیك پارتسی)، پارتی یەکیەتی تورکمان (تورکمان أیلی) لە ساڵی ۱۹۹٤ بزوتنەوەی سەربەخۆیی تورکمان لە ساڵی ۱۹۹٥[٤]. هاوکات دوای دامەزراندنی دەسەلاتی هەرێمی کوردستانو بە دەسپێشخەری تورکیا، دوو پارتی تورکمانی دامەزران ئەوانیش

---

[1] Mr. Mofak Salman: The current situation of the Indigenous Turkmen of Iraq. UNITED NATIONS Sub-Commission on the Promotion and. 31 July to 4 August 2006

[2] خليل إسماعيل محمد: أقليم كوردستان العراق، دراسات في التكوين القومي للسكان، مطبعة أوفسيت كريستال، أربيل ۱۹۷۷، ص ۷۷-۷۸

[3] عزيز قادر الصمانجي: التأريخ السياسي لتركمان العراق، دار الساقي، ۱۹۹۹، ص۲۰۳.

[4] المصدر نفسه: ص۳.

یەکێتی برایەتی (قارداشلق)و پارتی نیشتمانی تورکمانی عێراقی (عراق مللی ترکمان پارتەسی) بوو[1]. زۆری ئەم پارتانەو جیاوازیی بیرو رایان جێگای رەزامەندیی خۆیان‌و تورکیاش نەبوو بۆیە پێداویستی دامەزراندنی بەرەیەك بە پێویست زانرا. ئەوە بوو لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٤، تورکیا لە پێناو کۆکردنەوی پارتو رێکخراوە تورکمانییەکان هەوڵەکانی لە پێناو دروستکردنی بەرەیەکی تورکمانی خستە گەر. ئەوەبوو لە ٢٤ی ئەپریلی ١٩٩٥ بەرەی تورکمانی دامەزرا[2]. ئەم بەرەیە لەم پارتانە پێك هاتبوو: پارتی نیشتمانی تورکمانی، پارتی تورکمان ئیلی، یەکێتی سەربەخۆی تورکمان، یانەی برایەتی تورکمانی. رۆڵی تورکیا لە پێکهێنانی بەرەکەو پاشان کاریگەریی تورکیا لەسەر سیاسەتی کارکردنی، یەکێك لەو خالآنە بوو، کە جێگای ناکۆکی نێوان ئەندامانی ئەو بەرەیە بوو. بۆیە ناکۆکییە ناوخۆییەکانی نێوان ئەو بەرەیە وایکرد، کە نەتوانن لە ئەستەنبوڵ یەکەم کۆنگرە ببەستن. ئەوە بوو لە ٤–٧ی ئۆکتۆبەر ١٩٩٧ یەکەم کۆنگرەی خۆیان لە هەولێر بەست[3].

تورکیا یارمەتییەکی بێسنوری پێشکەشی ئەم پارتە تورکمانیانە دەکرد. خوێندکارەکانیان لە زانکۆکانی تورکیا وەردەگیران، خولیی تایبەتیان بۆ دەکردنەوە بۆ فێربونی زمانی تورك‌و ناساندنیان بە کلتورو زمانی تورکی، پاشان وتنەوەی ئەو وانانە لە قوتابخانەکاندا. (دەزگای هەواڵگری تورکیا Milli Istihbarat Teskilati) کە بە (M.I.T) ناسراوە، لە ناو پارت‌و رێکخراوە تورکمانیەکان بە ناوی جۆراوجۆر کاریان دەکرد بۆ چاودێریکردنی هەرێمی کوردستان. بە پاسپۆرتی عێراقی ئەم پارتانە خەڵکیان بە بری ٦٠٠ دۆلار دەنارده تورکیا لە کاتێکدا پارتە کوردییەکان لە رۆژێکدا تەنها بۆیان هەبوو ٥ کەس بنێرن[4]. تورکیا دەیویست لە رێگای تورکمانەوە پێش لە دەسەلآتی کوردی لە عێراقی داهاتوودا بگرێت ، بەلآم پارتە تورکمانییەکان بە تەواوی هاوبۆچوونی سیاسەتی تورکیا

[1] Vahram Petrosian: " the Iraqi Turkmans and Turkey" Iran and the Caucasus, Vol. 7. No. 1-2 (2003), pp.287-288.
[2] Ibid: p291.
[3] عزیز قادر الصمانجی: التأریخ السیاسی لترکمان العراق، ص ٢٢٢–٢٢٩.
[4] رشید أربیل أوغلو: الخلافات القومیة بین الاکراد والترکمان في العراق، http://civicegypt.org

نەبوون لە هەرێمدا. چونکە لە لایەك رەخنەی ئەوەیان لێدەگرت، کە سیاسەتێکی روونی بەرامبەر بە تورکمانی عێراق نییەو لە لایەکی تر بە هاوپەیمانێتی تورکیاو (پ.د.ك) نارازی بوون، بە تایبەت لە دژایەتی کردنی تورکیا، چونکە ئەوان پێیان وابوو، کە تورکیا نابێت تەنها پشت بە (پ.د.ك) ببەستێت، بەڵکو بۆ دژایەتی کردنی (پ.ك.ك) پێویستی بە هاوپەیمانی کۆمەڵێك پارتە نەك تەنها (پ.د.ك)[١]. لەگەڵ ئەوە (پ.د.ك) ئەم پارتەی بە دەزگای ئاسایشی تورکیای لە هەرێمدا دەزانی، بەلام بەرەی تورکمانی کارتێکی باشی دەستی تورکیا بوو. بەرای بەرەکە، تورکمان لە عێراقدا ژمارەیان لە سەروو (٣.٥) ملیۆن کەسە. لە سنوری پارێزگای کەرکوکی خاوەن نەوتدا (٦٠٪) دانیشتوانن. ئەمانە دەتوانن خاوەنی ئۆتۆنۆمی بن لە عێراقی فدرالی داهاتودا نەك بەشێك بن لە هەرێمی کوردستان[٢]. هاوکات ئەم پارتە بانگەشەی نەخشەیەکی نەتەوەیی دەکرد، لەنیوە زیاتری باشووری کوردستانی دەبردو ناوەندی شاری موسڵو هەولێرو کەرکوکی دەگرتەوە، هەروەها بەهیچ جۆرێك دانیان بەحکومەتی هەرێمی کوردستاندا نەدەناو هەرێمەکەیان بەناوی (باکوری عێراق) ناودەبرد[٣].

کارتی دەستی تورکیا بۆپشگیری لە تورکمانەکان بە رای قادر سەمانچی لاواز بوو، چونکە لەگەڵ ئەوەی تورکو تورکمان لەو باوەرەدان، کە ولایەتی موسڵ بەشێکە لە تورکیاو لە دوای یەکەمین جەنگ لێیدابرێنراوە، بەلام پشگیری تورکیا لە تورکمانەکان هیچ پاڵپشتێکی یاسایی نەبوو، نە لە رێکەوتنامەی لۆزانو نە لە هیچ رێکەوتنێکی تری نێوان عێراقو تورکیا. هەروەها گێرانەوەی ولایەتی موسڵ بۆ تورکیا دەبوو بە مایەی زیان بۆ تورکیا، چونکە بەم کارە تورکیا سامانی نەوتیو کەمینەیەکی تورکمانی دەباتەوە بەلام

---

[١] تقرير شرق الاوسط لمجموعة الازمات ص ١٥

[٢] Bill Park: STRATEGIC LOCATION, POLITICAL DISLOCATION: TURKEY, THE UNITED STATES, AND NORTHERN IRAQ. MERIA. Volume 7, No. 2 - June 2003, http://www.biu.ac.il

[٣] عزيز قادر الصمانجي: المصدر السابق، ص٢٢٥-٢٣٢.

ژمارەی دانیشتوانی کورد لە تورکیا زیاتر دەکاتو کیشەی کۆنترۆڵکردنی پرسی کورد زۆر گەورەتر دەبێت لەوەی، کە لە ئێستا لە تورکیادا هەیە(1).

پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان کوردو تورکمان بۆ شۆرشی ئەیلول (١٩٦١–١٩٧٥) بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانی دەگەڕێتەوە. نێوان ململانێی کوردو بەغداد، تورکمان سیاسەتی بێلایەنی سلبیان هەڵبژاردبوو، ئەویش لەبەر ئەوەی، کە ناوچەی جوگرافیای تورکمان لە عێراقدا، وەك ناوچەی شاخاوی کورد نەبوو، کە بیانپارێزێت لە زۆرداری بەغداد، هاوکات تورکمان زیاتر ژیانی ئاشتیو ئارامیان لە ململانێ پێخۆشتر بوو (2).

لە راپەرینی ١٩٩١دا تورکمان بەشداری بەرچاوی لەگەڵ کورددا نەکرد، بەلاّم لە میانەی سەرکوتکردنی راپەرین لە لایەن رژێمەوە تەنها لە شارۆچکەی ئاڵتون کۆپری حکومەت ٧٥ کەسی کۆمەڵکوژ کرد لە ئەپریلی ١٩٩١، لە کۆرەویشدا هەندێکیان روویان کردە ئێرانو هەندێکیشیان چوونە تورکیا(3). لە دوای دروستبوونی دەسەلاّتی کوردی، تورکمان پێنج کورسی پەرلەمانو وەزارەتێکیان لە ساڵی ١٩٩٢ پێدرا، بەلاّم رەتیان کردەوە، چونکە ئەوان دەیانویست مافەکانیان لە رێگای کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بەدەستبهێنێت نەك لەناو دەسەلاّتی هەرێمدا. خۆیان دانی پێدا دەنێن، کە " سەرکردایەتی کوردی خوازیاری پەیوەندی باشی نێوان کوردو تورکمان بووە"(4). بەلاّم بەدیوێکی تردا ئەم بەشدارینەکردنەی تورکمان، سوپاو دەزگا ئەکادیمیەکانی تورکیای لەپشت بوو، کە وێنەی هەرێمی کوردستانیان لەبەر چاوی دەوڵەت وەك دوژمن پیشان دابوو، بۆیە دەوڵەت پشتگیری هەر لایەنێکی دەکرد کە ئەو هەرێمە لاواز بکات بە تایبەتیش لایەنی تورکمان، لێرەوە

---

[1] المصدر نفسه: ، ص ٢٣٧–٢٣٩

[2] المصدر نفسه: ص١٩٤–١٩٥

[3] المصدر نفسه: ص٢١٧

[4] المصدر نفسه: ص ٢٤٩–٢٥٠

تورکمانەکان بەشداریان لە دەسەلآتی هەرێمدا نەکرد بۆ ئەوەی بە ناشەرعی لە قەڵەمی بدەن[1].

پەیوەندیەکانی نێوان کوردو تورکمان تا ساڵی ١٩٩٦ بە دۆخێکی ئارامدا گوزەری کرد، چونکە تا ئەو کاتەش داواکاری نەتەوەیی تورکمانەکان گەشەی نەکردبوو، هاوکات تورکیا نەیدەزانی چۆن کارتی تورکمانی بەکار بهێنێت، لە لایەکی تر زۆرینەی تورکمانەکان لە پێش ٣١ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦ لە ژێر دەسەلآتی (ی.ن.ك) دا بوون. کە ئەم پارتەش دژایەتیی تورکمانەکانی نەدەکرد، چونکە بەڕای ئەوان تورکیا نەیدەتوانی سود لە تورکمان وەربگرێت، لەبەر ڕێژەی کەمی دانیشتوانی تورکمانو نەبونی سنوری نەتەوەیی هاوبەش لەگەڵ تورکیا[2]. لەگەڵ ئەمەشدا نەبوونی سنور لە نێوان دەسەلآتی (ی.ن.ك)و تورکیا وایکردبوو کە ئەم پارتە نەکەوێتە ژێر فشاری کارتی تورکمانەکان، بەلأم لە بەرامبەر (ی.ن.ك)دا، (پ.د.ك) بەهۆی بوونی سنوری هاوبش لەگەڵ تورکیا، بە ئاسانی ئاسەواری ئەو فشارە لەسەری بەدیدەکرا. لە ڕووداوی ٣١ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦دا سەرجەم بارەگای پارتە تورکمانییەکان دەستی بەسەردا گیراو (٢٥) تورکمانیش کوژران. هەروەها بارەگای سەرەکی پارتی یەکێتی تورکمانی(ترکمان ایلی) کە لە دهۆك بوو لە لایەن (پ.د.ك) دەستی بەسەردا گیرا[3].

لێرەوە پەیوەندیەکانی (پ.د.ك)و تورکمان بە ئاقارێکی سەختدا دەڕۆیشت، گرنگترین کێشەش ئەوە بوو، تورکیا بە تایبەتیش وەزیری دەرەوەی تورکیا، تانسۆ چیللەر، دەیویست لەڕێگەی ڕێکەوتنامەی ئەنکەرە سەنگێکی سیاسی بداتە تورکمان، کە لە دواڕۆژی هەرێمی کوردستانو عێراقدا سودیان لێوەربگرێت، تورکمانیش لای خۆیانەوە ئەم پاڵپشتیەی تورکیایان بەکاردەهێنا لەپیادەکردنی جۆرە دەسەلآتێکی ناوخۆیی لەناو هەولێر، ئەمە لەلایەن (پ.د.ك)، وەك خاوەن دەسەلآت بەسەر پایتەختو پەرلەمانو حکومەت

---

[1] مراد خۆشەڤی حسۆ: سەرچاوەی پێشوو،ل٢٠٥ -٢٠٦

[2] فەرید أسسرد: رهان خاسر على التركمان، مجلة شؤن التركية، مركز كوردستان للدراسات الاستراتيجية، سليمانية، العدد١، ١٩٩٨، ص٩.

[3] عزيز قادر الصامانجي: المصدر السابق، ص٣٠١-٣٠٥

پەسەند نەبوو، هەر بۆیە هۆكاری سەرەكی بوو لە ١٠ی ئۆگستوسی١٩٩٨دا جارێكی تر تەواوی بارەگاكانی بەرەی توركمانی لەلایەن هێزی (پ.د.ك)دەستی بەسەرداگیرا[١]، كە ئەمە بوو بە مایەی نارەزایی توركیاو رای گشتی ئەو دەوڵەتەو توركیا داوای قەرەبوی زیانەكانی لە(پ.د.ك) كرد، لە راگەیاندنەكان بە دژایەتیكردنی رەگەزی ناوبرا[٢]. لەمە گرنگتر ئەوە بوو ئەجەڤید بریاری فەرمی دەركرد لە ٢٠٠١، پشگیریكردنی مافەكانی توركمان لە هەرێمی كوردستان كردە تەوەرێكی سەرەكی گرنگی پێدانی وەزارەتی دەرەوەی توركیا. تیایدا هاتبوو كە پێویستە توركمانەكان لە شوێنو پێگەی یەكسان لەگەڵ كوردا دابنرێن. وەلامی كوردیش لەو بارەیەوە ئەوە بوو توركمان هەموو مافێكیان هەیە، بەلام بەرەی توركمانی ئامانجی خزمەتكردنی بێگانەیە نەك توركمان، كەركوكیش شارێكە ناسنامەی كوردییە[٣].

ئەم بۆچونەی (پ.د.ك) بەشێك لە راستی پێوە دیار بوو، چونكە پارتە توركمانییەكان بنكەی سیاسیان لە هەولێر بوو، زۆرینەی جەماوەرو ئەندامەكانیان خەڵكی ناوچەكانی ژێر دەستی حكومەتی عێراقی بوون، هاوكات پشگیری مادیی‌و مەعنەوییان لە توركیا وەردەگرت. ئەم پارتە توركمانیانە لە دوای راپەرین دەرگای چەكدارییان كردبووەوە، زۆرێك لە توركمانەكانی ناوچەكانی باشوور، كە هەڵهاتبوون لە خزمەتی سەربازی تیایدا دەسبەكار بوون. ئەمانە لایەن خزمەكانیانەوە سەردان دەكرانو یارمەتییان لە پارتەكان یان لە رۆڵەكانی ناو پارتەكە وەردەگرت، هەندێكیشیان راپۆرتیان دەبردەوە یان دەیان نوسی بۆ دەزگاكانی رژێمی بەغداد. هاوكات توركیا بە ئاشكرا پشگیری دەكردنو دەزگای هەواڵگری

---

[١] جریدة الشرق الاوسط، العدد (٧٠٨٨)، ١٩٩٨/٤/٢٥. یوسف گوران: بەرەی توركمانیو لێكولینەوەیەك لەبارەی بیری ناسیۆنالزمی توركییەوە، گۆڤاری سەنتەری لێكولینەوەی ستراتیژی، ساڵی سیانزەهەم، ژمارە (٢)، ٢٠٠٣، ل١٥٥.

[٢] یوسف گوران: سەرچاوەی پێشوو،ل١٥٥.

[٣] مراد خۆشەڤی حسۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٨-٢٠٩

تورکی، لەناو ئەم پارتانە زۆر بالاّ دەست بوون. هەروەها هێزە کوردیەکانیش خەڵکی نهێنیان هەبوو لە ناو ئەو دەزگاو رێکخراوە تورکمانیانە، کە ئیشی بۆ دەکردن[1].

هەموو ئەمانە وایکردبوو، کە لە لایەن (پ.د.ك) بە چاوی گومانەوە سەیری پارتە تورکمانییەکان بە گشتیو بەرەی تورکمانی بە تایبەت بکرێت. لە بەرامبەردا بە بڕوای تورکمانەکان لە دوای رێکەوتنامەی واشنتۆن دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە ئارادا بوو، بۆیە هەوڵەکانیان خستبووگەر بۆ پێکهێنانی هەرێمێکی تورکمانی لە عێراقدا[2]. لە کۆنگرەی دووەمی بەرەی تورکمانی لە هەولێر بۆ یەکەمجار لە مێژووی بزوتنەوەی تورکماندا لە ٢٠-٣٠ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٠ بە ئامادە بوونی شاندی فەرمی تورکیا، دروشمی ئۆتۆنۆمی بۆ تورکمان بەرزکرایەوە[3].

کارتێکی تر، کە تورکیا دژی (پ.د.ك) بەکاری هێنا بریتی بوو لە زیندوو کردنەوەی پەیوەندیەکانیی لەگەڵ (ی.ن.ك)، کە بە هۆی شەری ناوخۆو لایەنگری ئەم پارتە بۆ (پ.ك.ك)و سیاسەتی ئێران لە هەرێمدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیادا لە باری متبوندا بوو. لە مارتی ٢٠٠٠دا سەرۆکی حکومەتی (ی.ن.ك)، کۆسرەت رەسوڵ عەلی وەك سەرۆکی شاندی (ی.ن.ك) گەیشتە ئەنکەرە[4]. ئەم شاندە جارێکی تر لە مانگی یۆنیۆی ٢٠٠٠ سەردانی ئەنکەرەیان کردو چەند پەیامێکیان گەیاندە تورکیا، یەکێك لەو پەیامانە ئەوە بوو وەك سەرۆکی شاندەکە وتی "ئێمە داوای سەربەخۆیمان نەکردووەو وەك حکومەتی سەربەخۆ مامەڵەمان نەکردووە، بەڵکو داوای عێراقێکی دیموکراسیمان کردووە کە تیایدا فدراڵیو مافی مرۆڤ پارێزراو بێت". داواکارییەکانی (ی.ن.ك) لە تورکیا ئەوە بوو، کە تورکیا بەشداری بکات لە سەرخستنی پرۆسەی ئاشتی لە هەرێمی کوردستان، لە لایەکی تر یارمەتی ئابورییان بدات. تورکیا بەڵێنی دابوو، کە لە رێگای پیاوانی خاوەن کارو کۆمپانییە

---

[1] رشيد أربيل أوغلو: المصدر السابق.

[2] یەك دەدەین... سێ وەردەگرین، ل ٢٨-٣١

[3] محمد نورالدين: تركيا الصيغة والدور، رياض الريس للكتب والنشر، بيروت، ٢٠٠٨، ص236

[4] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٥١٣)، ٢٠٠٠/٣/٣.

تورکییەکان یارمەتی بوژاندنەوەی ئابووری سنووری دەسەلاتی (ی.ن.ك) بداتو ڕۆژانە ڤیزەی تایبەتی بۆ ئەو پارتە بۆ چوونە ناو تورکیا دابین بکات. هاوکات نارەزایی خۆی لە نادادپەروەری لە دابەشکردنی داهاتی هەرێم دەربری بوو. تورکیاش خۆشحاڵی خۆی دەربری کە (ی.ن.ك)، (٤٠٠٠) چەکداری داناوە بۆ ڕێگرتنی (پ.ك.ك) لە قەندیل[1].

بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین، کە (ی.ن.ك) جەختی لەوە کردبووەوە کە لە عێراقی دوای ڕژێمی سەدام حسین، دەوڵەتی کوردی راناگەیەنن و عێراق بە یەك پارچیی دەمێنێتەوە، هەروەها ئەم پارتە پێویستی بەوەیە کە تورکیا لە پرۆسەی ئاشتیدا لایەنگری (پ.د.ك) نەکات، بەڵکو فشاری بخاتە سەر بۆ دانی ئەو برە پارەیە بە (ی.ن.ك)، کە لە داوای ڕێکەوتنامە واشنتن بە ٢٢ ملیۆن دۆلار خەملاندبوو[2]. لە لایەکی تر ئەم پارتە دەیویست لە ڕێگای تورکیاو کۆمپانیاکانی تورکیاو ڤیزەی تورکییەوە، لە ڕووی ئابووریو سیاسییەوە بەرووی جیانی دەرەوەدا بکرێتەوە. تاکە داواکاری تورکیاش لە (ی.ن.ك) بریتی بوو لەوەی ئەم پارتە لە سنوری دەسەلاتی خۆیدا هاریکاری سوپای تورکیا لە شەر دژی (پ.ك.ك) بکات. قازانجی تورکیا لەم مامەڵە سیاسیەدا لەلایەك فشار دروستکردن بوو لەسەر (پ.د.ك)، بەڵام لە لایەکی تر بە زیندوو کردنەوەی پەیوەنییەکان لەگەڵ (ی.ن.ك) دەیویست بەرەی شەڕ لەگەڵ (پ.ك.ك) بگوازێتەوە بۆ ناو سنوری دەسەلاتی (ی.ن.ك)، دوای ئەوەی لە سنوری (پ.د.ك)دا، (پ.ك.ك) تەواو لاواز بوو بوو. هەروەها بە دروستکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ (ی.ن.ك)، تورکیا تەرازوی ململانێی لەگەڵ ئێراندا بە لای خۆیدا لاسەنگ دەکرد.

(ی.ن.ك) لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجی شاندەکەدا شەری لە دژی (پ.ك.ك) ڕاگەیاند. ئەم شەرە لە گەڵ یەکەمین سەردانی شاندی (ی.ن.ك) دەستی پێکردو تا دیسەمبەری٢٠٠٠ی

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٦١٥)، ٢٠٠٠/٦/٢٧.

[2] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٦٢١)، ٢٠٠٠/٧/٤.

خایاند. (پ.ك.ك) هێزەکانی لە ناوچەکانی سنوری دەسەلاَت (ی.ن.ك) بەرەو چیای قەندیل کشاندەوە[1].

بەرێوەبەری نوسینگەی (ی.ن.ك) لە ئەنکەرە، شازاد سائب[2]، رایگەیاند کە "پارتەکەی دەستی کردووە بە دانانی ناوچەی دابراو لە دژی (پ.ك.ك) بۆ ئەوەی نەچنە ناو خاکی تورکیا"[3]. ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك) عادل موراد وتی، فەرمانمان بە هێزەکانمان کردووە کە پشتێنەیەکی ئاسایش پێکبهێنن بۆ ئەوەی رێگە لە (پ.ك.ك) بگرین بێتە ناوچەکانمانەوە[4]. هەرچەندە لەم شەرەدا (پ.د.ك) لەگەڵ (ی.ن.ك) هەر یەك لای خۆیەوەو بە سەرپەرشتیو هەماهەنگی تورکیا بەشداریان کرد بەلاَم بەرای ئێمە ئەم شەرە وەك نییەت باشی (ی.ن.ك) بوو بۆ دەسپێکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا. هاوکات ئەم شەرە وەك پاشگەزبوونەوەیەکی (ی.ن.ك) بوو لەو باوەرەی، کە لە دوای شەری حکومەتی هەرێمو (پ.ك.ك) لە ساڵی ١٩٩٢دا تا ٢٠٠٠ لە داکۆکی لێدەکرد، ئەویش ئەوە بوو کە لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی تورکیادا، نابێت شەر لەگەڵ (پ.ك.ك) لە هەرێمدا بکرێت. هاوکات ئەم شەرە وەك هەڵگەرانەوەیەکی (ی.ن.ك) وا بوو لە هاوپەیمانەکەی جەنگی ناوخۆی هەرێم، کە ئێران بوو. هەروەها روو کردنە نەیارەکەی بوو، کە تورکیا بوو . ئەمەش بۆ ئەوە (ی.ن.ك) دەیویست لە مەرجە قورسەکانی ئێران دەربازی ببێت، کە لە بەرامبەر کرانەوەی بەرووی جیهاندا بەسەریدا سەپاندبوو. لەم بارەیەشەوە حەمید گەیلانی،

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٧٧٠)، ٢٠٠٠/١٢/٢٥

[2] شازاد سائب، ( ١٩٤٦-٢٠٠١) لە سلێمانی لەدایك بووە. دەرچوی کۆلیجی مافە لە بەغداد لە ساڵی ١٩٦٨. ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی لینینی بوو لە ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٥). لە ساڵی ١٩٧٨-١٩٨٣ نوێنەری (ی.ن.ك) بووە لە سوریا. دواتر بووە بە نوێنەری ئەو پارتە لە ئەنکەرە لە ساڵانی (١٩٩٤-٢٠٠١). دوای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠١ بووە بە وەزیری کشتوکاڵ لە ئیدارەی سلێمانی، بەهۆی رووداوی ئوتومبێل مردووە. http://www.kurdsat.tv

[3] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٥٨٥)، ٢٠٠٠/٥/٢٣.

[4] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٥٩٦)، ٢٠٠٠/٦/٥.

کە جێگری پارتی گەلی دیموکراتی تورکیا بوو وتی: نابێت یەکێتیو پارتی لەو هێرشانەدا بەشداری بکەن، پاڵنەرە کەسییەکانیش هیچ سود بە کوردی عێراق ناگەیەنێت"[1].

تاڵەبانی لە کۆتاییەکانی ئەم شەڕەو لە مانگی یەنایری ٢٠٠١دا چووە ئەنکەرەو رایگەیاند، کە زامنکردنی سەقامگیری لە هەرێمی کوردستاندا بە زاڵبوون بەسەر (پ.ک.ک) لە قەندیلو زەلێ دەبێت، کە سوپای تورکی بە یارمەتی (ی.ن.ک) ئەنجامی دەدا. لە راپۆرتێکی کەناڵی ئاسمانی ( ابو ظبی)دا ئەجەڤید وتی: "ژمارەی سەربازەکانی تورکیا لەو پرۆسەیەدا نەزانراوە، بەڵام ئەوەی ئەوان دەیکەن یارمەتیدانی تەکنیکیە بۆ پارتەکەی تاڵەبانی کە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی تورکیا دەکات، هەرچەندە هێزەکانی (پ.ک.ک) پاشەکشەیان کردووە بۆ ئەودیو سنوور، بەڵام هێشتا هەرەشەن بۆ ئاسایشی نەتەوەیی تورکیاو هەوڵ ئەدەین لەناویان بەرین بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان". تاڵەبانیش سەبارەت بەو هێزانە بەشداریکردنی لگەڵ هێزەکانی (ی.ن.ک)دا پشتراست کردەوەو وتی: " ژمارەیەکی کەمی هاوڕێ تورکەکانمانن"[2]. لێرەوە پەیوەندییەکانی تورکیاو (ی.ن.ک) روی لە باشبوون کرد. لە کاتی شەری ئەم پارتەی دوایی لەگەڵ (پ.ک.ک) ، شاندێکی تورکیا بەبۆنەی کۆچی دوایی برایم ئەحمەد[3]، گەیشتنە سلێمانی[4]. دوای شەش مانگیش شاندێکی بازرگانی تورکیا گەیشتە سلێمانی[5].

---

[1] الاتصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٥٧٦)، ٢٠٠٠/٥/١٢.

[2] الاتصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٧٨٠)، ٢٠٠١/١/١٠

[3] ئیبراهیم ئەحمەد: (١٩١٤-٢٠٠٠) لە سلێمانی لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٣٧ كۆلیجی مافی لە بەغداد تەواو كرووە. سەرنوسەری گۆڤاری گەلاوێژ بوو (١٩٣٩-١٩٤٩). لە ساڵی ١٩٤٧ بووەبە ئەندامی (پ.د.ك). دواتر لە ١٩٥٣ بووە بە سكرێری گشتی ئەو پارتە. لە ساڵی ١٩٦٤ سەركردایەتی باڵی جیابونەوەی لە (پ.د.ك) كردووە تا ١٩٧٠.و پاشان وەك راوێژكاری سەركردایەتی ئەو پارتە ماوەتەوە تا ساڵی ١٩٧٥. دوای هەرەسی شۆرشی ئەیلول چۆتە بریتانیا و هەر لەویش مردووە. http://www.moqatel.com

[4] الاتصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٦٠٨)، ٢٠٠٠/٦/١٩.

[5] الاتصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٨١٩)، ٢٠٠١/٢/٢٢.

پەرەپێدانی و هەوڵدان بۆ ئاسایی کردنەوەوی پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەغداد کارتێکی تر بوو، کە تورکیا لە دوای گرژبوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ (پ.د.ک) بەکاری هێنا، تورکیا بە سەرکردایەتی ئەجەڤیت دەیویست، کە کێشەی هەرێمی کوردستان لە رێگای دانوستانی نێوان بەغدادو کورد چارەسەر بکات، بەوەی بەغداد دان بە هەندێك لەو مافانەدا بنێت کە ئێستا کورد لە هەرێمەکەدا هەیەتی. هاوکات خواستی ئەوەی هەبوو، کە کێشە سیاسیەکانی نێوان عێراق و تورکیا رێگە لە پەیوەندییە ئابوورییەکان نەگرێت. بریکاری وەزیری دەرەوەی تورکیا فاروق ئۆغلۆ بۆ ئەم مەبەستە گەیشتە بەغداد. دوای ئەوەی عێراق هاوکۆك بوو لەسەر بۆچونە نوێکانی تورکیا، تەها یاسین رەمەزان وەڵامی پێشنیاری تورکیای بەوە دایەوە، کە "عێراق دەخوازێت پەیوەندییەکی ستراتیجی لەگەڵ تورکیادا ببەستێت"[1]. دواتر تورکیا بڕیاریدا، کە نوێنەرایەتی خۆی لە عێراق بەرز بکاتەوە بۆ ئاستی سەفیر کە محەمەد ئاکان بوو، عێراقیش فاروق علی حجازی وەك نوێنەری خۆی لە ئەنکەرە دەستنیشان کرد[2]. وەڵامی بەغداد بۆ بۆچوونە نوێکانی تورکیا سەبارەت بە کێشەی کوردو چالاکی ئابووری بریتی بوو لەوەی سەدام حسین پێشنیاری دانوستانی لەگەڵ کورد کردوو. هەروەها بیرۆکەی پێکهاتنی لیژنەی ئابووری بڕیاری گەلاڵە بوو[3].

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٥٩٧)، ٢٠٠٠/٦/٦.

[2] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١١٦٣٥)، ٢٠٠٠/٧/٢٠.

[3] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٩٦٦)، ٢٠٠١/٧/٢٥.

# بەشی چوارەم

# پەیوەندییەکانی سوریا و هەرێمی کوردستان

- تەوەری یەکەم-سوریا لە سالآنی نەوەدەکاندا
- تەوەری دووەم- پەیوەندییەکانی نێوان سوریا و عێراق
- تەوەری سێیەم-سیاسەتی سوریا بەرامبەر بە کێشەی کورد
- تەوەری چوارەم- پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو هەرێمی کوردستان

# تەوەری یەکەم

## سوریا لە ساڵانی نەوەدەکاندا

سوریا وەك زۆرینەی دەوڵەتەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست بەدەست کۆمەڵێك کێشەی درێژخایەنی وەك سیستەمو سوپاوو ئابووری دەناڵێنێت ، هەمبەر بەوەش پەیوەندییە دەرەکییەکانی رەنگدانەوەی کێشە ناوخۆیەکانیەتی. ئەم دەوڵەتە فرە ئاینو فرە نەتەوەیە[1]، لە ساڵی ١٩٤٦ سەربەخۆیی بەدەست هێناوە. حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، کە زۆرینەیان لە کەمینە ئاینیو نەتەوەییەکان بوون[2]، لە ناو سوپادا خۆیان توند کرد. ئەم پارتە لە ٨ی مارسی ١٩٦٣ کودەتایان ئەنجامداو سونەکانیان دورخستەوە. لە ناو ئەم پارتەدا ئەفسەرە عەلەوییەکان حافز ئەسەد[3]، لەم رێگایەوە لە کورسی

---

[1] نەتەوەکانی سوریا بریتین لە عەرەبو کوردو ئەرمەن، ئاینەکانیش بریتین لە موسوڵمان کە بەسەر سوننەو عەلەویو دروزو ئیسماعیلیو دوانزە ئیمامی دابەش بوون، هەروەها ئاینی مەسیحیو ئێزدیو جولەکەشی تیادایە، بۆ زانیاری زیاتر برزانە، عقیل سعید محفوض: المصدر السابق: ص١٠٣.

[2] لە سەرەتای نەوەدەکان، سونەکان ٦٤.٣٪ دانیشتوانی سوریا بوونو ١٣ ملیۆن کەس دەبن. عەلەویەکان، ١١,٨٪ی سوریانو ٢.٣٤ ملیۆن کەسن، دروزو ئیسماعیلیەو شیعەی دوانزە ئیمامی ٤٪ دەبن . عقیل سعيد محفوض: المصدر السابق، ص ١٠٣.

[3] لە ساڵی ١٩٣٠ لە دێی قرداحە لە پارێزگای لازقیيە لە بنەماڵەیەکی جوتیار لەدایك بووە. سەر بە کەمە ئاینی عەلویيە. لە ساڵی ١٩٤٧پەیوەندی بە حزبی بەعس کردووە. دەرچوی ئەکادیمی سەربازییە لە حمس لە ساڵی ١٩٥٥. دواتر ئەکادیمی فرۆکەوانی لە یەکێتی سۆڤیەت تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٦٥

دەسەلآت نزیك كەوتەوە[1]. ئەسەد بە ناوی بزوتنەوەی چاكسازی لە ١٩ی نۆڤەمبەری ١٩٧٠ كودەتای كردو هەموو دەسەلآتەكانی دەوڵەتی خستە ژێر كرنترۆڵی خۆیو خێزانەكەی[2]. ئەسەد جگە لەوەی سەرۆك كۆمار بوو، هاوكات ئەمینداری گشتی حزبی بەعس بوو، سەرۆكی بەرەی نیشتمانی پێشكەوتووخواز[3] بوو. دواجار سەرۆكی بالآی هێزە چەكدارەكانیش بوو[4]. جگە لەوەی بەهۆی باری نائاسایی، كە لە ساڵی ١٩٦٢ راگەیەنرابوو بە هۆیەوە سەرۆك دەسەلآتی رەهاو بێ لێپرسینەوەی هەبوو[5].ئامانجی سەرەكی ئەسەد

---

بووە بە سەركردەی هێزە سەربازییەكان. یەكێك بووە لە سەركردەی كودەتای ساڵی ١٩٦٦و بەهۆیەوە بووە بە وەزیری بەرگری . لە ساڵی ١٩٧٠ بە تەواوی دەستی بەسەر فەرمانرەوایەتی سوریادا گرتووەو لە مارسی ١٩٧١ بووە بە سەرۆك كۆمار تا لە ١٠ی یۆنیۆی ٢٠٠٠دا مردووە. القضیة الكوردیة فی كوردستان-سوریا خلال عهد الرئیس حافظ الاسد، ١٦تشرین الثانی١٩٧٠-١٠حزیران،٢٠٠٠، اعداد مركز الدراسات الكوردیة وحفظ الوثائق/ جامعة دهوك،٢٠٠٩، ص٧.

[1] نیقۆلاس فان دام: الصراع علی السلطة فی سوریا: الطائفیة والاقلیمیة والعشائریة فی السیاسة ١٩٩٥، مكتبة مدبولی، القاهرة ١٩٩٥، ص ٥٨- ٥٩

[2] Eyal Zisser: APPEARANCE AND REALITY: SYRIA'S DECISION MAKING STRUCTURE, MERIA, Volume 2, No. 2 - May 1998 http://www.biu.ac.il/SOC/besa/meria/index.html

[3] ئەم بەرەیە لە حەوت پارت پێكهات لە ٧ی مارسی ١٩٧٢. كە ئەم پارتانەن. حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی. حزبی شیوعی سوری. یەكێتی ئیشتراكی عەرەبی. پارتی وەحدەوی ئیشتراكی. بزوتنەوی ئیشتراكی عەرەب. پارتی وەحدەوی ئیشتراكی دیموكراتی. یەكێتی عەرەبی دیموكراتی. http://www.aljazeera.net

[4] Eyal Zisser: The Syrian Army: Between the Domestic and the External Fronts. MERIA l, Vol. 5, No. 1 (March 2001), P 1

[5] Kerim Yildiz: The Kurds in Syria, The Forgotten People, Pluto Press,LONDON, 2005.P 53.

هێشتنەوی دەسەلاَت بوو لە دەستی خۆی‌و خێزان‌و عەلەوییەکان[1]. هەر بۆیە دوای مردنی ئەسەد لە ١٠ی یۆنیۆی دادا٢٠٠٠، بەشاری کوری لە رۆژی دوایدا بوو بە سەرۆك کۆمار[2].

سوپای سوریا بەهۆی دوژمنایەتی دێرینی نێوان سوریاو ئیسرائیل، سوپا کارە سەرەکیەکەی روی لە دوژمنی دەرەکی کردبوو نەك سەرقالّ بوونی بە سیاسەتەوە. لە جەنگی ١٩٦٧ی عەرەب–ئیسرائیل، بەرزاییەکانی جۆلانی[3]، لەدەست دابوو. لە دوای رێکەتننامەی کامپ دیڤدی[4]، نێوان میسرو ئیسرائیل لە مارتی ١٩٧٨، باوەری بە بەرەی عەرەبی، بۆ دژایەتی کردنی ئیسرائیل نەما بوو. هاوکات بەلایەنگیری کردنی ئێران لە دژی عێراق، لە یەکەمین جەنگی کەنداو (١٩٨٠–١٩٨٨)، لە ناو عەرەبدا لە رووبەروبوونەوە لەگەلّ ئیسرائیل تاقانە کەوتبوو. ئەم بارودۆخە وایکردبوو، نیوەی بوجەی ولاَت دەچووە

---

[1]Daniel Pipes :Politics in Syria from Damascus Courts the West: Syrian Politics, 1989-1991. .mht!x-usc:http://www.danielpipes.org/

[2]Glenn E. Robinson: Elite Cohesion, Regime Succession and Political Instability in Syria, Middle East Policy Council, Volume V, January 1998, Number 4. http://www.mepc.org/main/main.asp

[3] بە جەنگی شەش رۆژە ناسراوە، چونکە پرۆسە سەربازییەکان شەش رۆژی خایاند، ئیسرائیل بردنەوەیەکی گەورەی بەدەست هێنا. روبەری ئیسرائیل چوار هێندەی خۆی زیادی کرد. سوریا لەم جەنگەدا بەرزاییەکانی جۆلانی لەدەستدا، کە دەکەوێتە باشوری رۆژئاوای سوریا. گرنگی ئەم شوێنە لە پێگە سەربازیەکەیدایە، کە دەروانێت بەسەر دیمەشق‌و دۆلّی جەلیل لە ئیسرائیل. لە لایەکی تر وەك بەنداوێکی ئاوی وایە، کە سالاَن ٤٠٠ ملیۆن مەتر موکەعەب ئاو بە ئیسرائیل دەبەخشێت. الان غریش و دومینیك ڤیدال، المصدر السابق، ص٢٠٢

[4] ئەو رێکەوتنە بوو، کە لە نێوان سەرۆکی میسر ئەنوەر ساداتو سەرۆکی ئیسرائیل مەناحیم بیگن گرێدرا بە ناوەندێتی سەرۆکی ئەمریکا جیمی کارتەر لە بارەگای هاوینەی سەرۆکی ئەمریکا لە کامپ دیڤد لە ١٧ی سێپتەمبەری ١٩٧٨. ئەم رێکەوتنە دوو بەش بوو بە یەکەمیان بە ناوی (پەیماننامەی ئاشتی) لە نێوان میسرو ئیسرائیل. دووەمیان چوارچیوەیەك بۆ ئاشتی لە رۆژهەلاَتی نزیك. الان غریش و دومینیك ڤیدال، المصدر السابق، ص ٣٦٧.

خزمەتی سەربازی، کە وایکردبوو سوریا هەمیشە لە قەیرانی دارایدا بێت بە تایبەت لە هەشتاکاندا[1].

لەرووی ئابوورییەوە سوریا لە ساڵی ١٩٩١ بڕیاری ژمارە ١٠ی وەبەرهێنانی دەرکرد، کە دەرگای لەسەر وەگەڕخستنی سەرمایەی بێگانە کردەوە. ئەم بڕیارە بەهۆی دواکەوتویی سیستەمی دارایی دەوڵەت سودێکی زۆری نەبوو[2]. بۆیە سوریا ئەلتەرناتیڤی تری لە بواری بوژاندنەوەدا چنگ کەوت، ئەویش یەکەم: قازانج کردنی بوو لە دووەمین جەنگی کەنداو، کە بە بەشداری کردنی لەو شەڕەدا بڕی ٤-٥ ملیار دۆلاری لە ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی وەرگرت. دووەم: سەرچاوەی نەوتی نوێی دۆزییەوە. لە ساڵی ١٩٨٥ هەناردەکردنی نەوتی سوریا لە ڕۆژێکدا ١٦٠ هەزار بەرمیل بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٥ هەناردەکردنی ڕۆژانە گەیشتە ٦١٠ هەزار بەرمیل. سێیەم: سوریا سودێکی باشی لە لوبنان بینی، بەوەی لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ناوخۆ لە لوبنان لە ساڵی ١٩٩٠ لە بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابوری ئەو دەوڵەتەدا، سورییەکان زۆر چالاکانە کاریان لەو دەوڵەتە کردو ساڵانە بڕی ١-٢ ملیار دۆلاریان دەناردەوە بۆ سوریا. هاوکات سوریا بوو بە بازاڕی بازرگانە لوبنانییەکان‌و بازرگانە سورییەکانیش بواری قازانجیان لە لوبنان قۆستۆتەوە[3].

لە ڕووی سیاسەتی دەرەکیشەوە ئەم دەوڵەتە ئامانجە گرنگەکانی بریتی بوو لە:

١. پاراستنی ئاسایشی نیشتمانی‌و نەتەوەیی: سوریا هەر گۆڕانکاری‌و پێشهات‌و جوڵەیەکی، کە لە ئاستی عەرەبی‌و ناوچەیی‌و نێودەوڵەتیدا سەریهەڵدەدا، لە ڕوانگەی هەڕەشە بۆ ئاسایشی نیشتمانی‌و یەکێتی نەتەوەیی عەرەب دەیبینی. ئەمە وایکردووە، چەمکی پیلانی دەرەکی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی وەك تارماییەك وابێت، کە لە ڕژێمی سوریا دانەبڕێت. سەرچاوەی هەڕەشە دەرەکییەکان بە پلەی یەکەم خودی ئیسرائیل بوو وەك دراوسێی سوریاو هەروەها سیاسەتەکانی ئیسرائیل بوو لە ناو لوبناندا. ئینجا دەوڵەتە

---

1 Eyal Zisser: The Syrian Army, op. cit. P 7

2 Glenn E. Robinson: op. cit.

٣ نۆرا بێنساهێل، دانیاڵ ل. بیمان: ئایندەی بارودۆخی ئاسایش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، وەرگێرانی: مەروان کاکل، هێمن غەنی، دەزگای موکریانی، هەولێر. ٢٠٠٧، ل ١٩٦.

نـەیارە عەرەبیـەکان، کـە ئـەردەن‌و عێـراق‌و میسـری دەگرتـەوە، لـە ئاسـتی ناوچـەیی‌و نێودەوڵەتیش تورکیاو ئەمریکاو هاوپەیمانی ناتۆ بوو.

٢. ئابووری: سوریا لە پەیوەندییە دەرەکیەکانیدا سیاسەت‌و ئابوری بەیەکـەوە گـرێ دابـوو، هـەر دەوڵـەتێك پەیوەندییـە سیاسـەکانی لەگـەڵ سـوریا باشـبێت ئـەوا پەیوەندییـە ئابووریەکانیشی بەتین بوو.

٣. پێگـەو مەکانـە: سـوریا وەك نموونـەی سـەربەخۆیی‌و سـەقامگیری‌و هەڵویسـتی نەتەوەیی لە سیاسەتی دەرەوەدا خۆی پیشان دەداو لەو باوەرەدابوو ئەمە رۆڵێکی تایبەتی لە گەمەی سیاسی ناوچەکەو جیهان پێدەبەخشێت.

٤. بەڕای سوریا ئاسایشی نەتەوەی‌و پێگەی ناوچـەیی وا پێویسـت دەکـات بەراسـتی پشـتگیری رەوت‌و رێکخـراوە سیاسـەکانی ناوچـەکە بکـەن کـە هاورایـە لەگـەڵ خۆیانـدا لـە هەڵوێسـت‌و بەرژەوەنـدی‌و بۆچـون سـەبارەت بـە کێشـە ناوچـەی‌و نێودەوڵەتییـەکان. ئـەم سیاسـەتە سـورییەکان بـە (هەڵوێسـتی مەبـدەئی) یـان (هاوپـەیمانی لەگـەڵ بزوتنـەوە رزگاریخوازیـە نیشـتمانیەکان) نـاوی دەبـەن. لـەم سـۆنگەیەوە سـوریا پشـگیری لۆجسـتی‌و کرداری حزب الله[1] ی لوبنانی‌و حەماسی[2] فەلەستینی‌و هێزە بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی دەکرد[1].

---

[1] رێکخراوێکی سیاسی‌و سەربازی شـیەکانی لوبنانـە. لـە ١٦ی فـەبرایری ١٩٨٥ دامـەزرا لـە دوای جیابونەوەی هەندیك لە بزوتنەوەی "امل"، کە نەبیه بری سەرکردایەتی دەکرد. لە ناو ئەو کەسانەدا ئیبراهیم ئەلئەمین، کە یەکەم ئەمینداری ئەو بزوتنەوەیە بوو. مستەفا ئەلدیرانی، کە بوو بە بەرپرسی ئاسایشی ناوەندی. سەید حەسەن نەسروڵلان، ئەمینداری ئێستای ئەو بزوتنەوەیە. حزب الله پەیوەندیەکی بـەتینی لـەگـەڵ ئێـران‌و سوریادا هەیەو پشگیری‌و ئەو دوو دەوڵەتەشی لەپشتە. عبداللاە بلقزیز: المقاومة وتحرير جنوب لبنان: حـزب الله في الحوزة العلمية الى الجبهة، بيروت، مركز دراسات الوحدة العربية، ٢٠٠٠، ص ص ٤٢-٤٣.

[2] بزوتنەوەی بەرگریکاری ئیسلامی، حـەماس، لـە لایـەن کۆمـەڵی ئیخـوان موسـلیمون لـە فەلەسـتین دامەزراوە. لە میانی یەکەمین ئینتفازەی فەلەستینی لە سێپتەمبەری ١٩٨٧. بـە سـەرکردایەتی شـێخ ئەحمـەد یاسین. رکەبەری سەرەی بزوتنەوەی فەتحی فەلەستینییە. باڵێکی سەربازی هەیە بە ناوی کەتیبـەکانی عیـزەدین

سوریا لە ساڵی ١٩٩١ سێ بڕیاری گرنگی دا، كە هەریەكەیان كاریگەری لە ئەستێكدا هەبوو، یەكەمین بڕیار لە ئاستی ناوخۆدا ڕۆڵی بینی، ئەویش بڕیاری ژمارە ١٠ی وەبەرهێنان بوو، كە ئەمە كرانەوەیەكی لیبراڵی بوو لە دەوڵەتێكی شمولیدا. دووەمین بڕیار لە ئاستی ناوچەییدا بوو ئەویش، بڕیاری چوونە ناو پرۆسە ئاشتی عەرەبی ئیسرائیلی بوو، كە ئەمە وەرچەرخان بوو لە هەڵوێستی سوریا بەرامبەر ئیسرائیل. سێیەمیان بڕیاری بەشداریكردن بوو لە پاڵ هاوپەیمانان بە سەركردایەتی ئەمریكا لە دووەمین جەنگی كەنداو. ئەوە بوو بۆ یەكەمجار ئەسەد وەك سەرۆكی سوریاو جۆرج بۆشی باوك وەك سەرۆكی ئەمریكا لە ٢١ی نۆڤەمبەری ١٩٩٠ لە جنێڤ كۆبووەوە، كە لەسەر داگیركردنی كوەیت و پرۆسەی ئاشتی عەرەب ئیسرائیل گفتوگۆیان كردبوو[٢]، ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ ئاسایی بوونەوەی پەیوەندیی سوریا–ئەمریكا. هەروەها سەركردایەتی سوریا بە پێویستیان زانی لەو قۆناغەدا بچنە سنووری بازنەی سیاسەتی ئەمریكاوە نەك دژایەتی كردنی[٣].

دوای ئەوەی سوریا لەژێر فشاری دووەمین جەنگی كەنداوو ڕووخانی یەكێتی سۆڤیەت، خۆی لە ئەمریكا نزیككردەوە، لێرەوە هێڵێكی پەیوەندی لە نێوان سوریاو ئیسرائیل دروست بوو بۆ گفتوگۆ كە بە گفتوگۆكانی مەدرید[٤] ناسرا، كە بە بچڕ بچڕی نەوەدەكانی

---

ئەلقەسام. ئەم ڕێكخراوە داننانێت بە دەوڵەتی ئیسرائیلیدا. لە دوای هەڵبژاردنەكانی فەلەستین، لە یەنایری ٢٠٠٥ حوكمەتی گرتۆتە دەست. الان غریش و دومینیك ڤیدال، المصدر السلبق، ص٢٤٨-٢٤٩.

[١] عقیل سعید محفوض: المصدر السابق، ص ١٥٤-١٥٥.

[٢] خالد حسین خالد: سوریه المعاصره، ١٩٦٣-١٩٩٣، دار كنعان، دمشق ١٩٩٦، ص ٢٣٤.

[3] Eyal Zisser: APPEARANCE AND REALITY, op. cit.

[٤] ئەم گفتوگۆیانە لە ٣ی ئۆكتۆبەری ١٩٩١ دەستی پێكرد بە بەشداری سەرجەم دەوڵەتە عەرەبییەكان جگە لە عێراق، هەروەها ئەمریكاو یەكێتی سۆڤیەت‌وئیسرائیل. ئامانج تیایدا ڕێكەوتنی نێوان عەرەب‌و ئیسرائیل بوو، تا ساڵی ٢٠٠٠ بە بچ بچری بەردەوام بوو لە میانەیدا فەلەستینییەكان‌و ئیسرائیل ڕێكەوتن لە ساڵی ١٩٩٣لەسەر وەرگرتنی حوكمێكی خۆبەخۆ لە غەززەو زففەی ڕۆژئاوا. هەروەها ئەردەن‌و ئیسرائیل ڕێكەوتنی ئاشتییان لە ١٩٩٤ واژۆ كرد. الان غریش و دومینیك ڤیدال، المصدر السلبق، ص٣٩٨.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سوریا چۆن کەوتبووە ژێر باری فشاری چاکسازی ئابووریو کرانەوە لە پەیوەندیە دەرەکیەکان، هاوکات لە ئاستی ژینگەی ناوخۆیدا لەژێرباری فشاری چاکسازی سیاسیدا بوو[٢].

دەتوانین بڵێین سوریا لە ساڵانی نەوەدەکان ئەو دەوڵەتە بوو، کە خواستی ئەوەی هەبوو، گۆرانکاری لە خۆیدا بکات. ئەم خواستە لە ئاستی پەیوەندییە دەرەکیو ئابووریدا بە روونی دیار بوو، هاوکات بە گرتنە دستی دەسەڵات لە لایەن بەشار ئەسەدەوە چاوەروانی گۆرانکاری ناوخۆیش بەرێوە بوو. بەڵام ئەم هەنگاوانە، تا ساڵی ٢٠٠٣ کە سنوری بابەتەکەی ئێمەیە، هیچ ئەنجامێکی یەکلاکەرەوەی بەدەستەوە نەدا. پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئیسرائیلو ئەمریکا نەیتوانی قۆناغی ململانێ بۆ قۆناغی ئاسایی بوونەوە تێبپەرێنێت. هەروەها لە ناوخۆدا سیستەمی تاکرەوی حزبی بەعسو سەرۆك، بەردەوامی بەخۆی دابوو. هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی ئەم هەولانەش ئەوە بوو، کە بنەماڵەی ئەسەد نەیدەتوانی گۆران لە رژێمێکدا بکات کە بە درێژایی ساڵانی حەفتاکانو هەشتاکان سەرسەختانە لە پێناویدا جەنگاون بۆ مانەوەی ئەو رژێمە. هاوکات سوریا لەرووی ئابووری سەربازییەوە توانای ئەوەی نەبوو کە رۆڵی ناوچەیی ببینێت، بۆیە لە رێگای پشگیریکردنی بزوتنەوە چەکداریەکانەوە، ململانێی دەوڵەتە ناوچەییەکانی دەکرد.

---

[١] خليل حسن: الصراعات الاقليمية والدولية في لبنان: دار المنهل اللبناني، بيروت،٢٠٠٨ص١٣٠-١٣١. للمزيد من معلومات انظر:

Yossi Ben-Aharon: NEGOTIATING WITH SYRIA: A FIRST-HAND ACCOUNT Volume 4, No. 2- June 2000. MERIA Journal. .http://www.biu.ac.il/SOC/besa/meria/index.html

[٢] جون داينزوسكي: سورية تعمل على تغيير صورتها، مركز الشرق العربي للدراسات الحضارية والاستراتيجية، http://www.asharqalarabi.org.uk/index.htm

# تەوەری دووەم

## پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و سوریا

سوریاو عێراق وەك دوو دەوڵەتی هاوسێ، مێژوویەکی پڕ لە ململانێو کێشمە کێشیان بۆ خۆیان تۆمار کردووە. ئەمە وایکردوو، کە پەیوەندیەکانیان کەمترین باری ئاسایی‌و زۆرترین بار گرژی بەخۆوە ببینێت. سەرەتای پەیوەندیەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە بریتانیاو فەرەنسا بە پێی رێکەوتنامەی سان ریمۆ لە ٢٦ی ئەپریلی ١٩٢٠دا بوون بە دەوڵەتی ماندات بەسەر عێراق‌و سوریا[١]، پاشان هەریەك لەم دوو دەوڵەتە بە نوێنەرایەتی عێراق‌و سوریا رێکەوتنامەی سنوریان لە ٢٣ی دیسەمبەری ١٩٢٠ واژۆ کرد، کە نەخشەی سنوری نێوان ئەم دوو دەوڵەتەی دیاری کرد. ئەوەی جێگای کێشە بوو لە نێوانیاندا کوردە ئێزدیەکانی چیای شەنگال بوو کە لە ساڵی ١٩٣٢ لە ناوچەکەدا راپرسی لەسەر کراو بە قازانجی عێراق‌و بریتانیا تەواو بوو. پاشان دوا رێکەوتنی دیاریکردنی سنور لە ساڵی ١٩٣٣ لە لایەن هەردو لاوە پەسەند کرا[٢].

---

[١] ابراهيم سعيدى: سوريه، وزارت امور خارجى، تهران، ١٣٦٥، ص٩٨.

[٢] عمار شريف كاظم العظماوي: الحدود العراقية ـ السورية " دراسة في الجغرافية السياسية، رسالة ماجستير، غير منشورة، كلية الاداب، جامعة بغداد، ٢٠٠٧، ص ٦٨-٦٩

گرنگ ترین ئەو هۆکارانەی کە رۆڵی بینی لە پەیوەندیەکانی نێوان سوریاو عێراقدا بریتی بوون لە ململانێ ناوخۆییەکانی حزبی بەعس، هەروەها کەسێتی حافز ئەسەدو سەدام حسێن، لەگەڵ سیاسەتی ناوچەیی ئەو دوو دەوڵەتەدا.

ململانێ ناوخۆیەکانی حزبی بەعس رەنگدانەوەیەکی کاریگەری هەبوو لەسەر پەیوەندیەکانی ئەم دوو دەوڵەتە. ئەم حزبە دوو سەرکردایەتی هەبوو. یەکەمیان سەرکرایەتی نەتەوەیی (القيادة القومية) کە نوێنەرایەتیی هەموو حزبی بەعسی دەکرد لە جیهانی عەرەبیدا. دوومیان سەرکرایەتی هەرێمی (القيادة القطرية) بوو کە نوێنەرایەتی حزبی دەکرد لە دەوڵەتە عەرەبییەکاندا. لە دوای کۆنگرەی پێنجەم لە مارتی ١٩٦٢ لە حمس، دابەشبوون لە نێوان سەرکردایەتی نەتەوەییو سەرکردایەتی هەرێمی سوریادا سەریهەڵدا. ئەم سەرکرایەتییە یەکەمیان بەرەو راسترەوی نەتەوەیی دەچوو، کە زۆرینەیان لە عێراق کۆبونەوەو دووەمیان بەرەو چەپرەوی هەنگاوی دەنا بریارەکانی سەرکردایەتی نەتەوەیی رەتدەکردەوە. کاتێك حزبی بەعس لە سوریا لە مارتی ١٩٦٣ چونە سەر کورسی دەسەلات، دوای پێنج ساڵ ئەم حزبە لە یۆلیۆی ١٩٦٨ دەسەلاتی لە عێراق وەرگرت، ئەم پێنج ساڵە بەس بوو بۆ جیابونەوەی تەواوەتی سەرکردایەتیی هەرێمی سوریا لە سەرکردایەتی نەتەوەیی بەعس کە زۆرینەیان لە عێراق کۆبوبونەوە. بە دیوێکی تردا، ناکۆکییەکانی نێوان ئەو پارتە بۆ ناکۆکیيەکانی نێوان عێراقو سوریا گواسترایەوەو سەرچاوەی ئەو ناکۆکیانەش ئەوە بوو ئەسەد، نەیدەویست عێراق بە ناوی سەرکردایەتی نەتەوەییەوە دەست لە کاروباری ناوخۆی سوریادا وەربدات [1]. ئەم ململانێیە بەردەوام بوو تا سوریاو عێراق جارێکی تر بەهۆی دژایەتیکردنی رێکەوتنی کامپ دیڤدی ساڵی ١٩٧٨، لەیەکتر نزیك بونەوەو ئەسەد "گەڵاڵە نامە کاری نەتەوەی" لەگەڵ سەرۆك کۆماری عێراق، ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر (١٩٦٨-١٩٧٩) واژۆ کرد. ئەم رێکەوتنە پرۆژەی کۆنفدراڵی نێوان سوریاو عێراقی هێنایە کایەوە. ئەوەی رێگر بوو لەبەردەم ئاسایی بونەوەی پەیوەندیەکان، سەدام حسێن بوو، کە

---

[1] بوعلي ياسين واخرون: الاحزاب والحركات القومية العربية، الجزء الاول، المركز العربي للدراسات الاستراتيجية، بدون مكان وسنة الطبع، ص ٣٧١-٣٨٦.

خواستی سەرۆك کۆماری عێراقی هەبوو. بۆیە ئاسایی بونەوەی پەیوەندیەکانی عێراقو سوریاو پرۆژەی کۆنفدراڵی نێوانیانو ئەو کەسانەی لەپشت ئەم پرۆژەیەوە بوون بە تایبەت ئەسەدو ئەلبەکر، بە بەربەستێکی زانی لەبەردەم خواستە کەسێتییەکانی. سەدام حسین لە ١٨ی یۆلیۆی ١٩٧٩ دەسەلاتی سەرۆك کۆماری لە ئەلبەکر سەندو لە یاداشتێکدا رایگەیاند، کە گروپێکی لە ناو حزبی بەعس ئاشکرا کردووە کە بە یارمەتی سوریا پیلانیان دژی عێراق داناوەو بەو هۆیەوە کۆمەڵێکی لەناو پارتەکە لە سێدارەدا کە پێنج کەسیان لە سەرکردایەتی هەرێمی عێراقی بوون. لێرەوە ململانێی کەسێتی لە نێوان ئەسەدو سەددام حسین سەری هەڵدا[١].

ئەوەی جێگای سەرنجە لەرووی کەسێتیەوە سەدامو ئەسەد لێکچونیان زۆر بوو، هەردوکیان لەرێگای کەمینەیەکی دێهاتنشینەوە سەرکردایەتی دەوڵەتیان دەکرد، هەردوکیان سەرۆکی پارتی دەسەلاتدار بوونو هاو سەردەمی یەکتر بوون. ئەم دوو سەرکردەیە پشتیان بە تۆقاند بەستبوو لە فەرمانڕەوایەتیداو هێرشبەربوون بۆ سەر دراوسێ لاوازەکانیان. ئامادە بوون لە پێناوی خۆیان، بەرژەوەندی ولات ژێر پێ بخەن بۆ ئەم مەبەستەش پشتیان بە دەزگا ئەمنیەکان بەستبوو. بەلام خالی جیاوازیان ئەوە بوو کە سەدام کەسێتییەکی تاوانباری هەبوو، ئەسەد سڵەمینەوەی هەبوو. سەدام باوەری بە توندو تیژی زۆر بوو، ئەسەد تەنها بۆ ترساندن بەکاری دەهێنا. سەدام کۆنترۆڵی سەرجەم لایەنەکانی ژیانی کۆمەلگای کردبوو، ئەسەد بۆشاییەکی بەرتەسکی بۆ ئازادی هێشتبۆوە. سەدام دەیویست ببێت بە پاڵەوانی عێراقو عەرەبو جیهان، ئەسەد سنورەکانی خۆی دەزانی. سەدام بەهۆی سەرشێتییەوە پێشبینی هەڵوێستەکانی نەدەکرا بەلام ئەسەد وردو درشت بوو لە مامەڵەدا، شوێنو کاتو لاوازیو بەهێزی بەرامبەرەکەی دیاری دەرکرد[٢]. لێرەدا دەتوانین بڵێین کە ململانێی نێوان ئەسەدو سەددام رەنگی دابۆوە بەسەر سیاسەتی دەرەوەی سوریا. هەردوکیان خۆیان بە هەلگری پەیامی بیری نەتەوەیی عەرەبی دادەنا، بۆیە ئاراستەی

---

[١] نفس المصدر: ص ٤٠٢-٤٠٣.

[2] Daniel Pipes: Politics in Syria, op. cit.

کارکردنیان بە تایبەت لە پەیوەندییە دەرەکییەکان و پرسە ناوچەییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست، بە تەواوەتی پێچەوانەو دژ بەیەك بوو[1].

ئەگەر چی ئەم دوو دەوڵەتە روبەروبونەوەی سەربازی لە نێوانیاندا رووی نەدا، بەڵام هەردولا سەرسەختانە لە دژی یەکتر لە ملاملانێدا بوون لە ئاستی پەیوەندیە دەرەکیەکان. سوریا لە جەنگی عێراق و ئێراندا، لە ساڵی ١٩٨١، بوو بە لایەنگری ئێران. هاوکات بە تەواوی پشگیری بەرهەڵسکارانی عێراقی کرد بە کوردو عەرەب و بە عەلمانی و ئسلامیەوە. لە بەرامبەردا عێراق پشگیری رێکخراوی چەکدارەکانی ئیخوان موسلمینی لە حەماە کرد بۆ رووخاندنی رژێمەکەی ئەسەد[2]. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، عێراق دەیویست تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئامانجی عێراق گەمارۆدانی سوریاو کەمکردنەوی هەژمونی سوریا بوو لە ناوچەکەدا. بۆیە یەکێك لە هۆکارەکانی دامەزراندنی ئەنجومەنی هاریکاری عەرەبی (مجلس التعاون العربي) کە عێراق لەگەڵ میسرو یەمەن و ئەردەن لە ١٦ی فەبرایری ١٩٨٩ پێکیهێنا، بۆ بچووکردنەوەی رۆڵی سوریا بوو لە جیهانی عەرەبیدا. لەلایەکی تر عێراق یارمەتی ئەو هێزە چەکدارانەی دەدا کە دژی سوریا بوون لە لوبنان، بەڵام سوریا لەبەردەم ئەم هەولانەی عێراق، وەك یەکەمین دەوڵەتی عەرەبی، عێراقی بە ئەنجامدانی کۆمەڵکوژی لە هەڵەبجەدا تاوانبار کرد لە سێپتەمبەری ١٩٨٨[3].

داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە گەورەترین دیاری پێشکەش بە سوریا کرد، چونکە لە لایەك عێراقی لە جیهانی عەرەبیدا کەنارگیر کرد، هاوکات سوریا بەهۆی ئەم رووداوەوە توانی خۆی لە ئەمریکا نزیك بکاتەوە هەروەها ئابووری خۆی بەهۆی یارمەتیەکانی ئەمریکاوە هەڵبسێنێتەوە. سوریا زۆر بە خێرایی دژایەتی خۆی بۆ ئەو کارەی

---

[1] جراهام فولر: العراق في العقد المقبل: هل سيقوى على البقاء حتى عام ٢٠٠٢، مركز الامارات للدراسات والبحوث الاستراتيجية، العدد ١٤، مكتبة الاسكندرية، بدون سنة الطبع، ص١١٦-١١٧.

[2] بوعلي ياسين واخرون: المصدر السابق، ص ٤٠٤-٤٠٥.

[3] م. س. لازاریف و ئەوانی تر: کوردستانی هاوچەرخ، وەرگێرانی لە فارسییەوە: گوشاد حەمە سەعید: چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل. ١٣٦.

عێراق دەربڕیو پاشان ئەسەد لە کۆنگرەی لوتکەی عەرەبیدا، لە ١٠ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠، کە بۆ پرسی داگیرکردنەکە تەرخانکرابوو، وتی: "بەرگری کردن لە هەر مەترسیەك بۆ سەر ناوچەکە، بە پاشەکشێی عێراق دەست پێدەکاتو بە گەرانەوی کوێت بۆ باری پێشووتری خۆی تەواو دەبێت". پاشان هەڵوێستی سوریا لە گفتارەوە بۆ کردار گۆراو لە ١٤ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠، یەکە سەربازیەکانی سوریا چوونە خاکی سعودیە[1]. سوریا دەیزانی، کە عێراق لە دووەمین جەنگی کەنداو سەرگەرمی بەرەی جەنگە لە باشورو هیچ مەترسیەکی سەربازی بۆ سەر سوریا نییە، بەلام مەترسی سوریا لەوەدا بوو، کە بە کۆنترۆلکردنی نەوتی کوەیتو سعودیە لە لایەن عێراقەوە پێگەیەکی بەهێز بۆ سەرکردایەتیکردنی عەرەب بە عێراق دەبەخشێت، بە تایبەت لە دژی ئیسرائیل ئەمەش لە سەنگی سوریا لە ناوچەکە کەم دەکاتەوە. هاوکات شکستی عێراق لەو جەنگەدا، ئاستی عێراق لە ناوچەکەو لە دەوڵەتانی عەرەبی دادەبەزێت. لەگەڵ ئەوەی ئەم ئەگەرانە بە دیوێکدا بە قازانجی سوریا کۆتایهاتو ئالای عەرەبی بۆ میسرو سوریا بەجێما، بەلام بە دیوێکی تر هاتنی هێزی هاوپەیمانان بۆ ناوچەکە بەهێزبونی هەژمونی رۆژئاوا بوو لە ناوچەکەدا کە ئەمەش لە بەرژەوەندیی ئیسرائیل بوو، نەك عەرەب. هەروەها ریزی عەرەبی لە نێوان لایەنگرانو دژەکانی ئەو جەنگەدا پەرت پەرت بوو کە ئەو بەقازانجی ئیسرائل بوو. بۆیە ئەسەد ئەوەندەی ناچار بوو ئەوەندە باوەڕی بە بەشداری کردن لەو شەرە نەبوو[2].

کاتێك عێراق لە دووەمین جەنگی کەنداودا بە دۆراندن چووە دەروە، ئەم بارەی عێراق پێچەوانەی بۆچونی دەوڵەتە دراوسێکان بوو کە زۆرینەی گرەوەکانیان لەسەر رووخانی رژێم کردبوو. بەغداد دوای تەواوبونی جەنگ، بە هەموو جۆرێك هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی دووبارە بچێتەوە باری پێشووتری خۆی لە سەرجەم لایەنەکانەوە. لە پێناوی ئەم

---

[1] محمد السيد سعيد: محمد السيد سعيد: مستقبل النظام العربي بعد ازمة الخليج، عالم المعرفة ، الكويت، ١٩٩٢، ص ٧٩.

[2] Anoushiravan Ehteshami and Raymond A.Hinnebusch Syria and Iran Middle powers in a penetrated regional system Routledge , London and New York 1997, P81-82

ئامانجەشدا دەستی یارمەتی بۆ دوژمنە دێرینەکانیشی درێژ دەکرد لە ناویشیاندا سوریا. عێراق ویستی هەناردە کردنی نەوت بکاتە بەردەباز بۆ ئاسایکردنەوەی پەیوەندیەکان، بە تایبەت دەیزانی، کە سوریا لە بارێکی نالەباری ئابوریدایەو نەوتی عێراقی یارمەتیدەری بوژاندنەوی ئابوریەکەی دەبێت. ئەوە بوو شاندێکی عێراق لە مارتی ١٩٩٢ گەیشتە سوریا بۆ وەگەرخستنەوەی هێڵی نەوتی (کەرکوك-بانیاس)، کە لە ساڵی ١٩٨٢ بەدواوە داخرا بوو، بەڵام ئەم هەوڵە لە لایەن سوریا وەڵامنەدرایەوە چونکە سوریا پابەندبونی خۆی بە بریاری نەتەوە یەکگرتووەکان لە بواری گەمارۆدانی عێراقدا دەربری بوو[1]. دوای ئەم هەوڵە عێراق‌و سوریا دوای دە ساڵ لە بچڕانی تەواوەتی پەیوەندیەکان، لیژنەیەکی دیاری رووپێوی سنوریان پێکهێنا بۆ دیاریکردنەوەی سنوورو دووبارە دانانەوی ستونەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت، ئەمەش لە پێناوی رێگرتن لە سنوربەزاندنی خێڵەکان بوو. ئەم لیژنەیە لە ماوەی (١٩٩٢-١٩٩٤) کارەکانی خۆیان تەواو کرد[2]. دەتوانین ئەم هەوڵە بە رێگاخۆشکردن دابنێین بۆ نزیکبوونەوەی دووژمنە دێرینەکان. سوریا پێخۆشبونێکی پێوە دیار بوو لە ئاسایکردنەوەی پەیوەندیەکان، چونکە لەم کاتەدا لە دابەشبونی عێراق‌و دەوڵەتی کوردی دەسڵەمیەوە. بۆیە سوریا نارازی بوو لە سیاسەتی نێودەوڵەتی بەرامبەر عێراق‌و داوای هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری دەکرد[3].

لە دوای دەرچوونی بریاری (٩٨٦)ی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرامبەر عێراق، سوریا بینی، کە تورکیاو ئەردەن بە فەرمی سود لە هەناردەکردنی نەوتی عێراق وەردەگرن، هاوکات تورکیاو ئێران بە رێگای قاچاخ نەوتی عێراقیان چنگ دەکەوێت، بۆیە بە هەمان شێوەی ئەوان، سوریا بە نەوتی قاچاخی عێراقەوە دەستی بە بازرگانیکردن کرد. ئەم نەوتە لە رێگای بۆریە نەوتیەکانەوە دەچووە سوریا دوای ئەوی عێراق بە فەرمی لە یۆلیۆی ١٩٩٧

---

[1] Anthony H. Cordesman and Ahmed S. Hashm: op. cit. P 197.

[2] عمار شريف كاظم العظماوي: المصدر السابق، ص١٠٨-١٠٩

[3] عقيل سعيد محفوض: المصدر السابق، ص ٢٨٨

رایگەیان، کە بۆریە نەوتیەکانی نێوان (سوریا–عێراق) بە تەواوەتی ئامادەیە بۆ کارکردن [1].
هەرچەندە بە فەرمی سوریا نکۆڵی لەوە دەکرد کە گەمارۆی ئابوری سەر عێراقی شکاندبێتو نەوتی عێراق هاوردە بکات[2]، بەلاّم راپۆرتە هەواڵیەکان بە ئاشکرا لەو پرسە دەدوان کە سوریا رۆژانە ۱٥٠ هەزار بەرمیل نەوتی عێراقی پێدەگاتو کە هەر دەوڵەتەو بری ۱.۱ ملیار دۆلاری سالانە دەستدەکەوت[3]. هاوکات نوێنەری بریتانیا لە نەتەوە یەکگرتوەکان بە فەرمی رایگەیاند کە سوریا رۆژانە (۱٠٠) هەزار بەرمیل نەوتی عێراقی بە قاچاخ هاوردە دەکات[4].

لەپاڵ پرۆسەی بە قاچاخبردنی نەوت، پەیوەندیی بازرگان بە فەرمی دەستی پێکرد، ئەوە بوو وەزیری بازرگانی عێراق، محەمەد مەهدی صالح، وەك یەکەم وەزیری عێراق لە ئۆگستۆسی ۱۹۹۷و دوای (۱۷) ساڵ لە بچرانی پەیوەندییە دوو قۆڵییەکان، چووە دیمەشقو لەگەڵ سوریا لەسەر بنیاتنانەوەی پەیوەندیە بازرگانیەکان رێکەوتن. لەوە زیاتر داوای ئاسایکردنەوی پەیوەندیە سیاسەکانیشی خستبووە بەردەم سوریا بەلاّم سوریا، رایگەیان، کە پەیوەندییان لەگەڵ عێراقدا چوارچێوەی بازرگانی تێناپەرێنێت[5].

لە دوای ئەم سەردانە دوو بنکەی بازرگانی لە سەر سنوری هەردوولا کرایەوە، وێرای ئەمە بۆ ئاسانکردنی گواستنەوەی کالاّ بازرگانیەکان، هێڵی شەمەندەفەر وەگەڕ خرا. کۆمپانیا عێراقیەکان کالاّکانیان لە دیمەشق دەخستە روو. زیاتر لەوە دیمەشق بوو بە وێستگەی

---

[1] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (٩٦٢). ١٩٩٧/٧/٩

[2] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد(١٧٦٦).٢٠٠٠/١٢/٢٠

[3] سورية والحرب على الإرهاب الجزء الثاني ماثيو ليفيت : باحث كبير في معهد واشنطن ـ الولايات المتحدة٢٤ /٢٠٠٢/٠١، http://www.asharqalarabi.org.uk/index.htm

[4] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد( ٢١٥٣) / ٢٠٠٢.

[5] الانصات المركزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد(٧٨) ١٩٩٧/٨/٣٠

گەشتی ئاسمانی بەرپرسەکانی عێراق بەرەو جیهانی دەرەوە[1]. هەموو ئەمانە هۆکار بوون بۆ ئەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستویەکدا، ململانێی و دوژمنایەتی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بۆ هەماهەنگەی و هاریکاری بگۆڕیت. ئەم راستیە دوای سەردانی جێگری سەرۆك کۆماری عێراق تاریق عەزیز بە تەواوی دەرکەوت و لەسەر زاری وزیری دەرەوەی سوریا فاروق ئەلشەرع جەختی لەسەر کرایەوە، کە وتی: " بەغدادو دیمەشق بەرەو ئاسایی بونەوەی پەیوەندیەکان هەنگاو دەنێن[2].

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو عێراق لە شەستەکان و حەفتاکان لەژێر کاریگەریی کێشە ناوخۆییەکانی حزبی بەعسدا بوو. لە هەشتاکان و نەوەدەکاندا ئەم ململانێیە سروشتێکی تری وەرگرت و پەیوەندیی بە رکەبەری کەسێتی نێوان ئەسەدو سەدام حسینەوە هەبوو. بەڵام دوای ئەوەی عێراق لە دووەمین جەنگی کەنداو بە دۆراوی و لاوازی هاتە دەرەوە، عێراق کاری لەسەر برایەتیی نەتەوەیی عەرەبی نێوان سوریاو عێراق دەکرد. لە بەرامبەردا سوریا سودی لە لاوازی عێراق وەرگرت بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی لە جیهانی عەرەبیدا بە تایبەت لەرووی دەسوەردان و بەشداریکردن لە کێشەکانی جیهانی عەرەبی بە گشتی و کێشە ناوخۆییەکانی عێراق بە تایبەتی. لە دوای مردنی ئەسەد لە یۆنیۆی ٢٠٠٠، ئاستەنگی کەسێتی لە پەیوەندییەکانی هەردولادا نەماو سوریاو عێراق زیاتر لەیەك نزیك دەبوونەوە، چونکە هەردولا وەك دوو دەوڵەتی لێکچوو لە پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینیی و تا دەگاتە رژێمی حوکمرانی کەوتنە بەردەم هەرەشەی پرۆسەی گۆرانکاری کە لە رۆژهەلاتی ناوەراست. بە تایبەت لە دوای رووداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١و هەڵمەتی ئەمریکا بۆ دژایەتیکردنی گروپە تیرۆرستییەکان و ئەو دەوڵەتانەی، کە پشگیری تیرۆر دەکەن.

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد١٢٣٦ ١٩٩٩/٥/٢٥. الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد ٢٠٠٠/٧/٢٣

[2] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد(١٧٤٥) ٢٠٠٠/١١/٢٦.

# تەوەری سێیەم
# سیاسەتی سوریا بەرامبەر بە کێشەی کورد

سیاسەتی سوریا بەرامبەر کێشەی کورد دوو جۆر بوو، یەکەمیان سیاسەتی بەرامبەر بە کێشەی کورد لە ناوخۆی سوریا، دوومیان سیاسەتی بەرامبەر بە کێشەی کورد لە دەرەوەی سوریا. لەم تەوەرەیەدا باس لەم دوو جۆری سیاسەتە دەکەین.

## یەکەم-سیاسەتی ناوخۆیی سوریا بەرامبەر کێشەی کورد:

دانیشتوانی سوریا لە ساڵی ٢٠٠٣، ١٨,٢٠٠.٠٠٠ کەس بووە(١). کە بەسەر کەمینە ئاینیو نەتەوەییەکان دابەش بوون. کورد وەك کەمینەیەکی نەتەوەیی، هیچ ئامارێکی فەرمی نییە بۆ دیاریکردنی رێژەکە لە سوریا. ئەوەی هەیە خەمڵاندنێکی نزیکەییە. لەلایەن نیکۆلاس ڤاندام رێژەکەی بە ٨.٥٪ی دانیشتوانی سوریا دانراوە(٢)، عیسمەت شەریف وانلی بە ٩-١٠٪(٣) و کەریم یەڵدز بە ٨-١٠٪ی داناوەو بە ١.٥-٢ ملیۆن کەس مەزەندەی کردون(١)،

[1]Kerim Yildiz: The Kurds in Syria. op. cit. P23.

٢ نیقولاس فان دام: المصدر السابق، ص١٦-١٧.

[3]Ismet Chériff Vanly: The Kurds in Syria and Lebanon, in The,Philip G.Kreyenbroek and Stefan Sperl: The Kurds A Contemporary Overview, Fifth published, Reprinted, London and New York , 2005, P115.

هەروەها دکتۆر عەقیل سەعید مەحفوز بە ٧٪ی سوریاو دانیشتوانەکەشی بە ١.٤ ملیۆن مەزەندە کردوە[٢]. سەرچاوەیەکی تریش رێژەی کوردی لە سوریا بە ١٢٪ی دانیشتوانی سوریا مەزەندە کردووەو ژمارەی کوردیی بە سێ ملیۆن داناوە[٣].

کورد بەسەر پارێزگاکانی جەزیرە (حەسەکە)، عفرینو کوبانی لە پارێزگای حەلەبدا دابەشبوون. ئەمەو بەشێکی تر لە کوردی سوریا کەوتونەتە سنوری پارێزگای دیمەشق[٤]. شێوازی دابەشبونییان نزیکەی ٤٠٪ی کوردی رۆژئاوا بەر شاری جەزیرە کەوتووە، پارێزگای حەڵەب ٣٠٪ی کوردی لێیەو بەشەکەی تریش بەسەر دیمەشقو ناوەندی شاری حەلەبدا دابەشبوون[٥].

لە سەردەمی مانداتی فەرەنسا لە سوریا (١٩٢٠-١٩٤٦) کورد خاوەنی رێکخراوی سیاسیو گۆڤارو کتێبو بلاَوکراوە بوون، بەلاَم بە پێچەوانەی ناوچەی عەلەویو دروز، رێگە بە کورد نەدراوە، کە وەك ئەوان، خاوەنی دەسەلاَتی خۆجێی بن[٦]. بە سەربەخۆ بونی سوریا لە ١٩٤٦، کورد وەك نەتەوە رۆژ لە دوای رۆژ توشی چەوسانەوەو پشتگوێ خستن بووە. لە ساڵی ١٩٥٦ بەدواوە زمانی کوردی لە خوێندنگا و بازارەکان یاساغ کراوە، هەروەها نوسینی کوردیو بلاوکروەی کوردی قەدەغە کراوە. لە دوای دروستبوونی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە نێوان میسرو سوریا لە فەبرایەری ١٩٥٨ بە سەدەها ئەفسەری کورد لە سوپا دەرکرا لە ناویشیاندا سەرەك ئەرکانی سوریا (تەوفق نیزامەدین)، هەروەها دەرگای کۆلیجی پۆلیسو سەربازی بەرویاندا داخرا. لە سەرژمێری ساڵی ١٩٦٢کە لە پارێزگای جەزیرە ئەنجام دراو تیایدا ١٢٠ هەزار کورد لە مافەی هاولاَتیبون بێبەشکرانو بە

---

[1] Kerim Yildiz: The Kurds in Syria. cit. P23

[٢] عقيل سعيد محفوض:: المصدر السابق، ص١٠٣.

[٣] القضية الكوردية فى كوردستان-سوريا خلال عهد الرئيس حافظ الاسد، المصدر السابق، ص٢.

[٤] القضية الكوردية فى كوردستان-سوريا خلال عهد الرئيس حافظ الاسد، ص٢.

[٥] غاري كمبل: الصحوة الكردية في سورية، مركز المعطيات والدراسات الاستراتيجية، www.dascsyria.com

[٦] نيقولاس فان دام: المصدر السابق، ص ص ١٦-٢٠

بێگانەکان(اجانب) ناوبران بە بەهانەی ئەوەی کە دوای ساڵی ١٩٤٥ بە شێوەیەکی نافەرمی هاتونەتە ناو خاکی سوریا. حکومەتی سوریا لە ساڵی ١٩٩٦ دانی بەوەدا نا، کە ٦٧.٤٦٥ کورد لە سوریادا مافی هاوڵاتیی ئاساییان نییە[1]. وێرای ئەمەش بەرنامەی چاکسازی زەویە کشتوکاڵیەکان لە سوریا کە بە پرۆژەی (پشتێنەی عەرەبی) ناسراو بوو، ٤٣.٪ی لە ناوچە کوردییەکان جێبەجێ کرا کە ئامانجی ریشەکێش کردنی کورد بوو لە زێدی خۆیان‌و لاواز کردنی کۆمەڵگای کوردی بوو بە تایبەت لەرووی سیاسییەوە[2].

دەکرێت سیاسەت‌و تێروانینی سوریا بە ئێستاشەوە بە رامبەر بە کورد لە پرۆژەکەی محەمەد تەڵەب هیلال[3] ببینینەوە. ئەم پرۆژەیە ١٧٠ لاپەرەیەو لەژێر ناونیشانی، توێژینەوەیەك سەبارەت بە پارێزگای جەزیرە لە لایەنی نەتەوەیی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەوە، (دراسة عن محافظة الجزيرة من النواحي القومية والاجتماعية والسياسة) لە ١٢ی نۆڤەمبەری ١٩٦٢پێشکەشی دەسەلأتدارانی سوریا کراوە[4]. لەم پرۆژەیەدا زۆر بە روونی دەڵێت،

---

[1] SYRIA, THE SILENCED KURDS, October 1996 Vol. 8, No. 4(E). www.hrw.com

[2] غاری کمبل: المصدر السابق.

[3] محەمەد تەلەب هلال (١٩٣١-٢٠١١)، لە شارۆچکەی غەسم سەر بە پارێزگای درعا لەدایك بووە. ئەم کەسایەتییە بە پلاندانەری (پشتێنەی عەرەبی ) دادونرێت. لە ساڵی ١٩٦١ وەك ئەفسەری پلە یەك سەرپەرشتیاری هۆبەی ئاسایش بووە لە پارێزگای حەسەکە. لە ١٢ی نۆڤەمبەری ١٩٦٣، پلەی چاودێری لە سەرکردایەتی حزبی بەعس وەرگرتووە، پاشان پۆستەکانی وەزیری تەموین‌و پاشان. بووە بە جێگری سەرەك وەزیرانی لە ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٢) بینیوە. لە ساڵی ١٩٧٢-١٩٧٩ نوێنەر سوریا بووە لە پۆلندا. لە مردنەکەشیدا بە بەشداری نوێنەری سەرۆك کۆمار رێورەسمی تایبەتی بۆ رێکخراوە. ئەم کەسایەتیە لە لایەن کورد بێزراوەو بە دارێژەری پلانی رەگەزپەرستی عەرەبی دژ بەکورد دایدەنێن. توێژینەوەکەشی نهێنی بوو تا رێکخراوی کاوە بۆ رۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠١ کۆپییەکی بلاو کردەوەو بۆ چەندین زمانی بێگانە وەریگێراوە http://www.sotsyria.com

[4] محمد طالب هلال: دراسة عن محافظة الجزيرة من النواحي القومية والاجتماعية والسياسة، نقلا عن، جواد ملا: السياسة الاستعمارية السورية في غرب كوردستان، ص٥٩-٢٢٩

نەتەوەیەك بەناوی نەتەوە کورد نییە چونکە تایبەتمەندی نەتەوە لە کورددا نییە، هەروەها نیشتمانێکی نەتەوەییشیان نییە بەڵکو ئەمانە کۆمەڵێك خەڵکی نیشتەجێی شاخەکانن کە سروشتەکەیان جیای کردونەتەوە..... نە مێژوو، نەشارستانی، نەزمان‌و نە رەگەزیان نییە. تەنها سیفەتی هێزو توندو تیژییان تێدایە. کێشەیەکیش نییە بە ناوی کێشەی کورد. ئەمەی هەیە لوویەکی پیسە دروست بووە یان دروست کراوە لەناو لاشەی نەتەوەی عەرەبیداو هیچ چارەسەرێکی نییە تەنها برین نەبێت[1].

هیلال دوانزە پێشنیار دەخاتە بەردەست دەوڵەت بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کوردی سوریا کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١. سیاسەتی کۆچ‌پێکردن بۆ ناوەوەی وڵاتو پاشان دابەشکردنیان‌و ئەوجا جێنشینکردنی عەرەب لە ناوچە کوردییەکاندا.

٢. دەستکاریکردنی تۆماری رەگەزنامەکانیان

٣. ناوچەی پشتێنەی باکوور بکرێتە ناوچەیەکی سەربازی

٤. کردنەوەی کێڵگەی بەکۆمەڵ بۆ عەرەب لە ناوچەکە

٥. رێگە بە هیچ کەسێك نەدرێت جگە لە زمانی عەرەبی زمانی دیکە بەکار بهێنێت[2].

ئەم پرۆژەیە دەکرێت بڵێین رای تەنها نوسەرێك یان راپۆرت نوسێك بوو لەسەر کورد، بەڵام کاتێك دەوڵەت، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانە، خاوەنەکەی بۆ ماوەیساڵێك دەیکات بە پارێزگاری جەزیرەو پاشان پلە بە پلە بەرز دەکرێتەوە تا پۆستی جێگری سەرۆك وەزیران دەڕوات، چیتر پرۆژەکە دەبێتە پرۆژەی دەوڵەت بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە سوریا.

یەکەم هەڵوێستی ئەسەد بەرامبەر بە کورد دەرکردنی بڕیاری ژمارە ٣٦ی ١٢ی ئۆگستۆسی ١٩٧١ بوو، کە بریتی بوو لە بە عەرەبکرنی ناوە کوردیەکان لە سوریا[3].

---

[1] محمد طالب هلال: المصدر السابق، ص٦٦

[2] جواد ملا: السياسة الاستعمارية السورية في غرب كوردستان، ص١٠٩-١١١

[3] لقضية الكوردية في كوردستان-سوريا خلال عهد الرئيس حافظ الاسد، ص١٧.

هەروەها دەستکرا بە بەجێهێنانی (پشتێنەی عەرەبی) ئەوە بوو ٤٤٣٨٦٠ دۆنمی کشتوکاڵی لە کورد سەندرا بۆ عەرەبو هەروەها ٤١ کۆمەڵگەی نیشتەجێ بونی لە ناوچە کوردیەکان بۆ عەرەب دروستکرد[1]. بەلآم بە تێپەربونی کات کورد رێگای خوێندنو کارکردنی پێ ئەدراو لە ناو سوپادا وەردەگیران. لە رووی سیاسیشەوە هەرچەندە پارتە کوردییەکان نافەرمی بوون، بەلآم قاچاخیش نەبوون چونکە شێوازی خەباتی پارتە کوردییەکان مەدەنی بوو، کە وایکردبوو مەترسی بۆ سەر کورسی دەسەلآتی سوریا نەبێت.

لە نەوەدەکاندا جوڵەیەکی جیاواز لە وانەی پێشوتر چ لە حکومەتو چ لە کوردی سوریا دەبینرا. لە مایۆی ١٩٩٠ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی سوریا ساز کرا بۆ جێگرتنی ٤٥٠ کورسی. ئەمەش وەك سیاسەتێکی دەوڵەت بوو بۆ ئەوەی خۆی وەك دەوڵەتێکی دیموکراسی دەربخاتو لە رۆژئاوا نزیك ببێتەوە. زۆرینەی کورسیەکان لە لایەن بەرەی نیشتمانی پێشکەوتووخواز پڕ کرایەوە کە بەعس سەرکردایەتی دەکرد. کوردەکان لە هەڵبژاردنەکەدا توانیان بەشداری بکەن[2]، پانزە کورد چوونە ناو پەرلمان کە چواریان سەر بە حزبی بەعس بونو ئەوانی تر سەربەخۆ بوون. شەش کەسیان لە عفرینو سێ ئەندامی تر لە جەزیرەو ئەوانی تر لە دیمەشق بوون. سێ کەس وەك سەربەخۆ، چونە ناو پەرلەمان[3]. هەرچەندە یاسایەك یان بریارێکی فەرمی بە قازانجی کورد لە پەرلەمانەوە دەرنەکرا، بەلآم بوونی کورد لە پەرلەمانی عەرەبی سوریاو قسەکردنیان لەسەر ئەم پرسە کاریگەری هەبووە بۆ کەمکردنەوەی سیاسەتی رەگەزپەرستی لەسەر کورد. بۆ رێگرتن لە بە ئەندامبوونی کوردە نەتەوەییەکان لە پەرلەمان، دەوڵەت لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٤ رێگای بەو کەسانەدا،

---

[1] المصدر نفسه: ص ٢٥.

[2] Ismet Chériff Vanly: The Kurds in Syria and Lebanon. op. cit. P133.

[3] Jordi Tejel: Syria's Kurds: history, politics and society, Routledge ,London and New York, 2009. P58. SYRIA, THE SILENCED KURDS, op.cit.القضية الكوردية في

كوردستان-سوريا خلال عهد الرئيس حافظ الاسد، ص٥٦.

کە خۆی پێشتر رەزامەندیی خۆکاندیدکردنی پێدابوو، بۆیە پرۆسەکە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی گۆرا بۆ دامەزراندنی پەرلەمانی[1].

لە نیوەی یەکەمی نەوەدەکان، زمان و کلتوری کوردی زۆر بەرونی لە رۆژئاوای کوردستان گەشەسەندنی بەخۆوە بینی، مۆسیقای کوردی بلاو بوو، ئاهەنگی نەورۆز بە ئاشکرا ئەنجام ئەدرا، منداڵ و شوێنکارەکان ناوی کوردییان لێدەنرا. بلاوکراوەی کوردی زیاتر بەردەستی خوێنەران دەکەوت[2].

بە مردنی ئەسەدو جێگرتنەوەی لە لایەن بەشاری کوری لە ساڵی ۲۰۰۰، توێژێکی سیاسی لاو چونە گۆرەپانی سیاسی سوریا، کە ئەم بارە نوێیە کوردی رۆژئاواشی گرتەوە ئەوە بوو، پارتی یەکێتی دامەزراو، دەسپێشخەر بوو لەوەی بە ئاشکرا لە سوریادا داوای خۆبەرێوەبردنی ناوچە کوردییەکانی دەکرد، زمانی کوردی بکرێتە زمانی فەرمی. لە روویەکی ترەوە[3]. لە سوریادا چالاکی سیاسی کورد قەدەغەکراو نەبوو بەلام بە فەرمی رێپێدراو نەبوو. دەوڵەت لە رێگای دادگاوە زۆر بە ئاسانی رێگری لە چالاکوانە کوردەکان دەگرت و چەندین دەقی یاسایی لەبەردەستدا بوو بۆ تۆمەتبارکردنیان لە گرنگترینیان کە کوردەکانی پێ تۆمەتبار دەکران، ئەم مادانەی خوارەوە بوون:

مادەی ۲٦۷: هەرکەسێك هەوڵبدات بۆ " کارێك یان وتاردان یان نوسین یان شێوازێکی وا کە پارچەیەك لە زەوی سوریا دابرێت و بیخاتە سەر دەوڵەتێکی بێگانە". مادەی ۲۸۵ "هەر کەسێك لە سەردەمی شەردا یان لە کاتی پێشبینی سەرهەڵدانی شەر، پروپاگەندە بکات بە مەبەستی لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتی و زیندوکردنەوەی دەنگی رەگەزپەرستی و مەزهەبی". مادەی ۲۸۸" هەر کەسێك پەیوەندی کرد بە "رێکخراوێکی سیاسی یان کۆمەلایەتی کە شێوازێکی نێودەوڵەتی هەبێت یان لەو شێوازە بێت مۆڵەتی حکومەتی نەبێت". مادەی ۳۰۷ " هەمو کارێك یان وتارێك، کە مەبەستی وروژاندنی دەنگی

---

[1] م. س. لازاریف و ئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل ۱٤۹-۱٥۰.

[2] Kerim Yildiz: The Kurds in Syria, op. cit. P119-120

[3] غاري كمبل: المصدر السابق.

رەگەزپەرستیو مەزهەبی بێت". مادەی ٣٠٨ " هەر کەسێك پەیوەندیی بە کۆمەڵەیەك بکات بەو ئامانجەی، کە لە مادەی پێشودا هاتووە". مادەی ٣٣٥ "هەر کەسێك لە " گردبونەوەیەکدا بەشدار بێت... تیایدا دروشمو سرودی گێرەشێوینی بەرز بکرێتەوە، یان بە شێوەیەك بێت لەگەڵ ئاسایشی گشتی ناکۆك بێت یان هەر جۆرە خۆپیشاندانێکی گێرەشێوێنی بێت". مادەی ٣٣٦ " (ا) هەر کۆبونەوەو رێورەسمێك لەسەر شەقامی گشتی یان شوێنی گردبونەوی جەماوەری بوو، وەك کۆبونەوەی گێرەشێوێنی دادەنرێت... (ب) ئەگەر لە لایەنی یەکەم لە حەوت کەس پێکهاتبوون بەمەبەستی نارەزایی لەسەر بریارێك یان فشار خستنە سەر رێوشوێنێك کە دەسەلاتەکانی گشتی گرتویەتیە بەر.(ج) ئەگەر ژمارەیان گەیشتبووە ٢٠ کەس بە شێوازێك دەرکەوتن، کە ئارامی گشتی بشێوێنێت". لە ناو ئەم دەقە یاسایانەی سەرەوەدا، ماددەی ٢٨٨ زۆرترین کوردی پێدادگایی کراوە، چونکە هیچ پارتێکی کوردی مۆڵەتی یاسایی لە حکومەتەوە پێ نەدراوە. لە بنەرەتیشدا یاسای پارتەکان تا ئێستا لە سوریادا نییە، بۆیە دەستگیرکردنو تۆمەتبارکردنی هەر کوردێك زۆر ئاسایی بەرێوە دەچێت"[1].

گرنگترین ئەو داوکاریانەی کورد لە سوریا داوای دەکات بریتین لە یەکەم: نەهێشتنی هەموو ئەو یاسایانەی کە کورد دەچەوسێنێتەوەو گێرانەوە ناسنامەو رەتکردنەو ئەنجامەکانی سەرژمێری دانیشتوانو دانپیادانانیان وەك دووەمین نەتەوە لە سوریاو نەهێشتنی شوێنەواری بەعەرەبکردن. دووم: داننان بە مافی چارەنوس بۆ کورد لە چوارچێوەی نیشتمانی سوریاو پێکەوە ژیانێکی ئاشتیانەو ئارەزوومەندانە لەگەڵ نەتەوە ئاینەکانی تر[2].

## دووەم-سیاسەتی دەرەکی سوریا بەرامبەر کێشەی کورد:

---

[1] Repression of Kurdish Political and Cultural Rights in Syria © 2009 Human Rights Watch. http://www.hrw.org

[2] لقضية الكوردية في كوردستان-سوريا خلال عهد الرئيس حافظ الاسد، ص٢-٣.

سیاسەتی دەرەکی سوریا بەرامبەر کێشەی کورد دابەشدەبێت بەسەر سیاسەتی ئەو دوڵەتە بەرامبەر پارتەکانی هەرێمی کوردستان[1]، لە لایەکو سیاسەتی سوریا بەرامبەر بە (پ.ک.ک)[2]. پەیوەندی نێوان (پ.ک.ک)و سوریا، پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بوو کە لە دوو هاوپەیمانی ستراتیجی یەکتر دەچوون. ئەم هاوپەیمانێتییە ململانێی هەردولا بەرامبەر تورکیا سەرچاوەی گرتبوو. (پ.ک.ک) لە پێناو بەدەسهێنانی مافی کورد شۆرشی چەکداری لە دژی تورکیا بەرپاکردبوو. سوریاش ناکۆکی قوڵی لەگەڵ تورکیا هەبوو بەهۆی کێشەی لیوای ئەسکەندەرۆنە (هاتای)و پرۆژەی گاپ[3] و مێژووی داگیرکاری تورکە عوسمانییەکان لە سوریا[4]. لە لایەکی تر لە ماوەی جەنگی ساردا سوریا ڕێکەوتنی هاورێیەتیو هاریکاری لە

---

[1] ئەم بابەتە لە تەوەرەی چوارەمی ئەم بەشەدا باس دەکرێت.

[2] Partiya Kareem Kurdistan کورتکراوەکەی (P.K.K)، لە٢٧ی نۆڤەمبەری١٩٧٨لە پارێزگای دیاربکر دامەزرا. ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بوو لەسنوری کوردستانی گەورەدا، پاشان لە نەوەدەکان بۆ فدراڵی باکوری کوردستان خەباتی دەکرد. لە ساڵی (١٩٨٤) یەکەم چالاکی پارتیزانییان بەئەنجام گەیاندووە. (پ.ک.ک) خاوەنی ١٠ هەزار گەریلاو ٣٧٥ هەزار ڕێکخستن بووە لەناو تورکیادا لە نەوەدەکان. زیانەکانی شەڕی تورکیا لەگەڵ (پ.ک.ک) لەنێوان ساڵانی(١٩٨٤-١٩٩٨) ٢٧ هەزار کوژراو ٨٤ ملیاردۆلاربووە.

The Workers' Party of Kurdistan (PKK) . Ministry of Foreign Affairs - Turkey .C:\MFA - IV_ Targets and Activities.htm

[3] پرۆژەیەکە لە بنەرەتدا دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٦ کاتێك (پرۆژەی کارەبای تورکیا) سەری هەڵدا، روپێوی هایدرۆلۆجی لە سەر ئاوی فورات دەستی پیکرد. ئەم پرۆژەیە بە بەنداوی کیبان لەسەر روباری فورات سۆو موراد سۆ کە لە ساڵی ١٩٧٤ تەواو بووە. گەورەترین بەنداویشی بەنداوی ئەتاتورك، کە لە ساڵی ١٩٩٠ تەواو بووە. ئەم پرۆژەیە لەگەڵ ئەوەی پلانێکی تورکیایە بۆ بەدەستهێنانی وزەی کارەباو پێشخستنی بواری کستوکاڵی، هاوکات بۆ گۆرانکاری دیمۆگرافیای کوردستانی باکوورە کە لەگەڵ پلانی دەوڵەتدا بگونجێت. ابراهیم خلیل العلاف: مشکلة المیاه والموارد المائة، ص ٢٦-٢٨.

[4] مایکل م. گونتر: العامل الکوردی فی السیاسة الخارجیة الترکیة، ص ٩٩-١٠٠.

٩ی ئۆکتۆبەری ساڵی١٩٨٠ لەگەڵ یەکێتی سۆڤییەت واژۆ کردبوو[١]، کە بەدوای خۆیدا (پ.ك.ك) لە پشگیری کردنی یەکێت سۆڤیەت بەهرەمەند کردبوو بۆ دژایەتیکردنی تورکیا، کە لایەنگری رۆژئاواو ئەمریکا بوو. سەرباری هەموو ئەمانە، ئەسەد دەیویست پێگەیەکی زاڵی لە ناوچەکەدا هەبێت، یەکێك لە لەمپەرەکانی ئەم سیاسەتەی تورکیا بوو، بۆیە (پ.ك.ك) لە دژی تورکیا وەك کارتی فشار بەکاردەهێنا. هەموو ئەم خاڵانە وایکردووە، کە ئۆجالان لەم بارەیەوە بڵێت: "ئێمە وەك هاوپەیمانێکی ستراتیجی سەیری سوریا دەکەین"[٢].

سوریا لە دەشتی بقاع[٣]، سەربازگەیەکی بۆ (پ.ك.ك) تەرخان کردبوون، کە ئەندامەکانیان خولی پەروەردەیی و مەشقی سەربازیان تیادا ئەنجام ئەدا. بۆ ئاگاداری کارەکانیان و چاودێریکردنیان، ئەسەد لە رێگای جەمیل ئەسەدی[٤]، برایەوە هێلێکی گەرمی

[١] ئەم رێکەوتنە لە ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠ لە نێوان ئەسەدو بریجنێف لە مۆسکۆ واژۆ کرابوو، ١٥ خاڵی لەخۆ گرتبوو، کە لە خاڵی یەکەمدا هاتبوو" هەردولا مکورن لسەر گەشەسەندنو چەسپاندنی پەیوەندی هاورێیەتیو هاریکاری نێوان دەولەتو گەلی هەردوولادا لە بواری سیاسیو ئابووریو سەربازیو زانستی تەکنیکیو رۆشنبیریو بوارەکانی تر". معاهدة الصداقة والتعاون بين اتحاد الجمهوريات السوفياتية الاشتراكية والجمهورية العربية السورية. http://www.moqatel.com/

[٢] يوسف إبراهيم الجهماني: أوج ألآن، تركيا والأكراد، دار حوران، دمشق، د.ط. ص ٦٧.

[٣] دەشتێکی بەپیت کشتوکاڵییە دەکەوێتە نێوان چیاکانی خۆرهەلاتو خۆرئاوای لوبنان، سوریا لە ساڵی ١٩٨٢ دەستی بەسەردا گرتبوو. گرنگترین پێگەی سەربازیو سیاسی سوریا بوو لە لوبنان. لە ساڵی ٢٠٠٥ سەرجەم سوپاکەی کشاندەوە. بقاع جێگای ململانێ سیاسیو سەربازییەکانی هێزە لوبنانیەکان بوو. هاوکات جێگای تیرۆرو تاوانکاری بوو. مارون حداد: البقاع خاصره سوريه الرخوه، http://www.aawsat.com/

[٤] جەمیل ئەسەد(١٩٣٣-٢٠٠٤) برای ناوەنجی حافز ئەسەدە، زۆر گرنگی بە سیاسەت نەداوە. لە ساڵی ١٩٧٣ بووە بە ئەندامی پەرلەمان. لە ساڵی ١٩٨١ کۆمەڵەی مورتەزای دامەزراندووە (جمعية المرتضى) کە کۆمەڵەیەکی مەزهەبی شیعە بووەو لە ناوچە سونییەکاندا چالاکیی نواندووە. لە کودەتا سەرنەکەوتووەکەی ١٩٨٤ی رەفعەت ئەسەد پشگیری رەفعەتی کردووە. بەهۆیەوە کۆمەڵەکەی داخراوە.

لە نێوان کۆشکی کۆماری سوریاو ئۆجالان دروستکردبوو[1]. هەرچەندە سوریا لە ناوخۆی وڵاتدا دژی مافە نەتەوەیی‌و سەرەتاییەکانی مرۆڤی کورد بوو بەڵام بێباك بوو لە یارمەتیدانی ئەم ڕێکخراوە کوردییە، چونکە بەهۆی ئەم پارتەوە وای کردبوو کە کوردی سوریا سەرقاڵی کێشەی کوردستانی باکور ببن‌و بەم هۆیەشەوە خۆی لە کێشەی کوردەکانی سوریا رزگار کردبوو[2]. هاوکات سوریا ترسی نەبوو لەوەی پرسی کورد لە تورکیا بەئەنجام بگات‌و کاریگەریی لەسەر رۆژئاوای کوردستان پەیدا بکات، چونکە لەوە دڵنیابوو، تورکیا لەبەرامبەر ئەم پرسەدا بەهیچ شێوەیەك سازش ناکات، هەموو ئەمانە وایان کرد سوریا پشتیوانی ئەم پارتە کوردیە بکات[3].

لەگەڵ ئەوەی سوریا سودی لە (پ.ك.ك) وەردەگرت، هەمانکات سوریا سودی زۆر بوو بۆ (پ.ك.ك). ئەم پارتە لە خەباتیدا، دەوڵەتی سوریای کردبوو بە چەتری چالاکی سیاسی‌و سەربازی خۆی لە دژی تورکیا. سوریا جگە لەوەی لە ساڵی ١٩٧٨ بەدواوە، نشینگەو دەوڵەتی پەنابەری ئۆجالان بوو، هاوکات سوریا ڕێگای بە ئۆجالان دا بوو، کە ئۆردوگایەك بەناوی سەربازگەی مەعسوم کورکماز[4]، لە ناوچەی بیقاعی لوبنانی بکات بە بنکەی

---

دواتر خەریکی کاری بازرگانی بووەو بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە باج‌و سەرانەی لە بازرگانەکانی سوریا لە دەرەوەی یاسا وەرگرتووە. من هو جميل الأسد ؟ http://syrianrevolution.org

[1] چاوپێکەوتن لەگەڵ محەمەد ئەمین پێنجوێنی: ٢٠١٠/٣/١١

[2] کریس کۆچێرا: بزوتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی، بەرگی دووەم، وەرگێرانی لەفارسییەوە: ئەکرەمی مهیرداد، سەنتەری چاپ‌و پەخشی نما، ٢٠٠٢. ل١٦٢.

[3] خليل علي مراد: العلاقات السورية التركية في ضوء أزمة أوج ألان، تشرين الاول، أوكتوبر، ١٩٩٨، مجلة (أوراق تركية معاصرة)، مركز الدراسات التركية – جامعة موصل، عدد ١٦، ٢٠٠١، ل ٧٢.

[4] سەربازگەی مەعسوم کورکماز گەورەترین سەربازگەی مەشق‌و راهێنانی پەروەردەیی (پ.ك.ك) بوولە دۆڵی بقاع بوو لەژێر سایەی سوریا. ناوی ئەم سەربازگەیە لە یەکێك لە سەرکردەکانی (پ.ك.ك) وەرگیرابوو کە لە چالاکییەکی دژ بە تورکیا گیانی لەدەست دابوو لە ساڵی ١٩٨٦. ئەم سەربازگەیە بە فەرمی لە ساڵی ١٩٩٢ بە پێی ڕێکەوتنی سوریاو تورکیا داخرا. مایکڵ گەنتەر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٦

سەرەکی خۆی. جگە لەمە (پ.ك.ك) سودی لە سوریا وەرگرت بۆ نزیکبونەوە لە یەکێتی سۆڤیەتو پەیوەندییەکانی نێوان (پ.ك.:ك)و یەکێتی سۆڤیەت بە هاندان یان لە رێگای سوریاوە بوو[١]. (پ.ك.ك) بە هۆی سوریاوە توانی خۆی رێکبخاتو کۆبونەوەو کۆنگرەی پارتەکەی لە سوریا ببەستێت. زیاتر لەمە، ئۆجالان هەندێك لە رۆژانی هەفتە، هاتوچۆی دیمەشقی دەکردو کاتەکانی لەوێ بەسەر دەبرد[٢].

(پ.ك.ك) چەند سودی لە سوریا وەردەگرت، زۆرتر لەوە سودی لە کوردی سوریا وەردەگرت. دەتوانین بڵێین ئەم پارتە چالاکیەکانی نیمچە فەرمی بوو. نوسینگەی لە شارەکانی جەزیرەو قامشلیو دیرەكو حەلەبو عفرین هەبوو، رێکخستنی لەناو جوتیاری دێهاتەکانو کرێکاری شارەکان دامەزراندبوو. توانی بووی رۆژئاوای کوردستان وەك بنکەیەکی مرۆییو سەربازی بەکاربهێنێت. هەندێك سەرچاوە ژمارەی کوردەکانی رۆژئاوای کوردستان کە لە خەباتی (پ.ك.ك) دژی تورکیا، گیانیان لە دەست داوە یان بێسەرو شوێنن بە ٧٠٠٠–١٠,٠٠٠ دەخەمڵێنن[٣]، هاوکات بەپێی سەرچاوەکانی هەواڵگری تورکیا لە ساڵی ١٩٩٨، رێژەی کوردی رۆژئاوا لە سوپای (پ.ك.ك) ٢٥ ٪ بووە. کورد لە سوریا بە گەرمی بەدەم بانگەشەی (پ.ك.ك) دەچون، چونکە لە لایەك سوریا چاوپۆشی لە خزمەتی سەربازی ئەو کوردانە دەکرد کە دەبونە گەریلا لە سوپای رزگاریخوازی گەلی کوردستان ARGK[٤]، لە لایەکی ترەوە، (پ.ك.ك) باسی لە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دەکرد، ئەمە لە کاتێکدا، پارتە کوردییەکانی سوریا داواکانیان لە چوارچێوەی مافی ئۆتۆنۆمیو رۆشنبیریدا سنوردار

---

[١] کریس کۆچێرا: بزوتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی. ل١٦١

[٢] مایکل م. گونتر: العامل الکوردی فی السیاسة الخارجیة الترکیة، ص ١٠٠.

[3] Jordi Tejel: op. cit. P 76

[٤] ئەم سوپایە باڵی سەربازی (پ.ك.ك) بوو لە کۆنگرەی سێیەمی ئەم پارتە دامەزرا لە ساڵی ١٩٨٦. لە دوای ساڵی ١٩٩٩ ناوەکەی گۆردرا بۆ هێزی پاراستنی گەل HPG. http://www.hezenparastin.com. غازی کمبل: المصدر السابق.

کردبوو[1]. هەموو ئەم کارانە (پ.ک.ک) بە تەواوەتی جێگای رەزامەندی سوریا نەبوو بەتایبەت رێگری دەکرد لەوەی کوردێکی سوریا بچێتە سەرکردایەتی (پ.ک.ک)، هەروەها ماوە ماوە، هەڵمەتی دەسگیرکردنی بۆ سەر ئەندامە چالاکەکانی کوردی سوریا لەناو ئەم پارتە دەستپێدەکرد، بۆیە (پ.ک.ک)، زۆرینەی ئەندامە بالاکانی رۆژئاوای کوردستانی رەوانەی دەرەوەی سوریا دەکرد، هەر ئەمەش بوو، کە زۆرینەی سەرکردەکانی (پ.ک.ک) لە ئەوروپا، کوردی رۆژئاوای کوردستان بوون[2].

بوونی (پ.ک.ک) لە سوریا بارێکی ئەرێنیو لە هەمان کاتدا بارێکی نەرێنی هەبوو. لە رووی ئەرێنییەوە (پ.ک.ک)و رێکخستنەکانی، یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی بەدەستهێنانی چەند کورسییەکی پەرلەمانی بوو بۆ کورد لە ساڵی١٩٩٠دا، کە بە ئاشکرا بانگەشەی بۆ کاندیدەکان دەکرد تا خەڵك دەنگیان پێبدات[3]. لە لایەکی ترەوە (پ.ک.ک) رۆڵی گرنگی بینی لە بەتینکردنی هەستی نەتەوایەتی لە سوریا. رەنگەکانی ئاڵای کوردی بوون بە رەنگی بۆنەو ئاهەنگە نەتەوەییو کۆمەڵایەتیەکان. هەروەها کرانەوەی سوریا بەرووی (پ.ک.ک) هەلێك بوو بۆ رۆشنبیرەکان رەخسا کە لە سایەیدا توانیان کۆمەڵێك رۆژنامەو گۆڤار دەربکەنو بە ئاشکرا شانازی بە کورد بوونی خۆیانەوە بکەن. لەوانە گۆڤاری گورزێك گوڵ(١٩٨٩-١٩٩٢)، زانین(١٩٩١-١٩٩٧)، ئاسۆ(١٩٩٢)، پێرس(١٩٩٣)، هەڤاڵ(١٩٩٣)، دیلاڤ( ١٩٩٥)، خوێندەڤان( ١٩٩٥). پارتو رەوتە سیاسیەکانیش رۆژنامەی نهێنیان دەرکرد لەوانە: ستێر(١٩٨٣-١٩٩٥) خوناڤ(١٩٨٦-١٩٩٥) رۆژ(١٩٩١) دەنگ(١٩٩٥)، نەورۆز (١٩٩٥). لەگەڵ ئەمانەشدا نوسەرە کوردەکان لە نەوەدەکاندا ١١١ کتێبیان بە چاپ گەیاند لە کاتێکدا لە حەفتاکان تەنها ئەمە، جگە لەوەی لە زانکۆی حەڵەبیش بڵاوکراوە نهێنیە کوردیەکان زۆر بوون[4].

---

1 Ismet Chériff Vanly: op. cit. P 78. 1 Jordi Tejel: op. cit. P 77-78.

٢ چاوپێکەوتن لەگەڵ محەمەد ئەمین پێنجوێنی: ٢٠١٠/٣/١١

3 Ismet Chériff Vanly: op. cit. P 133.

4 Jordi Tejel: op. cit. P 106-107.

دیوە نەرێنییەکەی (پ.ك.ك) لە رۆژئاوا ئەوە بوو، کە پێگەی سیاسی پارتە کوردیەکانی لاواز کرد، چونکە بە چالاکبوونی (پ.ك.ك) ئەندامانو جەماوەری ئەمانی کەمکردەوە. لە راستیشدا (پ.ك.ك) لە ناوخۆی سوریادا بەربەرەکانی دەکردنو نەك هەر ئەوە بەڵکو رێگریدەکردن کە لە کۆنگرە کوردیەکانی ئەوروپا بەشداری بکەن. لە هەموو ئەمانە گرنگتر پرسیاری رەچەڵەکی کورد بوو لە سوریا کە لە لایەن (پ.ك.ك) باسدەکراو گومانێکی گەورەی بۆ کوردی رۆژئاوای کوردستان دروست کردبوو بەوەی کە ئۆجالان دەیگووت کوردی سوریا زۆرینەیان سوری رەسەن نین[1].

ئۆجالان لەم بارەیەوە دەیووت: "زۆرینەی کوردی سوریا لە کوردستانی باکورەوە هاتون. هەندێك دەڵێن کوردستانی سوریا، ئەم وتەیە بابەتی نییەو چەمکێکی ورد نیە، راستر ئەوەیە بلێین کوردەکانی سوریا. ئەوانە لە دەستی زۆرداری عوسمانیەکانو کۆماری تورکیاو لە بەرئەنجامی بەشداریکردنیان لە راپەرینەکانی، کە لە کوردستان هەڵگیرساوە، هەڵهاتوون. من هەندێك توێژینەوەم کردووو بۆم دەرکەوتووە کە زۆرینەیان لە کوردستانی باکورەوە هاتون، هەندێکیان دەگەرێنەوە بۆ پێنج سەد ساڵو هەندێکی تریان پێش دووسەد ساڵ..... هیچ بوارێك نیە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە سوریا، بۆ نموونە ناتوانین دەوڵەتی کوردی لە عەفرین دامەزرێنین، لە بنەرەتیشدا کێشەی سوریا لەگەڵ کورد نییە بەڵکو لەگەڵ تورکیایە. بەرای من زۆینەی لایەنەکانی کێشەی کورد لە رێگای سوریاوە چارەسەر دەکرێن، ئەگەر هەر دەوڵەتێکی کوردی دامەزرا، ئەوا گەورەترین فدراڵی لە فراوانترین بەشی تورکیا دروست دەبێت، لەو کاتەدا ئەو هەرەشانەی، کە لە تورکیاوە بەرەو رووی سوریا دەبێتەوە، دەوستێت. ئەوەی سەیری کوردستانیش بکات، دەبینێت بەربەستێکە لە باکورەوە بۆ پاراستنی سوریا.....سەبارەت بە قەباری کوردی سوریا، ئەوا ٥٪ کەمترنو لە سەردەمی ئەیوبیەکانەوە لە باکوورەوە هاتوون. من پێیان ئەڵێم ئەگەر دەوڵەتیان دەوێت با روو بکەنە باکوور"[2].

---

[1] غازی کمبل: المصدر السابق.

[2] یوسف إبراهیم الجهمانی: المصدر السابق، ص ٦٦– ٦٧.

ئەم هەڵوێستەی ئۆجالان وایکردبوو پارتو رێکخراوە کوردییەکانی کوردستانی رۆژئاوا، روانینێکی خراپییان لە بەرامبەر چالاکی (پ.ک.ک) لە سوریا بۆ پەیدا ببێت. چونکە جگە لەوەی نیشانەی پرسیاری دانا بوو لەسەر بوونو مێژووی ئەوان، هاوکات شەرعیەتی کاری سیاسی تاوەکو کارێری رێکخراوەیی لە سوریا لێسەندبوونەوە. لە بەرامبەردا سوریا سودی گەورەی لەم بارودۆخە وەرگرتبوو یەکەم بەم هۆیەوە کۆنترۆڵکردنی رێکخراوە کوردییەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر کردبوو. دووەم کوردی سوریای بە قسەوباسی رەسەنایەتیو مێژوو، رۆڵیان لە سوریا سەرقاڵ کردبوو، سێیەم کوردی سەرگەردان کردبوو لە نێوان خەباتکردن لە پێناو باکور یان رۆژئاوای کوردستان[1].

لە کۆتایی ئەم تەوەرەیەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە ساڵانی نەوەدەکان بۆ رۆژئاوای کوردستان تێکەڵەیەك بووە لە خەباتی نەتەوەیی تایبەت بە رۆژئاوای کوردستانو خەباتی (پ.ک.ک) لە باکووری کوردستان. دەوڵەتی سوریا لە پێناو سود وەرگرتن لە (پ.ک.ک) لە ململانێی لەگەڵ تورکیادا چاوپۆشی لە چالاکیی ئەم رێکخراوە کردووە. بە دیوێکی تردا لەبەر ئەوەی (پ.ک.ک) رێکخراوێکی ناوچەیی بوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بۆیە کوردستانی رۆژئاوای سەرقاڵ کردبوو بە کێشەی کورد لە هەرێمی کوردستانو باکووری کوردستان. ئەمەش یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان بوو بۆ دانەبرانی کوردی سوریا لەگەڵ کوردی پارچەکانی تری کوردستاندا.

---

[1] عقيل سعيد محفوض:: المصدر السابق، ص٢٩٢-٢٩٣.

# تەوەری چوارەم

# پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو هەرێمی کوردستان

پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و سوریا بە دوو هێڵ بەیەك دەگەیشتن. هێڵی یەکەم بەرهەلستکارانی عێراقی بوو هێڵی دووەم خودی هەرێمەکە بوو وەك جوگرافیایەکی سیاسی. لەم تەوەرەیەدا باس لە هەریەك لەم دوو بابەتە دەکرێت.

یەکەم: پەیوەندی نێوان سوریاو بەرهەڵستکاران عێراقی

لە دوای کودەتای ساڵی ١٩٦٨ی بەعسیەکان لە عێراق، رۆژ لە دوای رۆژ حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی مەوداکانی ئازادی بەرتەسك دەکردەوە، ئەم بارودۆخە بە تەنها بۆ پارتە عێراقیە نابەعسیەکان نەبوو، بەڵکو بۆ ئەو رەوتە بەرهەڵسکاریەش بوو، کە بە باڵی چەپ لە ناو پارتەکەدا ناسرابوون. ئەم بارە نوێیە تەریب بوو بە تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو حزبی بەعس لە سەرەتای حەفتاکاندا، کە بەشێکی ئەو تێکچوونە پەیوەندیی بە دووکەرتبوونی حزبی بەعس هەبوو بەسەر سوریاو عێراقدا. لێرەوە ئەو بەعسییە عێراقیانەی کە لە ترسی دکتاتۆری رەوتی راسترەوی دەسەلآتدار هەڵدەهاتن، هاوکات ئەو کەسایەتیو پارتە نەتەوەییانەی عێراق، کە بواری کاکردنیان بۆ نەمابوو، سوریایان هەڵبژارد وەك دەوڵەتی پەناگە، سوریاش لای خۆیەوە پێشوازی لێدەکردن[1].

[1] علي الشمراني: صراع الاضداد المعارضة العراقية بعد حرب الخليج، دار الحكمة ،لندن، ٢٠٠٣، ص ٤٨-٤٩

لەگەڵ هەڵهاتنی عەرەبە نەتەوەییەکاندا، بەشێك لە سەرکردە کوردەکان هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە لە سوریا نیشتەجێ بوو بوون. لە دوای هەرەسی شۆرشی ئەیلول لە دیمەشقەوە گروپێك لەوانە بە سەرکردایەتی تاڵەبانی (ی.ن.ك)یان وەك پارتێکی کوردی عێراقی دامەزرا لە ٢٢ی مایۆی ١٩٧٥. ئیدی لێرەوە دەرگای دیمەشق بەرەو رووی پارتە کوردییە هەمە جۆرەکان کرایەوەو نوسینگەیان لە دیمەشق کردەوە. دوابەدوای ئەم باڵە سیاسیانەو دروست دوای یەکەمین جەنگی کەنداو لە ساڵی ١٩٨٠دا، پارتە ئیسلامیە شیعەکان، کە لە لایەن ئێران پشگیری دەکران، نوسینگەیان لە دیمەشق کردەوە. لەم سۆنگەیەوە دیمەشق تەنها نەبوو بە جێگای کۆکردنەوەی پارتە بەرهەڵستکارە عێراقییەکان، بەڵکو هەوڵی ئەدا کە رێکیان بخاتو بە ئاراستەی روخاندن یان دژایەتیکردنی عێراق جوڵەیان پێبکات. هەر لەم پێناوەشدا رۆڵێکی گرنگی بینی لە دروستکردنی بەرەیەك بە ناوی بەرەی جوقد "الجبهة الوطنية الديمقراطية الديمقراطية" لە ساڵی ١٩٨١[1].

ئەم هەولانەی سوریا لە یەکەمین جەنگی کەنداو ئامانجی خۆی نەپێکا، بەلاّم بالأدەستی سوریای بەسەر بەرهەڵستکارانی عێراقی سەپاند. ئەوە بوو لە دوای داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە لە ئۆگستۆسی ١٩٩٠، دووبارە سوریاو ئێران کەوتنە خۆ لەپێناوی سەپاندنی دەسەلاّتی خۆیان بەسەر بەرهەڵسکاراندا ئەمەش لە پێناوی دارشتنی عێراقی دوای سەددام حسێن بوو[2]. بەلاّم ئەم کارەی سوریاو ئێران هەروا ئاسان نەبوو، چونکە بەرهەڵسکارانی عێراقی بەسەر بیروباوەرو بۆچونی نەتەوەیی‌و مەزهەبی جیاواز دابەش بوو بوون، کە وایکردبوو هەر لایەنێك لە دوو بەرە لەشەردا بێت بەرەی یەکەمیان لە دژی رژێمی بەغداد، ئەویتریان لە دژی یەکتر، یان وەك نوسەرێك دەڵێت بەرهەڵسکاران هەمویان لەیەك سەنگەر بوون بەلاّم ئاراستەی لولەی تفەنگەکانیان جیاواز بوو[3].

---

[1] عزيز قادر الصمانجي: قطار المعارضة العراقية من بيروت ١٩٩١ الى بغداد، ٢٠٠٣، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠٩، ص٥١.

[2] علي الشمراني: المصدر السابق، ص ١٩٣

[3] عزيز قادر الصمانجي: قطار المعارضة العراقية ، ص٢٠٩-٢١٠

پێگەی سەرکردایەتی پارتە کوردیو شیعەکان لە ئێران بوو، بەڵام ئێران خاڵی کۆکەرەوەی بەرهەڵسکاران نەبوو ئەمەش بەهۆی جەنگی هەشت ساڵەی ئێرانو عێراق، کە وایکردبوو کە هەندێك لە بەرهەڵسکاران بە تایبەت عەرەبە نەتەوەییەکان، سوریا هەڵبژێرن لە بری ئێران وەك دەوڵەتی خانەخوێی کۆبونەوەکان. ئەوە بوو لە دیمەشقەوە لیژنەی کاری هاوبەش (لجنة العمل المشترك) لە ٢٧ی دیسەمبەری ١٩٩٠راگەیەنرا ، کە پێك هاتبوو لە حەڤدە پارتو لایەنی جیاوازی عێراقی، شەش پارتی کوردی بەشداریان کرد کە (ی.ن.ك)، (پ.د.ك)، پارتی گەلی کوردستان، (ح.س.ك)، حزبی زەحمەتکێشانی کوردستانو حزبی شیوعی کوردستان بوون. ئەم لیژنەیە ئەمیندارێتییەکی هەبوو کە پێنج لایەن سەرپەرشتییان دەکرد، ئەوانیش بریتی بوون لە بەرەی کوردستانیو حزبی بەعس (باڵی چەپ، کە نزیك بوون لە سوریا)و حزبی دەعوەی ئیسلامی[1] و (ئ.ب.ش.ئ.ع)و حزبی شیوعی عێراقی بوون. کاری لیژنەکە راستەوخۆ لە لایەن جێگری سەرك کۆماری سوریا عەبدولحەلیم خەدام[2]، سەرپەرشتی دەکرا، کە دەتوانین بڵێین ئەم کەسایەتییە فایلی بەرهەڵستکارانی عێراقی لەئەستۆ گرتبوو[3].

---

[1] ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٥٠ لە نەجەف لە سەر دەستی پیاوانی ئاینی شیعە بە سەرکردایەتی ئایەتوڵڵا موحسن ئەلحەکیم دامەزراوە. دواتر محەمەد باقر ئەلسەدر سەرکردایەتی ئەو پارتەی گرتە دەستو بوو بە پارتێکی جەماوەری لە باشوری عێراق. ئەم پارتە لەسەر دەستی بەعسیەکان لە دوای ساڵی ١٩٦٨ توشی داپڵۆسین بوونەوە لە ناویشیاندا محەمەد باقر ئەلسەدر، کە لە ساڵی ١٩٨٠ لە سێدارە درا. لیام ئەندەرسنو گاریس ستانسفیلد: ئایندەی عێراق، دکتاتۆری، دیموکراسی یان دابەشبوون، و: کامیار سابیرو دڵشاد حەمە، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٧. ل ل١٩٩-٢٠٤.

[2] لە ساڵی ١٩٣٢ لە بانیاس لەدایك بووە.دەرچوی کۆلیجی مافە لە دیمەشق. لە ساڵی ١٩٤٩ پەیوەندی بە حزبی بەعس کردووە. لە ساڵی چەندین پۆستی وەزارەتی وەرگرتووە. لە ساڵی ١٩٨٤ بووە بە جێگری سەرۆك کۆمار. ئەم کەسایەتییە بەرپرسی مەلەفی لوبنان بوو لە ساڵی ١٩٧٥-١٩٩٠و رۆڵی گرنگی بینیوە لە کۆتایی هێنان بە جەنگی ناوخۆی ئەو دەوڵەتە. خەدام لە ساڵی ٢٠٠٥ وەك نارەزاییەك لە سیاسەتی بەشار ئەسەد جیابونەوەی خۆی لە رژێمی سوریا راگەیاندو لە فەرەنسا نیشتەجێیە.
http://www.aljazeera.net

[3] علی الشمرانی: المصدر السابق، ص ص ١٩٢-١٩٣.

سوریاو ئێران وەك دوو دەوڵەتی ناوچەیی دەیانویست کۆنگرەکانی بەرهەڵستکاران بۆ خۆیان رام بکەن، بەڵام ئەم بارە جێگای نارەزایی سعودیە بوو وەك دەوڵەتێکی عەرەبی سوننە مەزهەبو هاوپەیمانی ئەمریکا لە ناوچەکەدا. بۆیە لەژێر فشاری سعودیەدا دوو لایەنی تر بۆ لیژنەکە زیاد کرا، کە بزوتنەوەی وفاقی نیشتمانی عێراقیو ئەنجومەنی عێراقی ئازاد بوو بۆیە لیژنەکە ناونرا لیژنەی (٥+٢)[1].ئینجا بۆ دروستکردنی بالآنسێك لە نێولان سوریاو ئێران لە لایەكو سعودیە لە لایەکی تر بریار درا، کۆنگرەی داهاتوو لە بەیروت بێت. ئەوە بوو بە پشگیری مادی سعودیەو بە پارێزگاری ئاسایشی سوریا لە بەیروت لە ١٠ی مارس ی ١٩٩١ کۆنگرەیەکی تر بەسترا، کە لیژنەی بالآی هاوبەش بە سەرپەرشتی سوریا بالآدەستی خۆی نواندو لە کۆتایدا بریار لەسەر پشتگیریکردنی راپەرینی عێراقو یەکریزی بەرهەڵسکارانی عێراقیو بەستنی کۆنگرەی تر کرا[2].

بۆ دورخستنەوەی ململانێ ناوچەییەکان لە بریارەکانی کۆنگرە، بەرهەڵسکاران بریاریاندا ڤییەنای پایتەختی نەمسا بکەنە سێیەمین وێستگەی کۆبونەوەکانیانو لە ١٦-١٩ی مایۆی ١٩٩٢، لەسەر ئەرکی ئەمریکا کۆنگرە بەسترا. گرفتی سەرەکی بەردەم کۆنگرەکە بریتی بوو لە مافی چارەی خۆنوسین، کە کورد پشگیری دەکردو عەرەبەکان بە تەواوی بیروبۆچونە جیاوازییەکانیانەوە نکۆڵیان لێدەکرد. ئەوە بوو تاڵەبانی وەك چارەسەرێکی ناوەند چەمکی (مافی چارەنوسی بەبێ جیابونەوە) بۆ گەلی کورد پێشنیار کردو هەموولا لەسەری رێکەوتن. ئەم خاڵە جێگای نارەزایی سوریاو نەتەوەییەکان بوو. بۆیە کاتێك کۆنگرەی سەلاحەدین لە هاوینەهەواری پیرمام لە هەرێمی تازە رزگارکراوی کوردستان، بە ناوی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی یەکگرتوو لە ٢٧-٣١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ بەسترا. ئەم کۆنگرەیە لە کاتێکدا بەسترا، کە ماوەیەکی کەم بوو ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان بریاری فدراڵی دابوو بۆیە دوای چەندین دانیشتنی زۆر، رایانگەیاند، کە کۆنگرە رێز لە ئیرادەی گەلی کورد دەگرێت و

---

[1] عزيز قادر الصمانجي: قطار المعارضة العراقية ، ص ص ٦٧-٧١

[2] الحرب على العراق، يوميات-وثائق-تقارير، ١٩٩٠-٢٠٠٥، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ٢٠٠٧، ص٤٩٤-٤٩٥

فدراڵیەتی بەستەوە بە رووخانی رژێمو دانانی دەستور کە یەکێتیی خاکو خەڵکو سەروەری عێراق بپارێزێت. هەرچەندە هێزە بەرهەڵستکارە کوردییەکان تەواو ئەم راگەیاندنەیان لا پەسەند نەبوو، چونکە هەوڵەکانیان لەو پێناوەدا بوو کە لەبری وشەی رێز (احترام) وشە بریارو دانپێدانان (یقر ویعترف) دابنرێت، بەلأم سەرکەوتوو نەبوون[1].

سوریا دەیزانی، کە کۆنگرەی سەلاحەدینو ڤیەننا بە پشگیری‌و بەشداری‌و رێکخستنی ئەمریکا بوو، ئەمە وەك سەرکەوتنی پرۆژەی پرۆژەی ئەمریکا وابوو بەسەر پرۆژەی سوریادا، بۆیە بانگهێشتی عەرەبە نەتەوەییەکانی کرد، کە بەشداری کۆنگرەی سەلاحەدین نەکەن، لێرەدا یانزە پارتی نەتەوەیی بایکۆتی کۆنگرەی سەلاحەدینیان کرد کە هەشت پارت لەوانە، بنکەی سەرەکیان لە دیمەشق بوو، هۆکاری ئەمەشیان گێرایەوە بۆ پرۆژەی فدرالی کە بە رای ئەوان عێراق دابەش دەکاتو خزمەتی پرۆژەی ئەمریکا لە عێراق دەکات[2]. دوای ئەم بایکۆتە، بە سەرپەرشتی سوریا لە دیمەشق، عەرەبە نەتەوەییەکان کۆبونەوەیەکیان لە ١٤-١٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ بەست. لە کۆتایدا بەیانێکیان دەرکرد بە بێ ئاماژەدان بۆ کۆنگرەی سەلاحەدینو بریارەکانی ئەو کۆنگرەیە. بەم هەڵوێستە بەرهەڵستکارانی عێراقی بوون بە دوو بەش، بەشی زۆرینە، کە بەشداربوانی کۆبونەوەی سەلاحەدین بوون، ئەمانە دەتوانین بڵێین، نوێنەرانی شیعەو کورد بوون. بەشی دووەم، کە کەمینە بوون نەتەوەییەکانو نوێنەرانی سوننە بوونو لە بەشداربوانی کۆبونەوەی دیمەشق بوو. سوریا لای خۆیەوە وەك نارەزاییەك بە رامبەر کۆنگرەی سەلاحەدینو وەك پشتگیرییەك بۆ کۆنگرەی دیمەشق، سنووری خۆی لەگەڵ هەرێمی کوردستان داخست[3].

---

[1] عزیز قادر الصمانچی: قطار المعارضة العراقیة ، ص١٢٠،ص ١٤١

[2] علی الشمرانی: المصدر السابق: ص ص ٢٦١-٢٦٢.

[3] عزیز قادر الصامانچی: قطار المعارضة العراقیة ص١٥١ص ١٥٧

ئەوەی جارێکی تر سوریای لە ناو گۆرەپانی بەرهەڵستکاران چالاککردەوە ، پرۆژەکەی مەلیك حسینی[١] ، پادشای ئەردەن بوو. مەلیك حسین لە ١٦ی سێپتەمبەری ١٩٩٥ پرۆژەی فدراڵی بۆ عێراق پێشنیار کرد کە عێراق سی هەرێمی فدراڵی کوردی سونی شیعە لەخۆ بگرێت. ئەم پرۆژیە سەرکەوتن بوو بۆ هەرێمی کوردستان، چونکە بۆ یەکەمجار پرۆژەی فدراڵی لە عێراق، پشگیری دەوڵەتێکی عەرەبی ناوچەیی وەك ئەردەنی بەدەستهێنا. بۆ ئەم مەبەستە مەلیك حسین ئامادەیی ماددیو مەعنەوەی خۆی پیشاندا بۆ ئەوەی بەرهەڵستکاران نوسینگەی خۆیان لە عەممان بکەنەوەو لەوێوە راوێژی خۆیان لەسەر ئەو پرسە بکەن[٢].

سوریا بە توندی دژایەتی ئەم پرۆژەیەی کرد، چونکە پێی وابوو ئەمە دورخستنەوەی سوریایە لە نەخشەی سیاسی عێراقو ناوچەکەو باڵادەستبونی هەژموونی ئەردەنو ئەمریکایە وەك دوو دەوڵەتی هاوپەیمانی لە داهاتووی عێراقدا. لە راستیشدا ئەمریکا رایگەیاند، کە " هەردوو سەرۆك (حسینو کلنتۆن) رێکەوتون لەسەر بەردەوام بوون لەسەر پشگیری بەرهەڵسکارانی عێراق لە ناوخۆدا"[٣]. هاوکات دەزگای هەواڵگری ئەمریکا (CIA)، پرۆژەی چالاکی سەربازیو کودەتای سەربازی لە بەهاری ١٩٩٥ بۆ روخانی رژێم هەبوو[٤]. هەروەها ئەم پێشنیارە هاوکاتی هەڵهاتنی ئامۆزای سەدام حسینو بەرپرسی گاردی کۆماری حسین کامل بوو لە ٩ی ئۆگستۆسی ١٩٩٥، کە ئەمریکا چاوەروانی زانیاریی

---

[١] لە ساڵی ١٩٣٥ لە عەممان لەدایك بووە. خوێندنی لە بریتانیا تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٥٢ بووە بە پادشای ئەردەن. بەوە ناسراو بوو کە دژی بزوتنەوە شۆرشگێرییە توندرەوەکانی عەرەب بوو. لە ساڵی ١٩٩٤ رێکەوتنامەی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل واژۆ کرد وەك دوومین دەوڵەت دوای میسر دانی بە ئیسرائیلدا نا. دوای مردنی خۆی مەلیك عەبدوڵای کوری جێگای گرتەوە. http://www.aljazeera.net

[٢] : أندرو كوكبورن و باتريك كوكبورن:صدام من تحت الرماد، ولادة صدام حسين من جديد، ترجمة :علي عباس، دار المنظر، بيروت، ٢٠٠٠. ص ص ٣١٠-٣١٨

[٣] عزيز قادر الصامانجي: قطار المعارضة العراقية ،ص ٢٢٧-٢٣٤،

[٤] للمزيد من معلومات انظر: كاظم حبيب: المأساة والمهزلة في العراق اليوم، الخراب السياسي والاقتصادي والاجتماعي في العراق، برلين، ١٩٩٨ ،ص ص١٢٥-١٢٨

چەکە کۆمەڵکوژییەکانی رژێمی بەغدادی لێدەکرد[1]، هەموو ئەمانە وایکرد ترسی سوریا لە ئایندەی ئەو هێزانەی داهاتووی عێراق دەگرنە دەست، هەبێت. ئەمە وایکرد سوریا چالاکییان لە سوریادا سنوردار بکاتو بلاوکراوەکانیان قەدەغە بکات[2].

بۆ سەرنەخستنی ئەم پرۆژەیەو بۆ ئاشتکردنەوەی بەرهەڵستکاران لەگەڵ سوریاو دورخستنەوەیان لە ئەردەن، دیمەشق جارێکی تر بوو بە وێستگەی بەرهەلستکارانو بە بەشداری ١١ پارتی ئیسلامیو کوردیو نەتەوەیی کۆنگرەیەك بەسترا لە ٢٣ی مارتی ١٩٩٦، کە دواتر بەیانێکیان دەرکرد، کە باسی فدراڵی بە هیچ شێوەیەك تیادا نەکرابوو[3].

هەرچەندە ئەردەن بە راگەیەندراوێك وەلامی سوریای دایەوە بەوەی کە کۆنگرەی بەرهەڵسکاران لە سوریا هیچ ئەنجامێك نابێت، چونکە بەرهەڵسکاران خۆشیان دەزانن، کە گۆڕان لە رێگای سوریاوە زۆر سنوردارە، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا خۆی لە ناکۆکیەکانی بەرهەڵستکاران بەدوورخستو لە ١٩ئەپریلی١٩٩٦ ئەوەی ئاشکرا کرد، کە "ئەردەن رازی نابێت خۆی بکاتە شوێنی ناکۆکی بەرهەلسکارانی عێراق"، لە لایەکیتر عێراق لە رێگای هەناردەکردنی نەوتەکەیەوە لە رێگای خاکی ئەردەنەوەو بە پێی بریاری ٩٨٦، توانی ئەردەن وا لێبکات دەستبەردای پرۆژەی فدراڵی ببێت، پەیوەندیەکانی نێوان عێراقو ئەردەن بەرەو باش بوون بچێت.

بەرهەڵستکارانی عێراقی چالاکیان لە دۆخی وەستاندا بوو تا ئەو کاتەی کۆنگرێسی ئەمریکا بریاری روخاندنی رژێمی بەغدادی دا. دوای ئەمە لە ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٩ لە شاری

---

[1] فەریقی یەکەم حسین کامل کوری ئامۆزای سەدام حسین بوو، هەروەها لەگەڵ براکەیدا سەدام کامل، زاوای سەدام حسین بوون، بەرەو ئەردەن هەڵهاتنو بانگەشەی ئەوەیان کرد، کە هەڵگری زانیاری وردن لەسەر چەکی کۆمەڵکوژی لە عێراق، بەلام کاتێك دەرکەوت کە زانیاریەکان سەرەتاینو بۆیە جێگای گرنگیپێدانی جیهانی دەرەوە نەبوو، ئەمە وایکرد بریاری گەرانەوە بۆ عێراق بداتوو دواتر لە ٢٤ی فەبرایری ١٩٩٦ لە لایەن بنەماڵەی سەدام حسینەوە کوژران. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: أندرو کوکبورن و باتریك کوکبورن:المصدر السابق: ص ص٣٢١-٣٤٦.

[2] منذر الموصلي: القضیة الکردیة في العراق البعث والاکراد، دار المختار، دمشق، ٢٠٠٠، ص ٣٦٠.

[3] عزیز قادر الصامانچي: قطار المعارضة العراقیة، ص ٢٣٦.

نیۆرك بە پشتیوانی ئەمریکا کۆنگرەی نویٚ بەستراو پرۆژەی فیدراڵی دیموکراتی بۆ داهاتوی عێراق گەلاڵە بوو. هەڵوێستی سوریا بێدەنگی بوو لە ئاست ئەو کۆنگرەیە چونکە بە ئاشکرا ئەمریکا پشگیری دەکردو هێزە هەوادارەکانی خۆی سەرپشك کرد لە بەشداری یان بەشداری نەکردن لەو کۆنگرەیە. دوای پێنج رۆژ لە تەواوبونی کۆنگرەکە، بەرهەڵستکاران بە تایبەت (ی.ن.ك)و ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی عێراق، شاندێکیان پێکهێناو پەیوەندییان بە سوریاو ئێران کرد بۆ رەوینەوەی ترسی ئەو دوو دەوڵەتە لەو پرۆژەیە[1].

دەتوانین بلێین رۆڵی سوریا لەسەر ئۆپۆزسیۆن تا ساڵی ١٩٩٩گەورە بوو، بەلاّم چەند هۆکارێك رۆڵەکەی بچوك کردەوە، لەوانە: رێکەوتنی واشنتنی نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)، کە دەستێوەردانی ناوچەیی لە هەرێمی کوردستان کەم کردەوە. دووەم: سەرپەرشتی کردنی بەرهەڵستکارانی عێراقی لە لایەن ئەمریکاوەو دەرهێنانی ئەو کارتە لە دەست سوریا. سێیەم: مردنی ئەسەد بوو کە وەك کاریزما بوو لە رۆژهەلاّتی ناوەراست کە بەشاری کوری نەیتوانی ئەو رۆڵە بگێرێت. دواخاڵ و گرنگترینیان بریتی بوو لە بیٚ هیوابونی سوریا لە بەرهەڵستکاران بە تایبەت دوای بەرزکردنەوەی دروشمی فدراڵیو دیموکراتی بۆ عێراق. بۆیە دەبینین لە کۆنگرەکانی داهاتوی بەرهەڵستکاران لە لە ندەن لە ١٤-١٧ی دیسەمبەری ٢٠٠١، لە سەلاحەدین ٨ی سێپتەمبەری ٢٠٠٢ ، سوریا لە هاوکێشەکاندا بوونو رۆڵی بەرچاوی نەبوو.

دووەم: پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ هەرێمەکەدا

پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو هەرێمی کوردستان لە دووەمین جەنگی کەنداوەوە سەرچاوەی گرت، کە سوریا لە میانەی ئەم جەنگەدا سەرپەرشتی لیژنەی کاری هاوبەشی دەکرد، کاتێك، کە راپەرین سەری هەڵداو بە دوایدا کۆرەو دەستی پێکرد، هێزە کوردییەکان بە بیٚ گەرانەوە بۆ لیژنەی کاری هاوبەش، کە ئامانجی رووخانی رژێمی سەدام بوو، لەگەڵ ئەو رژێمە هێزە کوردییەکان کەوتنە گفتوگۆ، کە ئەمەش پێچەوانەی ئامانجی لیژنەی کاری

---

[1] الانصات المركزي، ١٩٩٩/١١/٢٢

هاوبەش بوو کە لە پێناویدا دامەزرا بوو. بۆیە ئەم لیژنەیە لە ٣ی یۆلیۆی ١٩٩١ بە سەرپەرشتی سوریا داوای راگرتنی دانوستانەکانی کرد[١].

بە شکستی گفتوگۆکانی نێوان کوردو بەغداد، سەرکردایەتیی کورد نامەی ئاراستەی لیژنەی کاری هاوبەش کرد بۆ بەستنی کۆنگرە لە هەرێمی کوردستانی تازە[٢]. هاوکات لە سەر داوای سوریا شاندێکی بەرەی کوردستانی گەیشتە سوریا. ئامانجی ئەم شاندە کردنەوە رێگای بازرگانی نێوان هەرێمو سوریا بوو هەروەها بانگهێشتکردنی بەرهەڵستکاران بۆ بەستنی کۆنگرە لە هەرێمی کوردستان، بە مەرجی ئەوەی کۆنگرە پشگیری داواکانی کورد بکاتو هەڵوێستی روونو ئاشکرا بێت لە ئاستی داخوازیەکانی کورددا بێت[٣].

دوای کۆبونەوەکانی بەیروتو ڤیەنا، بەرهەڵستکاران کۆبونەوەیەکی گرنگیان لە خاکی هەرێمی کوردستاندا بەست کە هاودەمی راگەیاندنی فدراڵی بوو لە لایەن پەرلەمانی کوردستان. ئەوەبوو بیری فدراڵیزم باڵی بەسەر کۆنگرەکەدا کێشا، کە ئەمەش پێچەوانەی پرۆژەی سوریو لیژنەی کاری هاوبەش بوو، کە دەیویست وەك نەتەوەیەك لە سنوری عێراقو لە چوارچێوەی بەیاننامەی ١١مارتی ١٩٧٠، مامەڵە لەگەڵ کورددا بکات ، نەك وەك هەرێمێکی جوگرافی فدراڵی بە ناوی کوردستانو لە دەرەوەی دەسەڵاتی بەغداد. چونکە پێشبینی لیژنەی کاری هاوبەش بۆ داهاتوی عێراق لەو کاتەدا بە شێوەیەك بوو کە رژێمی عێراق لە میانی ئەو جەنگەدا دەروخێتو دوا بەدوای ئەوە رژێمێکی نوێ دادەمەزرێت، کە کورد تیایدا بە پێی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ مافی ئۆتۆنۆمی پیادە دەکەن. سەبارەت بە پرسی کورد لە بەیانی لیژنەی هاوبەشداو لە خاڵی چوارەم لە داواکارییەکان هاتبوو کە "جیاوازی رەگوزی نەمێنێت، لابردنی پاشماوەی سیاسیو دیمۆگرافییای دانیشتوانی ناوچەی کوردستانی عێراق کە بۆ گۆرینی پێکهاتەی نەتەوەیو مێژووی کوردستان درابوو. هەروەها چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە شێوەیەکی دادپەروەرانە، مافی نەتەوەیو

---

[١] الحرب على العراق، ٤٦٧.

[٢] حامد شريف الحمداني: المصدر السابق، ص ص ٢٢٨-٢٢٩

[٣] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٢)، ١٩٩٢/١/٢٧.

سیاسی رەوای خۆیان پێبدرێت لە چوارچێوەی جێبەجێکردنو گەشەپێدانی بەندەکانی رێکەوتنامەی ئازاری ۱۹۷۰، کە گەلی عێراق پەسەندی کردووە لە سنوری یەکێتی عێراقدا"[1].

ئەوەی روویدا ئەوە بوو، کە رژێمی بەغداد مایەوەو کورد سەربەخۆ فدراڵیەتی لە هەرێمێکی جوگرافیی تایبەت بە خۆی راگەیاند، ئەمەش لە دەرەوەی پێشبینی سوریادا بوو. لە لایەکی تر خودی کۆبونەوەکە لە هەرێمەکەدا، کە ئەمریکا پاسەوانی ئاسمانەکەی دەکرد بۆ سورییەکان جێگای نیگەرانو مەترسی بوو. بۆیە خاڵی جیاوازیی نێوان کوردو سوریا لێرەوە دەستی پێکرد.

هەرچەندە بارزانی لە کۆتایی ئۆگستۆسی ۱۹۹۲ سەردانی دیمەشقی کرد[2]، هەروەها تاڵەبانی لە ناوەراستی فەبرایری ۱۹۹۲ چووە سوریاو راگەیاند: "نامەیەکی نوسراو زارەکی، لە بارزانییەوە بۆ ئەسەد هێناوە بۆ ئەوەی ساردی نێوانمان نەمێنێت "[3]. ئەم لێدوانەی تاڵەبانی بە ئاشکرا دەرخەری ساردی پەیوەندییەکانی هەرێمە. دواتر لە لێدوانێکی تردا تاڵەبانی هۆی ساردی نێوان سوریای گێرایەوە بۆ کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆن، کە لە پێکهاتەی سەرۆکایەتیو ئەنجومەنی راپەراندن نارازی بوون بە تایبەت نەبونی قەومیەکان لە ئەنجومەنی راپەراندندا[4]. بە پێی ژمارەکانی کوردستانی نوێ لە ۱۹ی فەبرایری ۱۹۹۳-٤ی مارتی ۱۹۹۳ خەدامو تاڵەبانی شەش جار کۆبونەوەیان کردووە. تەوەری سەرەکی گفتوگۆکانیش، پەیداکردنی تێگەیشتنێك بووە لە نێوان دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانو سوریا، هەروەها داواکاری هەرێمی کوردستان بووە بۆ کردنەوەی سنور لەگەڵ سوریا. بۆ هەمان مەبەست شاندێکی (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)، کە حەسەن کوێستانیو فازل میرانی نوێنەرایەتییان کردووە لەسەر سنوری سوریا لەگەڵ عەمید محەمەد مەنسور، بە مەبەستی

---

[1] حامد شريف الحمداني: المصدر السابق، ص ٢٠٠-٢٠١

[2] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (۱۷٥). ۲٦/ ۸/۱۹۹۲.

[3] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (۳۱۹). ۱٦/۲/ ۱۹۹۳

[4] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(۳۲۲). ۱۹/۲/۱۹۹۳

پرسی هاتوچۆی بازرگانی نێوان هەردولا کۆبوونەوە[1]، بەلام دەتوانین بڵێین، تا سەرەتای ساڵی ١٩٩٦ سنوری نێوان سوریاو هەرێمی کوردستان بارێکی ئاسایی کرانەوەی بخۆوە نەبینی.

پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ (پ.د.ك) لەژێر کاریگەریی روداوە مێژووییەکاندا بوو. کە بۆ شۆرشی ئەیلول دەگەرایەوە کاتێك (پ.د.ك) سەرکردایەتی ئەو شۆرشەی لە ساڵانی (١٩٦١-١٩٧٥)کرد. لە سەرەتادا ئەم پەیوەندیانە لە بارێکی ئاڵۆزدا بوو، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ پەرەسەندنی بیری نەتەوەیی توندرەوەی عەرەبی لە سوریا، کە وەك داردەستی بێگانە لە بزوتنەوەی کوردی دەروانیو چالاکبوونی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی لە عێراق وەك هەرەشەیەك بۆ سەر سوریای دادەنا، ئەویش بەهۆی بونی ژمارەیەکی بەرچاوی کورد لە سوریادا. لە راستیشدا کارلێکی نەتەوایەتی کوردی لە نێوان سوریاو عێراق، کاریگەر بوو. هۆکاری ئەو کارلێکە خێرایە، جگە لەوەی پەیوەندیی بە هەلومەرجی سیاسی ئەوکاتەوە بووە، هاوکات باری تێکەلاوی کۆمەلایەتیو خێڵەکی کورد لەسەر سنورەکان هۆکارێکی گەورەی کارتێکردنو تێکەڵبونی کێشەی کوردە لەهەردوو بەری عێراقو سوریادا. میرانو حەسەنانلی کە دوو خێڵی شوانکارەنو بازرگانی مەرومالات لە نێوان سێ سنوری (عێراق-سوریا-تورکیا) دەکەن، هۆکارێکی گرنگی تێکەڵبونی کوردی ئەو سێ دەوڵەتەن[2].

لە ژێر تینوتاوی (پ.د.ك) لە عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستان ناسراو بە (پارتی) لە سوریا لە ١٤ی مایۆی ١٩٥٧ دامەزرا[3]، هەروەها لە ئەنجامی کەرتبوونی (پ.د.ك) لە ساڵی ١٩٦٤لە عێراق ،بە دوای خۆیدا لە ئۆگستۆسی ١٩٦٥، کەرتبوونی (پارتی) لە سوریا گرتەوە، دواتریش لە بەرئەنجامی یەکبوونی (پ.د.ك) لە عێراق، لە ساڵی ١٩٧٠) بە دوایدا (پارتی) کۆنفرانسی یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە لە باشووری کوردستان دەکات. سوریا بۆ رێگرتن

---

[1] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(٤٤٥) ١٩٩٣/٧/٢٦

[2] عمار شريف كاظم العظماوي : المصدر السابق، ص٤٢.

[3] علي صالح ميراني: المصدر السابق، ص ٤٤.

لە شالاّوی بیری کوردایەتی، بە تایبەت لە دوای سەرهەڵدانی شۆرشی ١٤ی یۆلیۆی ١٩٥٨ لە عێراق، کاری پارتایەتی لە ناوخۆی سوریادا لە کورد قەدەغە کرد، بۆیە (پارتی) دەستی کرد بە کاری نهێنی[1]. هەر لەم خاڵەدا نەوەستا، بەلکو لە دوای کودەتای ٨ی فەبرایری ١٩٦٣ لەسەر دەستی نەتەوەیی‌و بەعسییە توندرەوەکان لە عێراق، هاوکات لە سوریا هەمان، لە ٨ی مارتی ١٩٦٣ رەوت کودەتایان کرد ، بۆیە لە کاتێك عێراق پلانی دیجلەی دانا بۆ گەلەکۆمێ لە شۆرشی ئەیلول، سوریا هێزێکی سەربازی نارده عێراق بە مەبەستی هاریکاری سوپای عێراق لە سەرکوتکردنی شۆرشی کورد[2]. لە ناوخۆشدا پرۆژەی محەمەد تەلەب هیلال بۆ تواندنەوەی کورد لە ناو نەتەوەی عەرەب لە سوریا، گرنگترین بەهانەی ئەوە بوو، کە (پ.د.ك) لە باشوری کوردستانەوە لە رێگای کورد لە سوریا، پلان دژی سوریاو نەتەوەی عەرەب دادەرێژن[3].

دەتوانین بڵێین پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ (پ.د.ك) لە میانەی شۆرشی ئەیلول، پەیوەندییەکی باش نەبووەو بەم شێوازەش مایەوە تا کۆتایی حەفتاکان. لە دوای سەرهەڵدانی شۆرشی گەلانی ئێران، ئیدریس بارزانی لە ساڵی ١٩٧٩ سەردانی دیمەشقی کردو مۆڵەتی کردنەوەی نوسینگەی لە سوریا وەرگرت. ئەمەش وەك کرانەوەی سوریا بوو بە رووی (پ.د.ك). چەند هۆکارێك لەپشت ئەم کرانەوەیە بوو، لە گرنگترینیان تێکچونی پەیوەندییەکانی نێوان عێراق‌و سوریا بوو لەسەر سەرکردایەتیکردنی نیشتمانی عەرەبی. ئەوە بوو سوریا دەیویست سود لە نەیارەکانی عێراق وەربگرێت بۆ لاوازکردنی ئەو دەوڵەتە. هاوکات (پ.د.ك) بە سەرهەڵدانی شۆرشی ئیسلامی ئێران، سانسۆری چالاکی لەسەر لاچوو کە محەمەد رەزا شای ئێران بەهۆی رێکەوتنامەی جەزائیر لە ساڵی ١٩٧٥دا بەسەریدا سەپاندبوون، بۆیە بە نەمانی رژێمی شاهانە لە ئێران، (پ.د.ك) ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ

---

[1] لازاریف‌و ئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل. ١٢٨-١٣٠

[2] علي كريم سعيد: عراق ٨ی شباط١٩٦٣- من حوار المفاهيم الى حوار الدم، مراجعات في ذاكرة طالب شبيب، دمشق، ١٩٩٩، ل٢٥٧-٢٥٨.

[3] انظر الملحقات للكاتب: محمد طلب هلال، مصدر سابق، ص١١٣-١٤٧

ئاسایی کدرنەوەی پەیوەندی لەگەڵ سوریا. دواجار سوریا ئەوەی دەزانی، کە (پ.د.ك) پارتێکی جەماوەری بەرفراوانە نەك لە باشووری کوردستان، بەڵکو لەناو کوردی ناوخۆی سوریاشدا پێگەو سەنگی تایبەتی هەیە، بەجۆرێك وێنەی مستەفا بارزانی لە چەندین ماڵی سوریادا هەڵدەواسرا. هەروەها پشتگیریکردنی سوریا بۆ (پ.د.ك) لە هەموو پارتێکی کوردی باشوری کوردستان باشتر بوو، چونکە ناوچەی هەژمونی (پ.د.ك) لە باشوری کوردستان هاو سنووری سوریا بوو[1]. هەر لەم خاڵەوە دەتوانین ئەو راستییەمان بۆ روون بێتەوە، کە یەکێك لەو هۆکارانەی کە سوریا پشگیری (بەرەی نیشتمانی نەتەوەیی دیموکراتی) ناسراو بە (جوقد)ی کرد لە ساڵی ١٩٨١، گرنگی بە(بەرەی نیشتمانی دیموکراتی) ناسراو بە بەرەی (جود) نەدا ، بەشداری (پ.د.ك) بوو لە بەرەی یەکەمدا[2].

پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ (پ.د.ك) لە دوای دروستبوونی حومەتی هەرێم جارێکی تر کەوتەوە گرژیو ئاڵۆزی بە رێژەیەك سنوری سوریا لەگەڵ هەرێمی کوردستان لە ساڵی (١٩٩٢-١٩٩٦) داخرا بوو. ئەم بارە نوێیە دەگەرێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانە راگەیاندنی فدراڵی لە لایەن هەرێمی کوردستان، هەروەها ئەم پارتە لە نەوەدەکان بەدواوە لەدەرەوەی سیاسەتی سوریاو لە بازنەی سیاسەتی تورکیا بوو لە ناوچەکەدا، لە لایەکی تر (پ.د.ك) نەیاری (پ.ك.ك) بوو، کە سوریا پشتیوانی لێدەکرد. ئەم ئاڵۆزییە لە پەیوەندییەکان، کاریگەرییەکەی بەرچاوی بەسەر (پ.د.ك) هەبوو، چونکە ناوچەی دەسەڵاتی (پ.د.ك) بەریەککەوتنی سنوریی لەگەڵ سوریادا هەبوو، ئەمە وایدەکرد، ئاڵۆزیی لە پەیوەندییەکان نەك بە تەنها کاریگەریی سیاسی بەڵکو کاریگەری ئابووریو کۆمەڵایەتیشی بەسەر دەسەڵاتی (پ.د.ك) هەبێت. لەم بارەیەوە بارزانی لە وەڵامی رۆژنامەی (السفیر) لوبنانی هەڵوێستی سوریا بەرامبەر هەرێمی کوردستان بە نیمچە نەرێنی (شبه سلبي) باس دەکات. هەروەها دەڵێت: ئێمە پەیوەندیەکانمان لە گەڵ سوریادا پەیوەندییەکی برایەتیو هاورێیەتییە...... لە

[1] Jordi Tejel: op. cit. P72

[2] لازاریڤو ئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٦.

روی سیاسیەوە رەخنە لە هەڵوێستی سوریا دەگرین، ئێمە چاوەڕێی ئەوەمان لە سوریا دەکرد کە بچێتە ناوەرۆکی بابەتەکان نەك دورەپەرێز خۆی رابگرێت"[1].

سوریا لە سالآنی (١٩٩٢-١٩٩٤) هەڵوێستی دورە پەرێزی لە بەرامبەر هەرێمی کوردستان پیادە کرد بە بێ دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی هەرێمەکە. بەلآم ئەوەی سوریای دوبارە لە هەرێمی کوردستان نزیکردەوە شەری نێوان (پ.ك.ك)و (پ.د.ك)بوو لە ساڵی ١٩٩٥. خواستی سوریا لە هەرێمی کوردستان ئەوە بوو، (پ.ك.ك) لە هەرێمەکەدا بە هێز بێت تا بەر بە فراوانخوازیو هەژموونی تورکیا لە ناوچەکەدا بگرێت. هەر ئەم خاڵە وا دەکات، کاتێك، کە شەری نێوان (پ.ك.ك)و (پ.د.ك) بەتین تر بوو، ئەسەد بانگهێشتنامەیەکی پێشکەشی (پ.د.ك) دەکات لە ٢٥ی ئەپریلی ١٩٩٦، بارزانی لە وەلآمی ئەم بانگهێشتەدا سەردانی سوریای کرد. لەو سەردانەدا چاوی بە ئەسەد کەوتو گرنگترین تەوەرەکانی گفتوگۆکەش بریتی بوو لە ئاسایی کردنەوی پەیوەندیەکانو کردنەوەی سنوری نێوان هەردولاو هەر لە میانەی سەردانەکەدا بە فەرمان ئەسەد سنوری نێوان هەردولا کرایەوە. بارزانی لە سوریا چاوی کەوتبوو بە سیاسیو ناودارە کوردەکانی سوریاو لە ناویشیاندا سکرتێری پارتە کوردییەکان. لە گەرانەوەیدا لە شاری قامشلی گوتارێکی دا لە ناو جەماوەرێکی بەرفراوانی ئەو شارە، کە ئەوە یەکەم جار بوو سەرکردەیەکی باشور لە سوریاو لە ناوچە کوردییەکان ئەو چالاکییە بکات[2]. دوا بەدوای ئەو سەردانە ئەندامی مەکتەبی سیاسی (پ.د.ك)و سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان بە هەمان رێگەدا لە ئەوروپاوە گەرایەوە کوردستانو رایگەیان یەکجارە دەوڵەتێکی ناوچەیی لە ئاستی بەرزدا پێشوازیان لێکردبێت. هەر لەو سەردانەدا جەوهەر نامق[3]، لە قامشلی لەگەڵ سەرکردە کوردییەکانی سوریا دانیشتبون[1].

---

[1] جریدة "السفیر" ١٩٨٤/٨/٢

[2] رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ( ٢١٦٦) ٢٦/٤/ ١٩٩٦. (٢١٦٨)، ١٩٩٦/٥/١٥.

[3] جەوهەر نامق (١٩٤٦-٢٠١١) لە قەزای کەلار لەدایك بووە. خاوەنی بروانامەی بەکالوریوس بووە لە زانستی ئابوری لە زانکۆی موستەنسرییە لە بەغداد. ئەندامی (پ.د.ك) بووە. لە ساڵی (١٩٧٥-

دوای ئەم سەردانە پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو (پ.د.ك) چووە باری ئاسایی بوونەوەو کێشەی فدراڵیو بەرهەڵستکارانی تێپەراند، چونکە بە بەرپا بوونی جەنگی ناوخۆ لە هەرێمی کوردستان، سوریا ترسی دابەشبونی عێراقی نەما بوو. هەروەها بەرهەڵستکارانی عێراقی لە ماوەی شەش ساڵی کاری هاوبەشدا (١٩٩٠-١٩٩٦) نەیانتوانی ببنە هەرەشەی مەترسیدار بۆ عێراق، بۆیە سوریا لە پشتگیریکردنیان ساردی پێوە دیار بوو لە بەرامبەریشدا پەیوەندییەکانی سوریاو عێراق گەرموگوریی بەخۆوە بینی بوو. لە لایەکی ترەوە یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی ئەم سەردانە بریتی بوو لە بەرقەراربونی ئاشتی لە نێوان (پ.د.ك)و (پ.ك.ك). بەڕای ئەسەد بە رێکەوتنی نێوان ئەم دوو لایەنە تورکیا بەهانەی لەشکرکێشی لە هەرێمی کوردستان لەدەستدا.

هەوڵەکانی ئەسەد بۆ ئاسیکردنەوی پەیوەندییەکانی نێوان (پ.د.ك)و (پ.ك.ك) شکستی هێنا، ئەمەش دوای ئەوەی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٧ شەری نێوان ئەو دوو لایەنەی پێشوو دەستی پێکردەوە. هاوکات، شەری ناو بە ناوی نێوان (پ.د.ك) و (پ.ك.ك) کاریگەری هەبوو لەسەر کەمکردنەوەی جەماوەری (پ.د.ك)و سەرکردایەتیی بارزانی لە ناو خێڵە کوردییەکانی کوردستانی رۆژئاواو هەندێکیش لە خێڵەکان بە تەواوی لە (پ.د.ك) هەڵگەرانەوەوپشگیری (پ.ك.ك) یان کرد، لەوانە خێڵی میران. خێڵی حەسەنانلیش وەك چۆن بەسەر تورکیاو سوریاو عێراق دابەش بوون ئاوهاش لایەنگریان بۆ (پ.د.ك)و (پ.ك.ك) دابەش بوو[٢]. بە دیوێکی تریشدا پەیوەندیەکانی سوریا لەگەڵ (ی.ن.ك) بەرەو باشی دەرۆیشت.

مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو (ی.ن.ك) تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، ئەم تایبەتمەندییەش بریتییە لەوەی کە (ی.ن.ك) بۆ یەکەمجار لە سوریا پێکهاتو هەر لەوێوە

---

١٩٧٩) بەرپرسی ناوچەی بادینان بووە. لە ساڵی (١٩٩٢-١٩٩٩) سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان بووە. لە ساڵی (١٩٩٩-٢٠٠٣) سکرتێری گشتی مەکتەبی سیاسی بووە.
http://www.radionawxo.org

[١] رۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٢١٧٦) . ١٥/٧/ ١٩٩٦

[2] Jordi Tejel: op. cit. P76

یەکەمین بەیاننامەی راگەیاندنی خۆی لە ٢٢ی مایۆی ١٩٧٥ بلاّو کردەوەو یەکەمین گروپی پارتیزانیش، کە لە سوریاوە پەڕینەوە عێراق لە ١ی یۆنیۆی ١٩٧٦ کرا بە خاڵی دەسپێکی راگەیاندنی شۆرشی چەکداری (ی.ن.ك) دژی عێراق[1]. لێرەوە دەردەکەوێت، کە سوریا پشگیری سیاسیو سەربازی (ی.ن.ك)ی وەك یەکەمین پارت دوای شکستی شۆرشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٧٥ کرد. هەر لەم بارەیەشەوە تاڵەبانی لە باسی سوریادا بەردەوام سوپاسیان دەکات کە لە و کاتانەی بزوتنەوەی کوردی لە یارمەتییە ناوچەییو نێودەوڵەتییەکان بێبەش کراوە، سوریا پشگیری ئەو بزوتنەوەیەی کردووە[2]. بۆیە بەدەر لەوەی، کە سوریا ئامانجی لە یارمەتیدانی بزوتنەوەی کوردی، لاوازکردنی دەوڵەتی عێراقی بوو، بەلاّم بە پشگیری کردنی (ی.ن.ك) لە لایەن سوریاوە، بزوتنەوی کوردی لە باشوری کوردستانی لە گەمارۆی عێراقو ئێرانو تورکیا رزگار کرد، کە لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٥-١٩٧٩) بەسەریدا سەپابوو.

(ی.ن.ك) باشترین پەیوەندی ناوچەییان لەگەڵ سوریا بوو، بەلاّم ئەم باشییە لە پەیوەندییەکان بەرزو نزمی تێدەکەوتو دیارترین ئەو خاڵە جیاوازانە لە هەشتاکاندا بریتی بوو لە بەشداریکردنی (ی.ن.ك) لە بەرەی نیشتمانی نەتەوەی دیموکراتی، کە بە (جوقد)ناسرا بوو ، نەك لە بەرەی (جود) کە سوریا پشگیری دەکرد. لە نەوەدەکاندا بە هەمان شێوە خاڵی جیاواز هەبوو، سوریا بە دانوستانی نێوان بزوتنەوەی کوردیو رژێمی بەغداد ناڕازی بووە. هەروەها بە بەشدار بوونی هێزە کوردییەکان بە گشتیو (ی.ن.ك) بە تایبەتی، لە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی (INC) لا پەسەند نەبوو. تاڵەبانی لە دوای کۆبونەوە لەگەڵ خەدام وتی : هاورا نین لەگەڵ سوریا، چونکە فدراڵێ یەکێتی عێراق بەتین تر دەکات[3].

[1] سوزان إبراهيم حاجي أمين: التجربة الديمقراطية في كوردستان العراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة،كلية القانون والعلوم السياسية ، الأكاديمية العربية في الدنمارك، ، ٢٠١١، ص١١٧.

[2] صلاح بروارى: المصدر السابق، ص ص ٣٤٠-٣٤١

[3] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە، (٧٧٤). ١٩٩٣/٢/١٩.

تاڵەبانی لە بارەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سوریادا لە سەرەتای شەری ناوخۆدا دەڵێت:" پەیوەندیەکانمان لەگەڵ سوریادا زۆر باشە بە تایبەت لەگەڵ سەرۆك ئەسەددا. ئێمە باوەرمان وایە کە لە سوریادا کێشەیەکی کوردی گرگرتوو نییە. ئەمەش مانای ئەوە نییە کە دان بە کورد لە سوریادا نانێین، بەلام کوردەکان لە سوریا لە ناوچەی جیاوازو دور لەیەك دەژین، لە سوریا خاکی کوردستانی دیاریکراوی بەیەکەوە بەستراو نییە. هاولاتی کوردی هەیە، کە خاوەنی مافی رۆشنبیرین. پارتە کوردییەکانی سوریا، داوای ناسنامە یان خوێندن بە کوردی ناکەن. ئێمە لە پەیوەندیمان لەگەڵ سوریا لەگەڵ (پ.د.ك) هاوراین.... سوریا لای خۆیەوە دەسوەردانی لە کاروباری ناوخۆماندا نەکردووە"[1].

هەرچەندە پەیوەندییەکانی (ی.ن.ك)و سوریا لە رێکەوتی دروستبوونیەوە تا جەنگی ناوخۆ، لە ئاستێکی باشدا بەرێوە دەچوو، بەلام هیچ لایەکیان نەیاندەتوانی لەرووی پراکتیکییەوە سودی لێببینن ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی سنوری هاوبەش لە نێوان دەوڵەتی سوریاو ناوچەی هەژمونی (ی.ن.ك). هەر بۆیە ئەوەی تێبینی دەکرێت، وێرای هەلوێستی توندی سوریا بەرامبەر هەرێمی کوردستان، بەلام ئەم هەلوێستە کاریگەری نەبوو لەسەر ساردبوونەوەی پەیوەنندیەکانی نێوان سوریاو (ی.ن.ك)، تاڵەبانی چەند جارێك چووە دیمەشقو لەوێوە دەچووە دەوڵەتانی رۆژئاواو پاشان دەگەرایەوە دیمەشقو کاتێك رۆژنامەنوسان پرسیاری هلویستی سوریان لێدەکرد لە وەلامدا زۆر بە سانایی دەیوت " ئەوەل لە شامو ئاخریش هەر لەشامین"[2].

هەلوێستەکانی سوریا لە شەری ناوخۆدا بەرامبەر بە (ی.ن.ك) نەرێنی بوو هاوکات نزیکبوونەوە بوو لە (پ.د.ك). ئەمەش بۆ دوو هۆکار دەگەرێتەوە. یەکەمیان ئەوە بوو، کە (ی.ن.ك) پشگیری دوو پرۆژەی ئەمریکی کرد، کە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی سوریا بوو، بەلام (پ.د.ك) دورە پەرێز بوو لەو پرۆژانە، ئەمە وایکرد سیاسەتی سوریا زیاتر لەگەڵ (پ.د.ك) یەکانگیر ببێت. پرۆژەی یەکەمی ئەمریکا بریتی بوو لە بەشداریکردنی (ی.ن.ك) لە

---

[1] جريدة "السفير" ١٩٩٤/٨/٣٠

[2] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(٤١٦). ١٩٩٣/٦/١٨

پاڵ (کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی) لە پلانێکی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا بۆ رووخانی رژێمی عێراق، لە کاتێکدا (پ.د.ک) لەم پلانەدا خۆی کشاندەوەو بەشداری نەکرد[١]. پرۆژەی دووەمی بریتی بوو لە پرۆژەی فدراڵی مەلیك حسین، کە ئەمریکا پاڵپشتی لێدەکردو (ی.ن.ك) زۆر بە گەرمی پێشوازی لە پرۆژەی فدراڵی مەلیك حسین کرد، بەلآم (پ.د.ك) لە سەر زمانی بارزانی رایگەیاند کە ئاگاداری وردودرشی ئەو پرۆژەیە نین، هەر بۆیە رای خۆیانی لەسەر نادەن[٢].

دوومین هۆکار کە وایکرد پەیوەندییەکانی سوریاو (ی.ن.ك) لاواز بێت، بریتی بوو لەوەی، کە تاڵەبانی دەیویست سوریا لایەنگری (ی.ن.ك) بکات لە شەری ناوخۆداو سوریا ئەمەی رەتدەکردەوە. هەموو ئەمانە وایکرد، کە پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ (ی.ن.ك) لاواز بێتو تاڵەبانی لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩٥-١٩٩٦) سەردانی سوریا نەکات[٣]. بەرای ئێمە سوریا نەیدەویست لەو جەنگەدا بەشداری بکات، چونکە هیچ لایەنێکیان بۆ سوریا دژ نەبوون. هاوکات پاڵنەری سەرەکی ئێرانو تورکیا بۆ بەشداریکردن لەو جەنگە، دژایەتی کردنی هێزە بەرهەڵستکارە کوردییەکانی خۆیان بوو لە هەرێمدا، لە کاتێکدا سوریا بەرهەڵستکاری چەکداریی کوردی لە هەرێمدا نەبوو. خاڵێکی تر سوریا توانای سەربازیو ئابوری بۆ دەستوەردان لە هەرێمی کوردستان نەبوو. هەروەها سوریا بە هۆی دەستێوەردانەوە باجی بەرزاییەکانی جۆلانی دابوو هاوکات بەشێکی زۆری سوپاکەی بە هۆی دەسوەردان لە لوبنانەوە سەرقاڵ بوو بوون. دوا خاڵ ئەوە بوو، کە هەرێمی کوردستان قولآییەکی عەرەبی بۆ سوریا نەبوو وەك ئەوەی لوبنان هەیبوو. بۆیە دەتوانین بلێین دەسوەردانی سوریا لە جەنگی ناوخۆی هەرێمەکە، زۆر لاوەکیو تەنها لە رێگای بەرژەوەندییەکانی سوریا بوو لەگەڵ (پ.ك.ك) .

---

[١] أندرو كوكبورن و باتريك كوكبورن: المصدر السابق، ص ٣١٦-٣١٧

[٢] رۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٢١٦٨)، ١٩٩٦/٥/١٥.

[٣] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد، (٩٦٢). ١٩٩/٧/٩

لە دواساڵی شەڕی ناوخۆدا هەڵوێستی سوریا گۆڕانی بەسەردا هات و جارێکی تر (ی.ن.ك) و سوریا لەیەکتر نزیکبونەوە، ئەوەی ئەم نزیبەکەی دروست کرد بریتی بوو لە جێبەجێکردنی پشتێنەی ئاسایش لە هەرێمی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٧ لە لایەن تورکیاوە. سوریا ئەمەی بە پێشێل کاری و داگیرکردنی خاکی دەوڵەتێکی عەرەبی لەقەڵەم داو بە هەرەشەیەکی تورکی ئسرائیلی بۆ سەر دەوڵەتە عەرەبیەکان ناوبرد[1].

هەر بۆ ئەم مەبەستە تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٩٧سەردانی دیمەشقی کرد، دوا بەدوای ئەو شاندێکی پارتە لایەنگرەکانی (ی.ن.ك) لە جەنگی ناوخۆدا چوونە دیمەشق لە ٨ی ئۆگستۆسی ١٩٩٧، لەگەڵ جێگری سەرۆك کۆمار عەبدولحەلیم خەددام کۆبونەوەو باس لە هەرێمی کوردستان و یەك هەڵوێستی ناوچەیی بۆ دژایەتیکردنی پشتێنەی ئاسایشی تورکیا کرابوو[2]. دوای ئەم سەردانانە، هەماهەنگییەکی تەواو پەیدا بوو لە نێوان (پ.ك.ك) و (ی.ن.ك) لە جەنگی ناوخۆداو هەر ئەمەش وا دەکات، تورکیا راستەوخۆ بۆ پشتیوانی کردنی (پ.د.ك) بەشداری جەنگ بکات[3]. پاشانیش لەچوارچێوەی ئەم هێرشەی تورکیا لەهەرێمی کوردستان، سوپا (٩) گەریلای (پ.ك.ك)ی خستە بەرچاوی ڕاگەیاندن، کە هەڵگری ناسنامەی سوری بوون[4]. هەموو ئەمانە وادەکات، کە بڵێین، سوریا لە کۆتاییەکانی جەنگی ناوخۆداو لە رێگای (پ.ك.ك) بەشداری شەری ناوخۆی هەرێمی کوردستانی کرد. بە رای ئێمە لێرەوە تورکیا دەستی کرد بە فشاری سیاسی و سەربازی بۆ سەر سوریا، کە رێکەوتنامەی ئەدەنەی لە ساڵی ١٩٩٨ لێکەوتەوەو بەپێی رێکەوتنەکە، سوریا (پ.ك.ك) لە خاکی خۆیدا دەرکرد.

خاڵی سەرەکی لە پەیوەندییەکانی نێوان سوریاو هەرێمی کوردستان لە دوای ساڵی ١٩٩٨ەوە، بە بەردەوامی لەسەر پرسی داهاتووی عێراق بوو. لە دوای رێکەوتنامەی واشنتن و

---

[1] عايدةعلى سري الدين: دول المثلث بين فكي الكماشة ، ص٢٥٤

[2] المصدر نفسة : ص٢٦٧

[3] بۆ زانیاری زیاتر بروانە: هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٣٠-١٣١

[4] عايدة على سرالدين: دول مثلث بين فكى كماشة، ص٢٦٥ .

بڕیاری ئازادکردن عێراق لە لایەن کۆنگرێسی ئەمریکاوە، پرسی دابەشبوی عێراق ترسی لای سورییەکان پەیدا کرد. نەك هەر ئەوە بەڵکو لە یەکێك لە رۆژنامە بەربلاوەکانی ئیتالیا بە ناوی (میساجیرو) لە کانونی یەکەمی ١٩٩٨دا، وتارێکی بلاو کردەوە لە سەر پلانی ئەمریکا بۆ بەهێزکردنی هەرێمی کوردستان و گۆرینی نەخشەی ناوچەکە، ئەمە یەکێك لە هۆکارەکانی نزیك بونەوەی سوریا بوو لەگەڵ هەریەك لە تورکیاو عێراق لە دوای ساڵی ١٩٩٨. لەم بارەیەوە وەزیری دەرەوەی سوریا، فاروق ئەلشەرع[1] وتی: "دەوڵەتەکەی ئامادەیە بوەستێتەوە لەبەردەم پلانی ئەمریکا بۆ دابەشکردنی عێراق"[2]. ئەم گومانەی سوریا بەرەو زیاد بوون رۆیشت، کاتێك بەرهەڵستکارانی عێراقی لە دیسەمبەری ١٩٩٩دا لە نیۆرك کۆنگرەی خۆیان بەست. بۆ رەوینەوەی ترسی سوریا، نوێنەری (ی.ن.ك) لە دیمەشق، دانا ئەحمەد مەجید بە هاورێیەتی بەیان جەبر وەك نوێنەری ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی، هەوڵەکانیان خستە گەر لە پێناوی دڵنیاکردنەوی سەرکردە سورییەکان بەوەی کە ئامانجی کۆنگرەی نیۆرك بریتی نییە لە پلانی ئەمریکا بۆ هەڵوەشاندنەوی عێراق[3].

بارزانیو تاڵەبانی گرنگییەکی زۆریان بە پەیوەندییەکانی هەرێم لەگەڵ سوریای دوای حافز ئەسەددا. وێرای ئەوەی هەردووکیان بەشداری مەراسیمی ناشتنی حافز ئەسەدیان کرد لە مایۆی ٢٠٠٠دا[4]، بەلام دوای ئەوە هەریەك بەجیا دووبارە سەردانی دیمەشقیان کرد بۆ

---

[1] لە ساڵی ١٩٣٧ لە پارێزگای درعا لەدایك بووە.دەرچوی بەشی زمانی ئنگلیزییە لە زانکۆی دیمشق لە شاڵی ١٩٦٣. نوێنەری ولاتەکەی بووە لە ئیتالیا لە سالانی (١٩٧٦-١٩٨٠). پاشان بووە بە وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەکی لە سالانی (١٩٨٠-١٩٨٤). لە ساڵی (١٩٨٤-٢٠٠٦) بووە بە وەزیری دەرەوەی سوریا. ئێستا جێگری سەرۆك کۆمارە. http://www.zaidal.com

[2] مجموعة باحثين روس وعرب: المصدر السابق، ص١٤٨

[3] الانصات المركزي، نشره خبريه معلوماتيه يوميه ، العدد، ١٩٩٩/١١/٢٢

[4] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد، (١٦٠٢) ١٢/ ٦/ ٢٠٠٠

بەتینکردنی پەیوەندییەکانیان لە گەڵ سوریا بە سەرکردایەتی بەشار ئەسەد. تاڵەبانی لە ١٧ی یۆلیۆی ٢٠٠٠[1]، هەروەها بارزانی لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٠دا گەیشتنە سوریا[2].

لەگەڵ مێژوییەکی دورو درێژ لە پەیوەندیی نێوان سوریاو پارتە کوردییەکان، بەلاّم سوریا هەمیشە دوو دڵ بوو لە هەڵوێستی ئەم پارتانە. (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) ئەگەر چی لە چۆنییەتی پەیوەندییان لەگەڵ تورکیاو ئێراندا هەڵوێستو بۆچونیان جیاواز بوو بەلاّم لەگەڵ سوریادا بە تایبەت لە دوای ساڵی ١٩٩٨ هاو هەڵوێست بوون. لە کاتێکدا هێشتا ئەو دوو پارتە لە ناوخۆدا قۆناغی ململانێی نەشەر نەئاشتییان تێپەر نەکردبوو، کەچی هەردولا بەیەکەوە شاندێکی هاوبەش دەنێرنە دیمەشق، بە سەرکردایەتیی نێچیرڤان بارزانی وەك نوێنەری (پ.د.ك)و عەدنان موفتی وەك نوێنەری (ی.ن.ك). تاڵەبانی بە عەدنان موفتیدا نامەیەکی نارد بۆ سوریا، کە تیایدا نکۆڵیی لە جیابونەوەی کورد لە عێرق دەکات و جەختی لەوە کردبۆوە کە ئەمان لەگەڵ عێراقن وەك خەڵکو خاك[3].

لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەتونین بڵێین، کە پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ هەرێمی کوردستان زیاتر لەژێر کاریگەری پەیوەندییە مێژووییەکانی کورد بوو لەگەڵ ئەو دەوڵەتە، نەك پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ عێراق. هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو، کە ململانێ مێژوویەکانی نێوان سوریاو عێراق زیاتر رێگای بۆ ئەم پەیوەندیانە خۆش کردبوو. هەرچەندە سوریا لە روانگەی بیری نەتەوەی حزبی بەعسەوە دەیروانییە پرسی کورد لە ناو سوریادا. هەمان تێروانینی بۆ هەرێمی کوردستان هەبوو لە سەرەتای دامەزراندنیدا. بەلاّم بە تێپەربونی کات هەرێمی کوردستان بە دوو پرسەوە بەسترایەوە، ئەویش پرسی داهاتووی رژێمی عێراقیو رۆڵی بەرهەڵستکاران تیایدا. هەروەها پرسی (پ.ك.ك)و پەیوەندی بە هەرێمی کوردستانەوە، ئەمە دوو هۆکاری سەرەکی بوون بۆ ئەوەی دەرگای پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ هەرێمی کوردستان بە تێپەربوونی کات لە داخرانەوە بەرەو کرانەوە بڕوات.

[1] الانصات المرکزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد، (١٦٣٤) ٢٠٠٠/٧/١٨

[2] عومەر نورالدین: سەرچاوەی پێشوو. ل١٩٤

[3] الانصات المرکزی، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد، (٢١١٢) ٢٠٠١/١٢/٢٩؟

# بەشی پێنجەم

# هەرێمی کوردستان لە نێوان ململانێ و رێکەوتنەکانی تورکیاو سوریا و ئێراندا

-تـــەوەری یەکـــەم-کاریگـــەریی ململانـــێ ناوچـــەییەکان لەســـەر هـــەرێمی کوردستان

-تـــەوەری دووەم-سیاســـەتی هاوبەشـــی ناوچـــەیی بەرامبـــەر هـــەرێمی کوردستان

# تەوەری یەکەم
# کاریگەریی ململانێ ناوچەییەکان لەسەر هەرێمی کوردستان

هەرێمی کوردستان رۆڵێکی گرنگی لە ململانێکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بینی، لە هەندێکیاندا کارای یاریدەدەر بووە، لە هەندێکی تریشدا دروستکەری ململانێکان بووە. ئەم تەوەرەیە بۆ دوو باس دابەش دەکەین، کە یەکەمیان باس لە رێکەوتنی سەربازی تورکیاو ئیسرائیل لە ساڵی١٩٩٦دا دەکات. لە باسی دووەمدا کاریگەری رێکەوتنەکە لەسەر هەرێمی کوردستان لەخۆ دەگرێت.

## باسی یەکەم: رێکەوتنی سەربازی نێوان تورکیاو ئیسرائیلو رەنگدانەوەی بەسەر سوریاو ئێرانەوە:

مێژووی پەیوەندیەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیل لە ٢٨ی مارسی ١٩٤٩و لە دانپیانانی تورکیا وەك یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی بە دەوڵەتی ئیسرائیل دەستپێدەکات. بەم هەڵوێستە تورکیاو ئیسرائیل یەکەم هەنگاویان لە پەیوەندییەکان بە شێوەیەکی ئەرێنی دەستی پێکرد. هەرچەندە ساڵانی دواتر پەیوەندیەکان لە یەك ئاستدا نەبووەو بەڵکو بەرزو

نزمی بەخۆوە بینیوە[1]، بەڵام پەیوەندیی ئەم دوو دەوڵەتە لە نەوەدەکاندا باشترین ماوەی لە پەیوەندیی هەردوولا تۆمار کردووە کە بە رێکەوتنی سەربازیی فەبرایری ١٩٩٦ دەگاتە لوتکە[2]. سەرەتای ئەم رێکەوتنە سەربازییە دەگەرێتەوە بۆ نۆڤەمبەری ١٩٨٩، کە لە نێوان هێزی ئاسمانی تورکیو ئیسرائیلی کراوە. دواتر لە ئەپریلی ١٩٩١ رێکەوتنی تەواوکاری بۆ هەمان رێکەوتنی پێشوو کراوە. بەمجۆرە فرۆکەی جۆری F-16, F-25، ئیسرائلی لە بنکەکانی دیاربەکرو بەهەمان شێوە فرۆکەی تورکیا لە باکوری فەلەستین جێگیر کراون[3]. لە نۆڤەمبەری ١٩٩٣ یاداشتێکی لێکتێگەیشتن لە نێوان هەردولا مۆر کرا بۆ چارەسەر کردنی هەرەشە ناوچەییەکانو هاریکاریکردنی یەکدی لە بواری زانیاریی هەواڵگری سەبارەت بە "تیرۆر"و توانای سەربازی سوریا ئێران عێراق. لە ١٣-١٥ی نۆڤەمبەری ١٩٩٣، حیکمەت چەتین وەك یەکەم وەزیری دەرەوەی تورکیا سەردانی ئیسرائیل دەکاتو بە دوایدا لە یەنایری ١٩٩٤ عیرزا وایزمان وەك یەکەم سەرۆکی ئیسرائیل سەردانی ئەنکەرە دەکات. هەموو ئەمانە سەرەتایەك بوون بۆ رێکەوتنی ٢٣ی فەبرایری ١٩٩٦ لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا، کە لێرەوە پەیوەندییەکی بەتین لە ئاستی سوپاو حکومەتو دەوڵەت سەرهەڵدەداتو سەردانە جۆربەجۆرەکان زۆر دەبێت. بۆ نموونە تەنها لە ماوەی سەرۆك کۆماری دیمیریلدا(١٩٩٣-٢٠٠٠)، دوو جار سەردانی ئیسرائیل دەکاتو سەرۆکی ئیسرائیلیش سێ جار دەچێتە تورکیا، کە گەشەسەندنی سەرجەم پەیوەندییە ئابوریو بازرگانیو گەشتوگوزارو پەروەردەییو زانستییەکان بەدوای خۆیدا دەهێنێت. تورکیا لە ٨ی دیسەمبەری ١٩٩٦ گرێبەستێکی سەربازی لەگەڵ ئیسرائیل واژۆ دەکات بە بری ٦٣٢.٥ ملیۆن دۆلار بۆ کرینی ٥٤ فرۆکەی سەربازی لە جۆری F-4 Phantom. لە

[1] للمزيد من معلومات عن العلاقات التركية- الاسرائيلية، ينظر، وصال نجيب العزاوي و رواء زكي يونس الطويل: تركيا واسرائيل (الدور المركب) مركز الدراسات الدولية، بغداد ، ٢٠٠٢، ص ص ١-٦.

[2] Timeline of Turkish-Israeli Relations, 1949-2006: The Washington Institute for Near East Policy,2006. P4.

[3] وصال نجيب العزاوي و رواء زكي يونس الطويل: المصدر السابق، ص٧-٨.

٢٩ی مارسی ٢٠٠٢ تورکیا بە بڕی ٦٦٨ ملیۆن دۆلار، ١٧٠ تانك لە جۆری M-60A1 نۆژەن دەکاتەوە. لە رووی مەشقو راهێنانەوە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩٨–٢٠٠٣) چوار مانۆری سەربازی لەژێر ناوی "پەری دەریاReliant Mermaid" کە تیایدا هێزەکانی ئەمریکاش بەشدار بوون ئەنجام دەدرێت [١].

ناوەرۆکی ئەم رێکەوتنەکە وەك لە لایەن وەزیری بەرگری تورکیا ئۆلتان سونگورلو (Oltan Sungurlu) خرایە روو، بریتی بوو لەم خاڵانەی خوارەوە:

١. ئاڵوگۆرکردنی زانیاری سەربازییو ئەزمونو بەرێوەبردن
٢. پەیوەندیبەستن لە نێوان ئەکادیمیە سەربازییەکان
٣. مەشقی هاوبەش
٤. ئاڵوگۆری زانیاریی سەربازی لە کاتی مەشقە تایبەتیەکانی هەردوو دەوڵەتەکە
٥. لەنگەر گرتنی کەشتیە سەربازیەکان لە کەنارەکانی یەکتر
٦. ئاڵوگۆری زانیاریی کۆمەلآیەتیو رۆشنبیری
٧. هاوکاریکردنو بەکارهێنانی بەڵگەنامە سەربازییەکانی یەکتر [٢].

ئەم رێکەوتنە لە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی هەردوو دەوڵەتەوە سەرچاوەی گرتبوو، هەردوکیان لەگەڵ سوریا لە ململانێدا بوون. دژی بلآوبونەوەی چەکی کۆکوژ، توندرەوی ئیسلامیو سیاسەتی عێراقو ئێران بوون. هەروەها سیاسەتێکی هاوبەشیان بەرامبەر ئاسیای ناوەراست هەبوو. لایەنگری سیاسەتی ئەمریکی بوون لەرۆژهەلاتی ناوەراستیشدا [٣].

دەتوانین بڵێین ئەم رێکەوتنە بریتی بوو لە پلانێك بۆ بالآدەستبونی سەربازیو سیاسی تورکیاو ئیسرائیل بەسەر ناوچەکەدا. هەرچەندە تورکیا لەسەر زمانی دیمیریل وەك سەرۆك

---

[1] Timeline of Turkish-Israeli Relations, 1949–2006: The Washington Institute for Near East Policy,2006, p3.

[2] Turkish Daily News (April 12, 1996), http://www.hri.org

[3] BAYRAM SİNKAYA :op. cit, p76.

کۆمار رایگەیاند کە رێکەوتنەکە هەرەشە نییە بۆ سەر هیچ دەوڵەتێکی دراوسێ[1]، بەڵام وەزیری بەرگری ئیسرائیلی ئیسحاق مۆردەخای وتی: ئەم رێکەوتنە دەبێتە لەمپەر لە بەردەم هەر هێرشێك کە سوریا یان ئێران یان عێراق بیری لێبکاتەوە". ئامانجی ئیسرائیل لەم رێکەوتنە بریتی بوو لە فشار خستنە سەر سوریا لە میانی گفتوگۆکانی ئاشتیدا، هەروەها وەك پەیمانگای موشی دایان لە تەلئەبیب رایگەیاند: بڵاوکردنەوەی هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی لە رۆژهەڵاتی تورکیا لە ئێستادا دژی ئێرانە نەك سوریا. ئەگەر گفتوگۆی ئاشتی هەرەسی هێنا لە نێوان ئیسرائیل و سوریا رەنگە ئەوکاتە ئامانجەکە پێچەوانە بێتەوە". رایەکی تریش لەم بارەو ئەوە بوو، کە ئیسرائیل دەیویست بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی بە تەنها پشت بە ئەمریکا نەبەستێت[2]. رای ئەمریکا لەسەر رێکەوتنەکە ئەوە بوو، "رێکەوتنێکە لە نێوان دوو هاوپەیمانی ئەمریکایە، کە دەبێتە هۆی توندوتۆڵکردنی ئاسایش لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا"[3].

ئەگەر ئەمەی پێشوو ئامانجی ئیسرائیل بێت، بەڵام ئامانجەکانی تورکیا بریتی بوو لەوەی، رۆڵی هێزی ناوچەیی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست ببینێت، لە رێگای بەهێزبوونی سیاسەتی سەربازی، نفوزی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست زیاتر بکات، کۆنترۆڵی پرۆژە داهاتووەکانی عێراق و سوریا بکات لە رێگای ئاو، رۆڵی پۆلیسی ناوچەیی ببینێت[4].

گرنگترین کاریگەریی ئەم رێکەوتنە سەربازیەی نێوان تورکیاو ئیسائیل لەسەر رۆژهەڵاتی ناوەراست، بریتی بوو لە نزیکبونەوەی سوریاو ئێران. لە سەرەتای نەوەدەکاندا پەیوەندیەکانی نێوان ئێران و سوریاو تورکیا بارگرژی بەرچاوی بەخۆوە نەبینی بوو. ئەم

---

[1] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (٩١٢)، ١٩٩٨/٥/١٢.

[2] İdris DEMİR: op. cit

[3] هيثم الكيلاني: "البعد الامنى لمعاهدة السلام الاردنية-الاسرائيلية والاتفاقية العسكرية التركية-الاسرائيلية"، في، ندوة مستقبل الترتيبات الاقليمية في نمطقة الشرق الاوسط وتاثيراتها على الوطن العربى ، معهد البحوث والدراسات العربية، القاهرة،١٩٩٨، ص١٢٢-١٢٣

[4] وصال نجيب العزاويو رواء زكي يونس الطويل: المصدر السابق، ص١٣

دەوڵەتانە لە کێشەی نێوانیان زیاتر پەنایان بۆ چارەسەری دپلۆماسی دەبرد، بەلاّم لە دوای سەردانی وەزیری دەرەوەی تورکیا حیکمەت چەتین بۆ ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٩٣دا، کە سەرەتایەك بوو بۆ سەردانە چڕوپڕەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیلو بەرهەمەکەی رێکەوتنی سەربازی نۆڤەمبەری ١٩٩٦ی تورکیاو ئیسرائیلی لێکەوتەوە، چیتر بەرەی یەکەم بە تەواوی لە رۆژهەلاّتدا خۆی ئاشکرا کرد لە بەرامبەر دەوڵەتانی رۆژهەلاّتی ناوەراست بە تایبەت ئێرانو عێراقو سوریا کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانە. بە واتایەکی تر رێکەوتنی تورکیاو ئیسرائیل نەیارە کۆنەکانی لەیەکتر نزیکردەوە سوریاو ئێران هەریەکەو لای خۆیەوە لە عێراقی دوژمنی دێرینیان نزیکبوونەوە[1].

لە دوای کۆتای دووەمین جەنگی کەنداو رووخانی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١دا، ئێران بە تەواوی درکی بە مەترسی تورکیا کردو کەوتە بەر شالاّوی هەژمونی تورکیا ئەمەش دوای ئەوە هات، کە بایەخی تورکیا بۆ ئەمریکا روو لە زۆری بوو، هەروەها هەژمونی تورکیا دەستی بەرەو دەریای قەزوینو کۆماری ئازەربێجانو ئاسیای ناوەراست پەلی دەکێشا. ئەمە وایکردبوو، کە ئێران نەك مەترسی پێگە ناوچەییەکەی خۆی هەبێت، بەڵکو لەناوماڵەکەی خۆیدا مەترسی هەڵگەرانەوەی تورکە ئازەرییەکانی لێنیشتبوو[2].

ئەم مەترسیانە لای ئێران زۆر گەورەتر بوو کاتێك تورکیاو ئیسرائیل رێکەوتنی سەربازیان کرد، چونکە بە پێی رێکەوتنەکە خاكو ئاسمانی تورکیا ئاوەلا بوو بۆ فرۆکە جەنگیەکانو دەستگا هەوالگرییەکانی ئیسرائیل، کە ئەمەش هەرەشەی ئیسرائیلی خستە لێواری

---

[1] Efraim Inbar: REGIONAL IMPLICATIONS OF THE ISRAELI-TURKISH STRATEGIC PARTNERSHIP, Volume 5, No. 2 - June 2001 http://www.biu.ac.il/SOC/besa/meria/index.html

[2] Robert Olson: Turkey-Iran Relations, 2000-2001: The Caspian, Azerbaijan and the Kurds, Middle East Policy Council , Volume IX, June 2002, Number 2 , 2002, http //www.mepc.org/main/main.asp

سنورەکانی ئێران[1]. ئێران دەوڵەتی ئیسرائیلی بە دوژمنی کۆماری ئیسلامی بە تایبەتیو سەرجەم دەوڵەتە ئیسلامیەکان دەزانیو تاکە ئامانجی ئیسرائیل بەرای ئێران لاوازکردنی دەوڵەتە ئیسلامیەکانە. لە ئاستی ململانێ دوو لایەنیەکانیشدا پرسی چەکی ئەتۆمی ئێران[2]، کێشەیەکی درێژخایەن بوو لە نێوانیان، کە ئیسرائیل بە هەڕەشەی لەناوبردی خۆی دەزانی. ئێران پێیوابوو ئامانجی سەرەکی ئیسرائیل لەم ڕێکەوتنە بە پلەی یەکەم ئێرانەو بۆ ئەم مەبەستە خاکی تورکیا وەك بنکەی پشتەوەی خۆی بەکاردەهێنێت. لە لایەکی تر ئێران دژی لەشکر کێشیەکانی تورکیا بوو لە هەرێمی کوردستان بە تایبەت دوای ئەوەی پسپۆرە ئیسرائیلییەکان بەشداریان تیادا دەکرد. لەشکرکێشی تورکیا بە بۆچوونی ئێران پارسەنگی هێزی لە ناوچەکە تێك دەداتو بە قازانجی تورکیا تەواو دەبێت، کە ئەمەش ئاسایشی ناوچەکە لاواز دەکات. بۆیە ئێران لە دوای ڕێکەوتنەکە، تورکیای وەك ناپاك دەبینی، کە خۆی لە جیهانی ئیسلامی دورخستۆتەوەو لە پشتەوە خەنجەر لە دەوڵەتانی ئیسلامی دەدات[3].

---

[1] لينور مارتن: الامن القومي التركي في الشرق الاوسط: ترجمة خليل علي مراد، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٥، ص٣٢.

[2] بەرنامەی ئەتۆمی ئێرانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦١ کاتێك ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمی ئێرانی دامەزرا. ئەم بەرنامەیە سنوردار بوو لە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی گرنگییەکی زۆری پێدراو بە تواووبونی یەکەمین جەنگی کەنداو بە شێوازێکی چروپر هەوڵەکان لە پێناوی بنیاتنانی کورە ئەتۆمییەکان خرانە گور. ئەم بەرنامەیە کاردانەوەیەکی توندی ئەمریکاو دەوڵەتانی ڕۆژئاوای لێکەوتەوە، کە قەیرانێکی مەترسیداری لێیەیدا بوودو تا ئێستاش بەردەوامە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، محمد سالم احمد الكواز: الولايات المتحدة والبرنامج النووي الايراني، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، سلسلة الشؤن الاقليمية، ٢٠٠٦، ص ص ٩-٧٦.

[3] Bulent Aras: Turkish-Israeli-Iranian Relations in the Nineties: Impact on the Middle East , Middle East Policy Council, Volume VII, June 2000, Number3, http://www.mepc.org/main/main.asp

سوریا دەوڵەتێکی تر بووکە بەرهەڵستی رێکەوتنەکەی دەکرد. ئەم دەوڵەتە سێ کێشەی درێژخایەنی لەگەڵ تورکیادا هەبوو. یەکەمیان کێشەی ولایەتی ئەسکەندەرۆنە (هاتای) بوو، کە لە ساڵی ١٩٣٨ بە پێی رێکەتنێکی نێوان تورکیاو مانداتی فەرەنسی لە سوریا، ویلایەتەکە چووە سەر خاکی تورکیاو لە دوای سەربەخۆبوونی سوریا لە ١٩٤٦، سوریا وەك داگیرکەر دەیروانییە تورکیا لە ویلایەتەکە[1]. خاڵی دووەم کێشەی ئاوی فورات بوو، کە سوریاو تورکیا لەگەڵ عێراق لە ساڵی ١٩٨٧ پرۆتۆکۆلێکیان بۆ دابەشکردنی ئاو واژۆ کردبوو، بەلاَم هەریەك لە عێراق‌و سوریا (راڤەی بیرکاریانە)یان بۆ دەکرد، کە داوای (٥٠٠)مەتر سێجای ئاوەکەیان دەکرد لە کاتێکدا تورکیا راڤەی دادپەروەریانەی بۆ، کە پێیوابوو بەپێی پێداویستی ئەو دوو دەوڵەتە ئاو بەردەداتەوە[(٢)]. خاڵی سێیەم‌و گرنگ بەلای تورکیاوە پرسی (پ.ك.ك) بوو، کە تورکیا وەك پرسی ئاسایش‌و تیرۆر مامەڵەی لەگەڵ دەکردو سوریایی بە دالّدەدەری (پ.ك.ك) تاوانبار دەکردو سوریاش نکۆڵی لێدەکرد[(٣)].

سەبارەت بە رێکەوتنی نێوان ئیسرائیل‌و تورکیا، سوریا لە هەموو دەوڵەتێك زیاتر هەستی بە مەترسی ئەو رێکەوتنە دەکرد، چونکە ئەو رێکەوتنە جگە لەوەی سوریای دەخستە نێوان بەرداشی تورکیاو ئیسرائیل لە باکورو باشورەوە، هەروەها رێکەوتنەکە وەك فشارێکی ئیسرائیلی دەبینی لە سەر سوریا لە کاتی گفتوگۆکانی ئاشتی تا سوریا مەرجەکانی ئیسرائیل پەسەند بکات. بۆیە دەوڵەتە عەرەبییەکان بەگشتی‌و سوریا بە تایبەتی ئەوەیان لەم رێکەوتنە دەخوێندەوە، کە لە بری ئەوەی تورکیا بکاتە هاوبەشی

---

[1] بنجيو و جنسر أوزكان: التطورات العربية لتركيا و انحيازها الى اسرائيل بين مظالم الامس و مخاوف اليوم، ترجمة ونشر، مركز الامارات للدراسات والبحوث الاستراتيجية، ٢٠٠٣، ص ١٦. طالب محمد وهيم: "قضية الاسكندرونة" في ، ابراهيم خليل احمد واخرون، قظايا عربية معاصرة، دراسة تاريخية سياسية، دار الكتب، الموصل، ص ٢٩.

[2] ابراهيم خليل العلاف: مشكلة المياه والموراد المائية في الشرق الاوسط، مركز دراسات الاقليمية، جامعة موصل" ٢٠٠٥، ص٢٠. محمد صالح العجيلي، "متغير المياه في العلاقات العربية- التركيية: البعد الجغرافي والقانوني"، مجلة افاق عربية- العدد ٩-١٠، ايلول-تشرين الاول، ١٩٩٩، ص٥١.

[3] مجموعة باحثين روس وعرب: المصدر السابق، ص ١٣٣

ستراتیجی، دەیکاتە هەرەشەیەکی ستراتیجی بۆ سەر ئاسایشی عەرەبی[1]. پەیوەندیی هەرێمی کوردستان بە رێکەوتنەکەوە بەرای سوریا لەوەدا بوو، خودی هەرێمەکە سەرچاوەی سەرەکی نیگەرانی بوو بۆ سوریا بەتایبەت لەو روانگەیەوە کە تورکیا هەرێمەکەی کردووە بە ناوچەیەکی حەلاڵ بۆ سوپاو ئۆپەراسیۆنەکانی. لەگەڵ ئەمەشدا ئیسرائیل لە رێگای ئەم رێکەوتنەوە هەرێمەکە بەکاردەهێنێت بۆ سیخوری کردن بەسەر ئێران‌و عێراق‌و ئێران[2]. لەم سۆنگەیەوە بوو جێگری سەرۆك کۆماری سوریا عەبدول حەلیم خەددام وتی: ئەم رێکەوتنە "گەورەترین مەترسییە لە سەر عەرەب لە دوای ساڵی ١٩٤٨"[3].

هەڵوێستی عێراق لەو رێکەوتنە کەمتر نەبوو لە هەڵوێستی سوریاو ئێران، کە بریتی بوو لە بەدیهێنانی سێ ئامانج، یەکەم: کۆکردنەوەی دەنگە نارەزاییەکانی ناوچەکەو جیهان لە دژی سیاسەتی تورکیا بە تایبەت لەشکرکێشییەکانی‌و پشتێنەی ئاسایش لە هەرێمی کوردستان، کە بە پلان‌و نەخشەی ئیسرائیلی لەقەڵەم دەدا[4]. دووەم: نزیکبونەوە لە سوریاو ئێران بەوەی، کە ئەم رێکەوتنە دژی ئەم دەوڵەتانەیەو پێویستە ئەم دەوڵەتانە کۆدەنگ بن لەسەری. سێیەم: کۆتایهێنان بە و کەنارگیریەی، کە تێیکەوتبوو هەروەها هەڵگرتنی سزا ئابوورییەکانی سەری. بۆیە بە ئاشکرا ئەو هەڵوێستەی بە گوێی دەوڵەتە عەرەبیەکان دەدا، کە گەورەترین جوڵە دژی ئەو رێکەوتنە بریتیە لە گێرانەوەی پلەو پایەی عێراق لە نیشتمانی عەرەبیدا. بەڵام نە دەوڵەتە عەرەبییەکان‌و نە ئێران پاڵپشتی هەڵوێستی عێراقیان نەدەکرد، چونکە خواستی ئەوەیان نەبوو بە ئاشکرا پێشێلی سزا نێودەوڵەتییەکانی سەر عێراق بکەن، هاوکات هەڵوێستی عێراقی دوو رووی پێوە دیار بوو، لەگەڵ ئەو هەڵوێستە توندانەی سەرەوە لە دژی تورکیا دەینواند، هەمانکات لە پێناو شکاندنی کۆت‌و بەندەکانی سەری بەردەوام داوای ئاسایی بونەوەی سەرجەم پەیوەندییە

---

[1] وفرا بنجيو و جنسر أوزكان: المصدر السابق، ص ٣١-٣٢

[2] احمد حسين: المصدر السابق، ص١٩٨

[3] Efraim Inbar: op. cit.

[4] الحرب على العراق: المصدر السابق، ٥٢٠

جۆراوجۆرەکانی لە تورکیا دەکرد[١]. ئەمەش وایکرد عێراق لە هاوکێشەی بەرەنگاریکردنی ڕێکەوتنەکە بایەخی خۆی لەدەست بدات.

بەرئەنجام سورياو ئێران بەیەکەوە کاندیدی سەرەکی بوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕێکەوتنامەکە. ئەمەش زادەی ڕوانگەی هاوبەشی ئەو دوو دەوڵەتە بوو بەرامبەر کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە لە هەشتاکاندا. ئەم دوو دەوڵەتە لە ململانێیاندا لەگەڵ عێراق و ئیسرائیل، هەروەها بۆچونیان بەرامبەر کێشەکانی لوبنان کۆك بوون. بۆیە هەموو ئەم هۆکارانە وایکردبوو، ئەم دوو دەوڵەتە وەك هاوپەیمانێکی ڕانەگەیەنراو مامەڵە بکەن، بە جۆرێك ئێران لەڕێگای سورياوە لە قوڵایی عەرەبیدا سیاسەتی دەکرد، سورياش باڵانسی هێزی بەرامبەر ئیسرائیل بە پشتیوانی ئێران ڕاگرتبوو[٢]. لە نەوەدەکاندا پەیوەندییەکانی سوريا و ئێران زیاتر وابەستەی یەکتری بوون، ئەمەش زیاتر گرێدراو بوو بە هەڵوێستی هەستیاری هەردولا بەرامبەر پرۆژەی زەوی بەرامبەر ئاشتی "الارض مقابل السلام"، کە لە لایەن ئەمریکاو دەوڵەتە عەرەبییەکانەوە بۆ چارەسەرکردنی ململانێی عەرەبی-ئیسرائیلی پشگیری لێدەکرا. لە ئەنجامدا ئەم پرسە جێگای ململانێی نێوان دەوڵەتە عەرەبیە سونەکان بوو لە پێشیانەوە میسرو ئەردەن کە پشگیری پرۆژەکەیان دەکرد، لە بەرامبەردا ئێران و سوريا، لە ڕێگای بریکارەکانیانەوە، کە حزب اللە ی لوبنانی و حماسی فەلەستینی بوو، بەرهەڵستکاریان دەکرد[٣].

پەیوەندی باش و هەڵوێستی هاوبەش لەمەڕ کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سوريا و ئێرانی خستە بەرەیەك بۆ وەستان لە دژی ڕێکەوتنەکە. بەڵام ئەوەی لەم پرسەدا ئاشکرا

---

١ وفرا بنجيو و جنسر أوزكان: المصدر السابق، ص ٤٥-٤٦

[٢] عياد البطنيجي: التحالف الإيراني السوري: تاريخه، حاضره، مستقبله. مركز الشرق العربية للدراسات الحضارية والاستراتيجية. http://www.asharqalarabi.org.uk/index.htm

[3] Barry Rubin: IRAN'S NUCLEAR AND SYRIA'S IRAQ ADVENTURES, Volume 11, No. 4 - December 2007. http://meria.idc.ac.il/testasp.html

بوو، ئەم دوو دەوڵەتە تواناو هێزی رووبەڕووی راستەوخۆیان لە بەرامبەر رێکەوتنەکە زۆر لاواز بوو. ئەو رێکەوتنە تورکیاو ئیسرائیلی بەیەکەوە کرد بە گەورەترین هێزی سەربازیو ئابووری رۆژهەلاتی ناوەڕاست، کە زۆر لە پێش رکەبەرەکانیانەوە بوون[١].

## باسی دووەم: کاریگەری رێکەوتنەکە لەسەر هەرێمی کوردستان:

یەکەم: کاریگەرە راستەوخۆکانی رێکەوتنەکە لەسەر هەرێمی کوردستان

خاڵی هاوبەشی تورکیاو ئیسرائیل بەرامبەر هەرێمی کوردستان بریتی بوو لەوەی، کە هەردولا دژایەتی عێراقێکی بەهێزیان لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا دەکرد، ئاود دینۆن، فەرمانبەر لە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائل لە فەبرایری ١٩٨٢ لە گۆڤاری (کیوفونیم)ی ئیسرائیلی نوسیویەتی کە دابەشبونی عێراق بەسەر بەغدادو بەسرەو موسلْ بۆ ئیسرائیل قازانجە، چونکە عێراق گەورەترین مەترسییە لەسەر ئیسرائیل[٢]. ئیسرائیل پشتگیری دابەشبوونی عێراقی دەکردو پێیوابوو، کە دوای میسر گەورەترین مەترسی بۆ سەر دەوڵەتی ئیسرائیل، عێراقە[٣]. هەمان بیرۆکە لە میانەی دووەمین جەنگی کەنداو لە لایەن تورکیاوە خرایە روو بە شێوەیەك، کە عێراق دابەشبکرێت بەسەر سێ کۆنفدراڵی بۆ کوردو عەرەبو تورکمان[٤]. بەو هۆیەوە عێراق وەك دەوڵەتێکی سەربازی لاواز بێت ، هەروەها تورکیا هەژمونی خۆی لە ناوچە نەوتییەکانی باکوری عێراق بسەپێنێت. بەلام مەرجی تورکیا بۆ ئەم پلانە ئەوە بوو، کە کورد نەبنە خاوەنی دەوڵەت، بەڵکو لە چوارچێوەی عێراقی

---

[1] Efraim Inbar: REGIONAL IMPLICATIONS OF THE ISRAELI-TURKISH STRATEGIC PARTNERSHIP

[٢] وصال نجيب العزاوي و رواء زكي يونس الطويل: المصدر السابق، ص ١١٧. ابراهيم خليل العلاف: وحدة العراق و استقراره في عالم متغير، دراسات اقليمية، العدد ٢٠، السنة (٧)، تشرين الاول، ٢٠١٠، ص ص١٠-١١.

[3] İdris DEMİR op. cit.

[٤] هيثم الكيلاني: المصدر السابق، ص ١٢٣

کۆنفدراڵیدا بمێننەوە[1]. لێرەدا نەخشەی ئیسرائیلو تورکیا یەکانگیر دەبوو، چونکە ئیسرائیلیش پشگیری دابەشبوونی عێراقی دەکرد، بەڵام بەبێ دروستبونی دەوڵەتی کوردی. ئەمەش لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییە سەربازیو سیاسیو ئابوورییەکانی بوو لەگەڵ تورکیا، بە تایبەت لە کاتی پەیدابونی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لە نەوەدەکان. ئەوە بوو لە سەر زمانی سەرۆك وەزیران بنیامین ناتنیاهۆ[2]، رایگەیاند: "ئیسرائیل بە فەرمی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی (کە مەبەستی هەرێمی کوردستان بوو) رەت دەکاتەوە"[3].

پەیوەندیی هەرێمی کوردستان بە رێکەوتنەکەی نێوان ئەم دوو دەوڵەتەی سەرەوە لەوەدا بوو، کە پێگەیەکی گرنگی لە ناوچەکەدا هەبوو، بەجۆرێك سنووری هاوبەشی لەگەڵ نەیارەکانی تورکیاو ئیسرائیل، (ئێرانو عێراقو سوریا) هەبوو. هاوکات پاراستنی هەرێمەکە لە تورکیاوەو نەبوونی دەسەڵاتێکی تۆکمە لە ناو هەرێمی کوردستان بە تایبەت لە میانەی جەنگی ناوخۆدا لە ساڵانی (١٩٩٤–١٩٩٨)، وایکرد کە تورکیاو ئیسرائیل چاوی تێبېرنو سودی لێوەبگرن لە ململانێکانی خۆیان لە ناوچەکەدا.

باشترین سودی هەرێمی کوردستان بۆ تورکیاو ئیسرائیل، لە شکرکێشییەکانی تورکیا بوو. تورکیا ئامانجی لەشکرکێشییەکانی بە لەناوبردنی (پ.ك.ك) دیاریی کرابوو. لەم بارەیەوە ئەندام پەرلەمانێکی پارتی گەلی کۆماری دەڵێت :"پێش ریشەکێشکردنی

---

[1] الورقة الكردية فى مهب لعبة الامم كونفدرالية اوزال لسلخ الموصل و كركوك. مجلة الاسبوع العربى، ١٩٩١/٩/١٨.

[2] لە ساڵی ١٩٤٩ لە تەلئەبیب لەدایك بووە. خاوەنی رەگەزنامەی ئەمریکیە، نوێنەری ئیسرائیل بووە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە (١٩٨٤–١٩٨٨) بەشداری کۆنگرەی ئاشتی مەدریدی کردووە. یەکەم سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل بووە کە لە رێگای هەڵبژاردنی راستەوخۆوە ئەو پۆستەی وەرگرتووە لە ساڵی ١٩٩٦–١٩٩٩. لە ساڵی ٢٠٠٩ بەدواوە سەرۆك دوبارە پۆستی سەرۆکوەزیرانی وەرگرتەوە. الان غریش و دومینیك ڤیدال: المصدر السابق، ص ٤٢٢–٤٢٣.

[3] Aysegul Sever, TURKEY AND THE SYRIAN-ISRAELI PEACE TALKS IN THE 1990s, MERIA, Volume 5, No. 3 September 2001 http://www.biu.ac.il/SOC/besa/meria/index.html

(پ.ك.ك)، هەر چارەسەرێکی کێشەی کورد وەك سازشکردنی یەك لایەنە بۆ رێکخراوێکی تیرۆرستی وایە. جەنەراڵێکی خانە نشینکراوی تورکیا دەڵێت: "ناتوانین دژایەتی (پ.ك.ك) بکەین تا سەرکردەکانیان لە باکووری عێراقەوە سەرکردایەتی شەر بکەن"[1]. بەواتایەکی تر ویستی تورکیا وابوو، کە دەبێت (پ.ك.ك) لەناو بچێت نەك لە تورکیا، بەڵکو لە دەرەوەشدا، دوا بەدوای نەمانی (پ.ك.ك) کێشەکە باسی لێوە دەکرێت، چونکە بە هەبونی (پ.ك.ك) هیچ حکومەتو سیاسەتکارێك نەیدەوێرا باسی کێشەی کورد بکاتو ئەمەش وەك سازش بۆ (پ.ك.ك) ناودەبرا[2]. لەم سۆنگەیەوە چارەسەری سەربازی بۆ کێشەی کورد لە تورکیا بە تەواوی تێکەڵی بارودۆخی ناوخۆی هەرێمی کوردستان بوو، بە جۆرێك ئەم چارەسەرەی تورکیا بوو بەهۆی ئاڵۆزکردنو کڵپە سەندنی کێشە ناوخۆییەکان لە هەرێمی کوردستان. چونکە هەریەك لە (پ.ك.ك)و تورکیا بوون بە بەشێك لەو ململانێیانەی، کە لە هەرێمەکەدا سەریان هەڵدا. هەمانکات لە ئاستی دەرەکیشدا ئەم کارە سەربازیانەی تورکیا سیاسەتی کاردانەوەی ئێرانو سوریای لە هەرێمی کوردستان بەرهەمهێنا. لەو نێوانەدا هەرێمی کوردستان بوو بە چەقی قوڵبونەوەی ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دەوڵەتانە.

ئەوەی گرفتی سەرەکی بوو لەم پرسەدا ئەوە بوو، کە چارەسەری سەربازیو لەشکرکێشی تورکیا لە هەرێمی کوردستاندا بە تەواوی ئەنجامەکەی مسۆگەر نەبوو. چونکە جگە لەوەی تورکیا لەدوای دووەمین جەنگی کەنداو، لە ئامادە نەبونی عێراقدا، بە تەنها خۆی مایەوە لە رووبەڕووبونەوەی پرسی کورد بە گشتیو (پ.ك.ك) بە تایبەتی، هاوکات تورکیا هەستی بە دواکەوتوویی سوپاکەی دەکرد بۆ بینینی رۆڵی ناوچەیی بە تایبەت لە هەرێمی کوردستاندا. ئەم هەستە لە میانەی قەیرانی داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە زەقتر بوو. بەتایبەت لە کاتی جەنگەکەدا پێشکەوتنەکانی بواری چەکسازیی هاوپەیمانیان بینی. بەراوردکردنی ئەو تازەگەریانە بە دابینکاریەکانی سوپای تورکیا، وەك سەرکردەیەکی

[1] Crisis Group Middle East Report: Turkey and Iraqi Kurd: Conflict or Cooperation?

[2] للمزيد من معلزمات، انظر، المحادثات السرية بين PKKحزب العمال الكردستاني والدولة التركية،ص ص ٣٨-٥٩.

سەربازی ئەو دەوڵەتە دەڵێت، "بۆ خۆشمان مایەی گاڵتەجاری بوو"[1]. بۆیە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی بەشدارنەبونی راستەوخۆی تورکیا لە دووەمین جەنگی کەنداو، دواکەوتویی سوپاکەی بوو، کە لە روبەروبونەوی سەربازی لەگەڵ سوپای عێراق خۆی بەدوور گرت[2]. بۆیە دووەمین جەنگی کەنداو بۆ تورکیا لە رووی سەربازییەوە وەك توێژەرێکی سەربازی تورکی دەڵێت، وەك شۆرشێك وابوو. چونکە بەرپرسە تورکەکان لە هەستکردن بە دواکەوتوویی سوپاکەیانەوە، دەستیان بە نوێکردنەوەی سوپاکەیان کرد. بۆ ئەم مەبەستە بوجەیەکی زۆریان تەرخان کرد بە جۆرێك لە سالآنی (١٩٨٩-١٩٩٩)، بڕی تێچوونی سەربازی (١٨.٤٪) ی بوجەی دەوڵەت بوو، لە کاتێکدا پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی حکومەت تەنها (١٣.٩٪)ی بۆ تەرخانکرابوو[3]. هەمانکات رێکەوتنی لەگەڵ ئیسرائیل واژۆ کرد، وەك پێشکەوتوترین دەوڵەتی رۆژهەلأتی ناوەراست لەروی پیشەسازیو تەکنەلۆجیاو ئەزموونی سەربازییەوە. لەم رێگایەوە توانی سوپاکەی نوێ بکاتەوە، هەروەها لە رووی هەواڵگریشەوە قازانجێکی گەورەی لە مانگە دەسکردە ئیسرائیلیەکان بینی، کە زانیاری گرنگیان سەبارەت بە (پ.ك.ك) بە تورکیا بەخشی[4]. دەتوانین بڵێین هەماهەنگیو هاریکاریی سەربازیی نێوان تورکیاو ئیسرائیل زۆر بەتین نەبوو، تا واژۆکردنی رێکەوتنە سەربازییەکەی نێوانیان لە فەبرایەری ١٩٩٦. هەر ئەمەشە وایکرد کە لەشکرکێشییەکانی تورکیا لە هەرێمی کوردستان سەرکەوتن بەدەستنەهێنێت تا ساڵی ١٩٩٦. لە دوای رێکەوتنەکە لەشکرکێشییەکان ئامانجی خۆی دەپێکێت.

پێش ساڵی ١٩٩٦، تورکیا چەندین لەشکرکێشی تورکیا لە هەرێمی کوردستان ئەنجام داوە، کە مێژووەکەی بۆ ئۆکتۆبەری ١٩٨٤ دەگەرێتەوە ، کاتێك تورکیاو عێراق لەسەر بەکارهێنانی خاکی یەکتر لە راوەدونانی شۆرگێرانی کورد لە سەر سنووری هەردولا رێکەوتن.

---

[1] یەك دەدەین، ، سێ وەردەگرین،ل ل ٦٢-٦٣

[2] هیثم الکیلانی: المصدرالسابق: ص١٢٥.

[3] Elliot Hen-Tov : op. cit.

[4] هیثم الکیلانی: المصدرالسابق، ص ١٢٨-١٢٩.

ئەم ڕێکەوتنە لەساڵی (١٩٨٥–١٩٨٧) لە لایەن تورکیاوە سێ جار بەکار هێنرا، بەڵام کاتێك عێراق ویستی کاری پێبکات لە ڕاوەدونانی کوردی سەر سنورەکان، تورکیا ڕێگای پێنەدا، بۆیە ڕێکەوتنەکە هەڵوەشێنرایەوە[1]. لە دوای دووەمین جەنگی کەنداو تورکیا یەك لاینە دەستی کردەوە بە خستنە گەڕی ئەو ڕێکەوتنەو بۆ یەکەمین جار لە مارسی١٩٩١ دەستی کردەوە بە لەشکرکێشی‌و لە گرنگترینیان لەشکرکێشی ١٩٩٥، ١٩٩٧ بوو[2]. ژمارەی ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازیانە بە تەواوی دیار نییە، بەڵام سەرچاوەکان باس لە هەندێك ژمارە دەکەن، هەندێك دەڵێن سوپای تورکیا لەساڵانی (١٩٩٢–١٩٩٨)، بەشێوەی جۆراوجۆر (٣١٣) جار سنوری خاکی هەرێمی کوردستانی بەزاندووە، (٥٠) چالاکی زەمینی، (٢٢٥) چالاکی فڕۆکەوانی، (٣٨)جار بۆمبابارانی هەرێمەکەی کردووە[3].سەرچاوەیەکی تر بە ٥٠ ئۆپەراسیۆنی سەربازی داناوە[4]، سەرچاوەیەکی تر بە ٢٤ جار ناوی بردووە[5].

لەشکرکێشی ساڵی ١٩٩٥، تا ئەو کاتە گەورەترین ئۆپەراسیۆنی سەربازی بوو لە مێژووی تورکیادا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەدا. ئەم پرۆسەیە لە ٢١ی مارت تا ٤ی مایۆی خایاند، (٣٥) هەزار سەربازی پڕچەکراو بە هەموو پێداویستیەکی ئاسمانی‌و زەمینی بەشداریان تیادا کرد، بە قوڵایی(٤٠کم)و بەدرێژی (٢٤٠کم) سنووری هەرێمی کوردستانیان بەزاند[6].گرنگترین ئەنجامی ئەم لەشکرکێشییە بریتی بوو لە شکستی سوپا لە دورخستنەوەو لەناوبردنی (پ.ك.ك) لەسەر سنورەکانی هەرێمی کوردستان. سەرۆك وەزیران چیلەر بە ڕاشکاوی دانی بەوەدا نا، کە پرۆسەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوەو لەم

---

[1] هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: سەرچاوە پێشوو، ل٨٣.

[2] Crisis Group Middle East Report: Turkey and Iraqi Kurds: Conflict or Cooperation?

[3] يوسف إبراهيم الجهماني: أوج الآن، تركيا والأكراد، دار حوران، دمشق، ل٧٦.

[4] هيثم الكيلاني: المصدر السابق، ص ١٢٣

[5] Crisis Group Middle East Report: Turkey and Iraqi Kurds: Conflict or Cooperation?

[6] جلال عبدالله معوض: صناعة القرار تركيا، ص ٤٥–٤٦

بارەیەوە ئێرانی بە هۆکاری شکست دەستنیشانکرد بە تایبەت لە داڵدەدانی گەریلا هەڵهاتووەکاندا[1]. هەروەها سەرۆك کۆمار، دیمیریل لەسەروبەندی دوا ڕۆژەکانی لەشکرکێشیەکە باسی لەوە کرد، کە دوای کشانەوەی سوپا، گەریلاکان دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و مەترسیەکانیان دوبارە بۆ سەر تورکیا دەسپێدەکاتەوە. هەربۆیە پرسی گۆڕینی سنوری نێوان عێراق و تورکیای وروژاند بە جۆرێك سنورەکان لە چیاکانی عێراق بۆ دەشتاییەکان دابەزێتە خوارەوە، چونکە ئەگەر سنوور لە ناوچە نزمەکانی کەنار چیاکان بێت، ئەوا چەکدارەکانی (پ.ك.ك) ناتوانن لەو ناوچەیەدا خۆیان مەلاس بدەن. لێرەوە بۆ زامنکردنی سنورەکان، بیرۆکەی پشتێنەی ئاسایشی تورکیا لە هەرێمی کوردستاندا لە لایەن چیلەرەوە بە هاریکاری (پ.د.ك) گەڵاڵە بوو. بەڵام ئەوەی جێبەجێکردنی ئەم بیرۆکەیەی دواخست، چەند شتێك بوو، یەکەمیان نارەزایی دەوڵەتە ناوچەییەکان بوو بە تایبەت ئێران. وەزیری رۆشنبیری عەلی فەلاحیان لەم بارەیەوە ئاماژەی بەوەداو وتی: ئەوانە دەیانەوێت، گورزی سیاسی لە سیستەمی ئیسلامی ئێران بوەشێنن[2]. هەروەها (پ.د.ك) لەگەڵ ئەوەی ئامادە بوو لەگەڵ تورکیا هاریکار بێت بۆ دژایەتی (پ.ك.ك)، بەڵام ئامادەی مانەوەی سوپای تورکیا نەبوو لە هەرێمی کوردستان بۆ ئەوەی ناوچەی هەژمونی خۆی لە بن دەست بمێنێتەوە[3]. لە لایەکی تر گرنگترین هۆکاری دواخستنی بیرۆکەکە بریتی بوو لە گرتنە دەستی حکومەتی تورکیا لە لایەن ئەربەکانەوە، کە بۆچوونی تایبەتی هەبوو لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا. ئەربەکان خاوەن بیروباوەڕێکی ئیسلامی بوو نەك لە سیاسەتی ناوخۆدا، بەڵکو لە سیاسەتی دەرەوەشدا. ئەو پێیوابوو، کە پێویستە تورکیا پشت لە رۆژئاوا بکات و رووی بەرەو رۆژهەڵات وەرچەرخێنێت. هەروەها پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامییەکان و

---

[1] Kemal Kirisci: op. cit.

[2] TRKNWS-L Turkish Daily News (April 12, 1996) http://www.hri.org.

[3] ئیریك جەی. زوچەر: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠٦،

CHRIS HEDGES: Turkey Offers Kurd Rebels Reform, Plan Published: March 26, 1995. new York times, http://www.nytimes.com

بە تایبەتیش دەوڵەتە ناوچەییەکانی وەك عێراق‌و ئێران‌و سوریا ئاسایی بکاتەوە، بە بێ گوێدانە سزا نێودەوڵەتییەکان‌و سزاکانی ئەمریکا لەسەر ئەو دەوڵەتانە[1].

لەم سۆنگەیەوە ئەربەکان سەردانی ئێرانی کرد لە ١٠ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦و هەگبەکەی سێ پرسی لەخۆ گرتبوو، ئەویش پرسی ئابووری‌و تیرۆرو ئاسایش بوو. لە روی ئابوورییەوە لەو سەردانەدا ئەربەکان گرێبەستی گازی سروشتی لەگەڵ ئێران بۆ ماوەی٢٢ ساڵ‌و بە بری ٢٣ ملیار دۆلار مۆر کرد. لە بارەی تیرۆرەوە، ئەربەکان ئەوەی رەتکردەوە کە سوریاو ئێران یارمەتی تیرۆرستان بدەن بەڵکو ئەوە هەوڵی دەستگای هەواڵگری ئەمریکایە بۆ رێگرتن لە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتە ئیسلامییەکان. ئەربەکان دوو پێشنیاری خستە بەر دەستی ئێرانییەکان، کە تورکیا بۆردومانی پێگەی تیرۆر لە ناو ئێران بکات وەك چۆن لە عێراق کردویەتی. هەروەها هێزی ئێرانی‌و تورکی ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەش بکەن دژی تیرۆر بۆ دەرخستنی نیەت پاکی هەردولا. لە روی ئاسایشی ناوچەییەوەو بۆ دەستگرتن بەسەر ئەو شڵەژاویەی، کە لە ناوچەکەدایە باسی ئەوەی کردبوو، کە ئاسۆی کۆبوونەوی وەزیرانی بەرگری‌و دەرەوەی دەوڵەتانی ئێران‌و سوریاو تورکیاو عێراق روونەو جێبەجێ دەبێت. لە بارەی عێراقەوە رێکەوتبوون لەسەر ئەوەی، کە پارێزگاری لە یەکێتی خاك‌و ئاسایشی عێراق بکرێت‌و دەربارەی هەرێمی کوردستان لایەنی سوری‌و تورکی‌و ئێرانی هەماهەنگی بکەن، سەبارت بە هەرێمی کوردستان‌و بەرەنگاری کێشەی کورد ببنەوە بۆ ئەوەی ئەزمونی هەرێمی کوردستان بۆ دەوڵەتانی دراوسێ نەپەڕێتەوە[2]. ئەم سەردانەی ئەربەکان، هاوکاتی سەردانی وەزیری دادی تورکیا شەوکەت قازان بوو بۆ عێراق لە ١١ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦دا. واتە دوای یەك رۆژ لە سەردانی ئەربەکان بۆ ئێران، کە لە رواڵەتدا بۆ کێشەی خواردەمەنی‌و

---

[1] عمر تشبينار: سياسات تركيافي الشرق الأوسط:بين الكمالية والعثمانية الجديدة، مؤسسة كارنيغي للسلام الدولي، واشنطن،**2008**. ص ١٧.

[2] منال الحمداني: المصدر السابق، ص ٢٢٨.

دەرمان و کێشەی بۆریە نەوتیەکانی نێوان عێراق و تورکیا بوو، بەڵام لە راستیدا فایلێکی تری ئەم سەردانە بۆ رێکخستنی ئەو کۆبونەوە چوار قۆڵییە بوو[1].

لێرەو دەگەینە ئەو راستیەی، کە ئەو رێکەوتنە سەربازیەی حکومەتی چیلەرو سوپا لەگەڵ ئیسرائیل رێکی خستبوو، لە لایەن ئەربەکانەوە پەك خراو ئەربەکان بە دیدێکی نوێوە مامەڵەی لەگەڵ کێشەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست کرد، بە هەرێمی کوردستانیشەوە. بگرە ئەربەکان بەدیلی تری پێبوو بۆ هاوپەیمانی سەربازی تورکیاو ئیسرائیل، ئەویش پشگیریکردنی پرۆژەی بەرگری هاوبەش بوو کە رەفسەنجانی لە میانەی سەردانی بۆ ئەنکەرە خستیە بەردەم ئەربەکان، ئەگەر چیلەرو سوپا نەبوایە، ئەوا ئەربەکان رەزامەندی لەسەر دابوو[2]. دەرهاویشتەی ئەم سیاسەتەش لە هەرێمی کوردستاندا بە تەواوی دەرکەوت، ئەوە بوو ئێران بە ئاشکرا هێزی سەربازی خۆی خستە ناو زۆنگی هەرێمی کوردستان، ئەو مافەی کە تورکیا بۆ خۆی بە رەوا بینی بوو، کە خاکی هەرێمی کوردستان بەکار بهێنێت بۆ لێدانی بەرهەڵستکارەکانی، ئەمیش لای خۆیەوە ئەو مافەی بە مۆڵەتی ئەربەکان و بە هاوکاری (ی.ن.ك) دەستکەوت. ئەوە بوو ئێران لە لە ١٧ی یۆلیۆی ١٩٩٦ بە یارمەتیدانی (ی.ن.ك) هێرشی کردە سەر بارەگانی (ح.د.ك.ا) لە شارۆچکەی کۆیە[3]. هاوکات حکومەتی عێراقی بە هاندانی ئەربەکان و لەسەر بانگهێشتی (پ.د.ك) ، لە هەڵمەتێکدا بۆ گێرانەوی دەسەلاتی خۆی لە هەرێمی کوردستان، بە (٣٠-٤٠) هەزار سەربازی عێراقی و (٣٥٠) تانك و (٣٠٠) تۆپ لە (٣١ ئۆگستۆسی ١٩٩٦) لە باشورەوە هێرشی کردە سەر پارێزگای هەولێرو هێزەکانی (ی.ن.ك)یان لەو شارە دەرکرد، کە دوای چەند

---

[1] روبرت اولسن: المسالة الكردية في العلاقات التركية-الايرانية، ترجمة، محمد احسان، دار ئاراس للطباعة والنشر. اربيل، ٢٠٠١، ص٩.

[2] Kemal Kirisci: op. cit.

[3] کریس کۆچیردا، بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد هیوای سەربەخۆیی، بەرگی یەکەم، ل ١٥٧-١٥٨

رۆژێك بە تەواوی لە خاکی هەرێمی کوردستاندا دەسەلاتی سیاسیوسەربازیان لەدەستداو چوونە سەر سنورەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئێراندا[١].

بە واتایەکی تر پلانی ئەربەکان بۆ گێرانەوەی دەسەلاتی ناوەندی بەغداد بوو بۆ هەرێمی کوردستان بە رەزامەندی دەولەتە دراوسێکانو بە پشتگوێخستنی ناوچەی دژە فرینو سیاسەتی ئەمریکا لە ناوچەکە بە گشتیو عێراق بە تایبەتی. ئەربەکان توانی بەرژەوەندییەکانی هەر چوار دەولەتی هاوسنوری هەرێمی کوردستان لە ئۆگستۆسی ١٩٩٦دا کۆ بکاتەوە. ئێران توانی هێرش بکاتە سەر (ح.د.ك.ا). عێراق لە رێگای (پ.د.ك) هەرێمی کوردستانی گرتەوە. سوریاش گەرانەوەی دەسەلاتی ناوەندی بۆ هەرێمی کوردستانی پێباش بوو. خودی تورکیاش لە سێپتەمبەری١٩٩٦ بریاری لەسەر پێکهێنانی پشتێنەی ئاسایش بە قولایی(٥کم)و بە درێژایی سنوری خۆی لەگەڵ هەرێمی کوردستان دا[٢]. تالەبانی لەم بارەیەوە ئەربەکانی تۆمەتبار کردو رایگەیاند، کە پلانی لەگەڵ عێراقدا بریتی بووە لە: یەکەم گرتنی هەولێر لە لایەن عێراقەوە، دووەم هاتنی تورکیا بۆ هەرێمی کوردستان، سێیەم دەرکردنی (ی.ن.ك) لە هەرێمەکە[٣].

پلانی ئەربەکان سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا چونکە بە پلەی یەکەم رەچاوی بەرژەوەندیو پلانی ئەمریکی لە ناوچەکەو لە هەرێمی کوردستانو عێراق بە تایبەتی نەکرد. ئەمریکا بەهۆی گورزی سەربازیەکانی لە باشوری عێراق، توانی پاشەکشە بە سوپای عێراقی لە هەرێمی کوردستان بکات[٤]. پاشان بانگهێشتی لایەنە ناکۆکەکانی هەرێمی کوردستان بۆ ئەنکەرە بکات. ئێران لە لای خۆیەوە، کە درکی بە شکستی پلانەکە کرد، دەستی لە

---

[١] جوناثان راندل: أمة في شقاق، دروب كردستان كما سلكتها، ترجمة: فادي حمود، دار النهار، بيروت ١٩٩٧، ص٣٨٨.

[٢] جلال عبد الله معوض: صناعة القرار في تركيا، ص١٦٢-١٦٣.

[٣] عايدة علي سري الدين: دول المثلث بين فكي الكماشة التركية الاسرائيلية، ص ص ١٠٢-١٠٣.

[4] WASHINGTON (CNN): U.S. Air Force jet fires missile at Iraqi radar facility, September 4, 1996, http://www.cnn.com/MAPS/9607/nav_bar.ma

یارمەتیدانی (ی.ن.ك) نەپاراست، ئەوە بوو بە هۆیەوە (ی.ن.ك) توانی دەسەلأت خۆی بەسەر سەرجەم ناوچەکانی خۆی، جگە لە هەولێر، بگەڕێنێتەوە. ئەمریکاش لە ئەنجامی هاوپەیمانی عێراق– بارزانیدا، چاوی لە هاوپەیمانی ئێران– تاڵەبانی پۆشی و بە بانگەوازی دەسوەرندەدان لە کاروباری ناخۆی هەرێم لە لایەن عێراقو ئێران کۆتایی پێهێنا[1].

بە دیوێکی تردا دەتوانین بڵێین پلانی ئەربەکان بریتی بوو لە کاردانەوەیەکی شکستخواردووی هێزە بەرهەڵستکارەکانی ڕێکەوتنامەی سەربازی تورکیا ئیسرائیل، کە بەرئەنجامەکەی بریتی بوو لە دابەشکردنی هەرێمی کوردستان بەسەر دەسەلأتی (پ.د.ك)و (ی.ن.ك). لێرە بەدواوە تورکیاو ئێران لە هەماهەنگیەکی کورتخایەنەوە چوونەوە سەر هێڵی ململانێ باوەکان لە هەرێمی کوردستاندا. هەروەها دەوڵەتە ناوچەییەکان بە تایبەت لە دوای ڕێکەوتنامەی ئەنکەرە لە ٣١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٦، سنوری هەژمونی خۆیان لە هەرێمی کوردستاندا بۆ دەرکەوت. هەژمونی ئێرانی لە سنوری دەسەلأتی (ی.ن.ك)و هەژمونی تورکیا لە سنوری دەسەلأتی (پ.د.ك)دا بوو. عێراقیش لە دوای ڕێکەوتنی ئەنکەرە بە تەواوی لە ململانێ ناوچەییەکانی هەرێمی کوردستان کرایە دەرەوە. بە واتایەکی تر ڕوداوەکانی ٣١ی ئۆگستۆس ململانێی (ی.ن.ك)و هاوپەیمانە ئێرانیەکەی لەگەڵ (پ.د.ك)و هاوپەیمانە تورکییەکەی لە هەرێمی کوردستان یەکلایی کردەوە. ئەوەی مایەوە هەژموونی (پ.ك.ك) بوو لە هەرێمی کوردستان بە تایبەتیو ناوچەکە بوو بە گشتی. ئەم پرسە لە ڕێگای لەشکرکێشی ١٩٩٧ یەکلایی کرایەوە بە پشت بەستن بە ڕێکەوتنامەی سەربازی تورکیاو ئیسرائیل.

ئەم لەشکرکێشییەی تورکیا لەژێر ناوی ئۆپەراسیونی (فولاز–٢) بوو، کە (٥٠) هەزار سەرباز بەتەواوی چەکی ئاسمانیو زەمینی لە ١٤ی مایۆ–٢١ی یونیۆ١٩٩٧، ڕژانە ناو هەرێمی کوردستانەوە. جیاوازیی ئەم لەشکرکیشییە لەوانەی پێشووتر ئەوە بوو، ئامانجە سەربازییەکانی تورکیا زۆر ڕوونو ئاشکرا بوو، ئەمەش بە هۆی بوونی هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان دەسەلأتی (پ.د.ك)و تورکیا لەبەرامبەر (ی.ن.ك)و (پ.ك.ك) بە پشگیری ئێران، کە

---

[1] احمد حسين: المصدر السابق، ص١٤٥.

وایکرد، تورکیاو (پ.ك.ك) کەوتنە شەڕێکی روو بەروو، کە بەپێی ڕاگەیاندنی سوپای تورکیا، (٢٦٠١) گەریلایان کوشتووە، لەریزی سوپای تورکیا (٩٩) کوژراو (٣١٣)بریندار هەبووەو دوو کۆپتەریش کەوتۆتە خوارەوە[١]. ئەو ژمارانەی سەرەوە ئەوە دەردەخەن ئەگەر تورکیا لە ژمارەی کوژراوەکانی (پ.ك.ك) زیادە رۆیی کردبێت، ئەوا دانپیانانی سوپا بەو ژمارە زۆرەی قوربانییەکانی سوپا، نیشانەی سەختیو گەورەیی شەرەکان بووە. لەلایەکی تر لەم پلانەدا فرۆکەکانی ئیسرائیل بەبەکارهێنانی ئاسمانی تورکیا، سەرپەرشتیاری وردی (سوریا–عێراق–ئێران) دەکرد[٢]. دوابەدوای ئەم لەشکرکێشییە، سوپای تورکیا لە ٢٢–٢٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٧، دەستیکرد بە جێبەجێکردنی بریاری ئەنجومەنی ئاسایشی تورکیا لەبارەی دانانی پشتێنەی ئاسایش لە هەرێمی کوردستاندا. ئەم پشتێنەیە بە قوڵایی (٥–١٥)کم، بەدرێژی سنوری نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان بوو. (٨) هەزار سەربازی تورکیا بە شێوەیی هەمیشەییو بە بەکارهێنانی تازەترین ئامێری چاودێری[٣]، لە هەرێمی کوردستان لە ناوچەکانی بامەرنیو باتوفاو ئامێدیو کانی ماسی نیشتەجێبوون[٤].

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە رێکەوتنی سەربازی تورکیاو ئیسرائیل یەکەم رەنگدانەوی لە هەرێمی کوردستان دەرکەوت، کە رووداوی ٣١ی ئۆگستۆسی ١٩٩٦ بوو، هاوکات ئەنجامێکی تر، کە دای بەدەستەوە بریتی بوو لە دامەزراندنی پشتێنەی ئاسایشی

---

[1] رساله مام جلال: تركيا تباشر اقامه حزامها العدواني، التواجد التركي والاحزام الامنى، ١٩٩٧/١١/٦

Ankara bombs northern Iraq from the militant. vol 61.no-35-13 coctobe.1997. www. Har ford. Hwp.com

[2] خليل على مراد: دوافع التحالف التركي – الصهيوني، مجلة دراسات سياسية، (بغداد–بيت الحكمة)، العدد الثاني السنة الاولى، ١٩٩٩ ل ٢١.

[3] Alain Gresh: op. cit

[4] تركيا والاكراد العراقيين : تنازع ام تعاون؟ تقرير الشرق الاوسط لمجموعة الازمات رقم81 13نوفمبر- 2008

تورکیا لە هەرێمی کوردستان، کە وەك شمشێرێك بۆ چاودێریکردنی هەرێمی کوردستان، هەمانکات لە دژی (پ.ك.ك) بەکار دەهات.

## دووەم: کاریگەری ناراستەوخۆی ڕێکەوتنەکە لەسەر هەرێمی کوردستان:

یەکێك لە گرنگترین گرفتی پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ سوریاو ئێران بریتی بوو لە کێشەی (پ.ك.ك). لەم بارەیەوە سەرۆك وەزیرانی تورکیا چیلەر وتی: "ناتوانین لەوە زیاتر لە پشگیری دەرەکی تیرۆر بێدەنگ بین. دراوسێکانمان دەەبێت بڕیاربدەن کە یان هاوڕێی تورکیا دەبن یان هاوڕێی نابن". وەزیری دەرەوەی تورکیا حیکمەت چەتین زیاتر ئەم پرسەی ورد کردەوەو دەوڵەتە گرنگەکانی لەم پرسەدا دەستنیشان کردو وتی، یەکەمین پرسی ولاتەکەی لە دراوسێ باشیدا بریتیە لە لەناوبردنی "تیرۆر". داهاتووی پەیوەندیەکانی دەوڵەتەکەی لەگەڵ سوریاو ئێران لسەر خواستی ئەو دوو دەوڵەتە لە ڕووبەڕووبوونەوە "تیرۆر"و ڕاگرتنی پشگیری سیاسیو مادی بۆ (پ.ك.ك) وەستاوە[(١)].

لە نەوەدەکاندا (پ.ك.ك) گرێکوێرەیەکی توند بوو لە پەیوەندییەکانی تورکیاو ئێران. تورکیا بەوە ئێرانی تۆمەتبار دەکرد، کە یارمەتی (پ.ك.ك) دەدات لەروی پشگیری

---

[١] خليل علي مراد واخرون: القضية الكردية في تركيا وتاثيرها على دول الجوار، مركز دراسات التركية، موصل، ١٩٩٤، ص ص١٥٧-١٥٨. جگە لە ئێرانو سوریا، یەکێکی تر لەو دەوڵەتانەی پشگیری (پ.ك.ك)دەکرد یۆنان بوو لە پێناو لاوازکردنی تورکیا لە ناوچەکەدا. ئەمە تەنها بۆچونێك بوو، بەلام لە ساڵی ١٩٩٧ یەکێك لە ڕۆژنامەکانی بریتانیا بلاوکرایەوە کە ڕێکخراوە توندرەوەکانی یۆنان، ڕاهێنانیان بە ئەندامامی (پ.ك.ك) کردووە بۆ کاری توندرەوی لە ناو تورکیا. ئەم پەیوەندیەش بە ڕوونی دەرکەوت کاتێك، کە یۆنان یارمەتی ئۆجالانی دەدا بۆ پەناگایەکی ئارام لە جیهاندا. ئۆجالان چووە ئیتالیاو لەوێوە بۆ مۆسکۆ. لە ٢٩ی یەنایر لە یۆنان بوو دواتر چوو بۆ بلاروسیا، بەلام شوێنی دەستنەکەوت. لە ٢ی فەبرایر گەڕایەوە یۆنانو ئنجا چوو بۆ کینیا. دواتر لە سەفارەتی یۆنان لە کینیا دەستگیر کرا.

Spiros Ch. Kaminaris: GREECE AND THE MIDDLE EAST, MERIA, Volume 3, No. 2 June 1999, http://www.biu.ac.il/SOC/besa/meria/index.html.

لۆجستیو دابینکردنی شوێنی مەشقکردنو پێداویستی تەندروستی بۆ گەریلاکانو نیشتەجێکردنیان لە خاکی ئێران بە تایبەت لە سنوری پارێزگای ئازەربێجانی رۆژهەڵات. بەپێی زانیارییە هەواڵگریەکانی تورکیا، کە رادەستی ئێران کراوە، ئێرانو (پ.ک.ک) لە تاران رێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە (پ.ک.ک) زەوی ئێران دژی ترکیا بەکار بهێنێت. هەروەها لە سەرەتای نەوەدەکانەوە (پ.ک.ک)، ٢٠ بنکەی سەربازی لە ئێراندا هەبووە. ژماری گەریلاکانی لەو بنکانەدا لە نێوان ٧٠٠-٨٠٠ کەسدا بووە. عوسمان ئۆجالان رێکخەری پەیوەندییەکانی نێوان ئێرانو (پ.ک.ک)، بووە. تورکیا رای وابوو کە وەزارەتی دەرەوەو حکومەتی ئێرانی لایەنگری ئاشتیو رێکەوتنن لەگەڵ تورکیا بەلآم باڵی توندرەو پاسداران (پ.ک.ک) بەکار دەهێنن دژی تورکیا بە تایبەت لە دژایەتیکردنی تورکیا لە باکووری عێراقو قەفقاسیا[1]. هەرچەندە سەرکردەکانی (پ.ک.ک) باسییان لەو پەیوەندییانە دەکرد[2]، بەلآم ئێران نکۆڵی لێدەکرد. لە راستیشدا ئێران ئەو گەمەیەی لە بەرئەنجامی چالاکبونی سیاسەتی دەروەی تورکیا دەکردو کاریگەریی ئەو سیاسەتەی لە سەر باری ناوخۆیی ئێران بە مەترسی دادەنا. بۆیە ئێران لە بەرامبەر فشاری سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا، دوو کارتی لەبەر دەستدا بوو، ئەویش کارتی (پ.ک.ک)و کارتی ئیسلامییە توندرەوکانی ناو تورکیا بوو. لە لایەك رێگری لە (پ.ک.ك) نەدەکرد بۆ بەکارهێنانی خاکەکەی لە دژی تورکیا. لە لایەکی تر هاریکاری بزوتنەوە ئیسلامییە توندرەوەکانی دەکرد بۆ لەناوبردنی بەرهەڵستکارە

---

[1]BAYRAM SİNKAYA :op. cit: p 77-79. MEKIN MUSTAFA KEMAL OKEM: TURKISH MODERNITY AND KURDISH ETHNO-NATIONALISM, A THESIS SUBMITTED TO THE GRADUATE SCHOOL SOCIAL SCIENCES OF MIDDLE EAST TECHNICAL UNIVERSITY IN PARTIAL FULFILLMENT OF THE REQUIREMENTS FOR THE DEGREE OF DOCTOR OF PHILOSOPHY IN POLITICAL SCIENCE .2006

٢ چاوپێکەوتن لەگەڵ فایەق گوڵپی.

ئێرانییەکانی ناو تورکیا[1]. لە وەلامی ئەم سیاسەتی ئێراندا، تورکیا لە ساڵی ١٩٩١کەشتییەکی ئێرانی دەستبەسەر کرد بە گومانی ئەوەی، کە چەکی بۆ (پ.ك.ك) هەڵگرتووە. هەروەها لە ئۆگستۆسی ١٩٩٢ چەند یەکەیەکی سەربازی تورکیا سنوری ئێرانیان بەزاند بۆ راوەدونانی (پ.ك.ك). هەروەها لە یەنایری ١٩٩٤ هێزی ئاسمانی تورکیا لە میانی بۆردومانکردنی سەربازگەکانی (پ.ك.ك) لە هەرێمی کوردستان، ٩ دێهاتی کوردی ئێرانی کوشت[2].

ئەو تۆمەتانەی تورکیا، کە ئێرانی لە بارەی یارمەتییەکانی (پ.ك.ك) پێ تاوانبار دەکرد، زۆر توند تر لەوە تورکیا بەرەورووی سوریای دەکردەوە. تورکیا سوریای تۆمەتبار دەکرد، کە یارمەتی "تیرۆر" دەدات بە تایبەت (پ.ك.ك). لە هەشتاکاندا تورکیا سوریای بە هاندانی یەککگرتنی پارتە کوردییەکانی عێراق و تورکیا تاوانبار کرد. داوای داخستنی سەربازگەکانی (پ.ك.ك) لە سوریا کرد، کە شەش سەربازگەی سەرەکین[3]. لەم بارەیەوە ئۆزاڵ لە سێپتەمبەری ١٩٨٩ سوریای ئاگادار کردەوەو وتی: ئەگەر دەسبەرداری پشگیری کردن لە چالاکییەکانی (پ.ك.ك) نەبێت، ئەوا بە تەواوی ئاوی فوراتی لێدەگرێتەوە. لە بەرامبەردا سوریا بەردەوام نکوڵی لەم تۆمەتانە دەکرد. رای سوریا لەم بارەیەوە وەك ئەسەد لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٧، وتی: "تورکیا لە سوریا داواکارە، کە ئەوەی لە ناوخۆی ئە دەوڵەتە دەگوزەرێت، سوریا رایبگرێت..... بەلام ئەو کێشەیە لەناو خودی تورکیادایە". هەروەها وەزیری دەرەوەی سوریا فاروق ئەلشەرع، هەرسەبارەت بەم باسە لە لێدوانێکدا ئەوەی رەتکردەوە، کە سوریا بەرپرس بێت لە ململانێی (پ.ك.ك)و تورکیا، هەروەها وتی کە (پ.ك.ك) بە ملیۆنەها لایەنگری لەناو تورکیادا هەیە، کە پێویستی بە پشگیری سوریا نییە، کێشەکە لە دزە کردنی (پ.ك.ك) نییە بۆ ناو تورکیا. بەڵکو کێشەکە پەیوەندیی بە ناوخۆی

---

[1] ROBERT OLSON: TURKET-IRAN relation,1997-2000 the Kurdish and Islamist Question, ThIrd Wold Quarterly, Vol 21, No 5, 2000. P 872-876.

[2] BAYRAM SİNKAYA: op. cit. p79-80.

[3] وصال نجيب عارف العزاوي: المصدر السابق، ٢٧٨.

تورکیاوە هەیەوەو پێویستە تورکیا لە ناوخۆدا چارەسەری بکات. لێرەدا تورکیا ئەوەی لا روون بوو، کە بنکەی سەرەکی (پ.ك.ك) لە ناو سوریایە، بەلأم نەیدەویست راستەوخۆ هێرش بکاتە سەر ئەو دەوڵەتە. لەبەر هێشتنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبییەکاندا، هەروەها بۆ ئەوەی (پ.ك.ك) لە قازانجی خۆی ئەو شەرە نەقۆزێتەوە. دواجار بۆ رەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە ناوچەکەدا بەتایبت بۆ تێکنەدانی سەقامگیری ناوچەکە[1]. بە رای ئێمەش تورکیا نەیدەتوانی بچێت شەرێکەوە لەگەڵ ئێران‌و سوریا کە سەرکەوتنی بە تەواوی مسۆگەر نەبوو، چونکە هێزی سوپای تورکیا بە بەراورد لەگەڵ ئێران‌و سوریادا لە رووی قەبارەو دابینکاری سەربازییەوە تا سەرەتای نەوەدەکان، جیاوازییەکی بەرچاوییان نەبوو[2]. هاورێ لەگەڵ ئەمەدا، تورکیا لە هەشتاکان رەچاوی بنەمای دراوسێ باشی‌و پەیوەندییە جۆراوجۆرەکانی لەگەڵ سوریاو ئێران‌و هاوکات ململانێ نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی جەنگی ساردی لە رۆژهەلأتی ناوەڕاست دەکرد، هەر بۆیە چارەسەری سەربازی لە دژی ئێران‌و سوریا بەکار نەدەهێنا. بەلأم بە پەیدابوونی هەرێمی کوردستان‌و لە سایەی تاك جەمسەریدا، تورکیا لە شەری دژە (پ.ك.ك) قازانجێکی گەورەی کرد، کە خاکێکی بە پیت‌و دەرگایەکی ئاوەلأی بۆ پەیدا بوو بۆ لەشکرکێشییەکانی. هاوکات هەرێمی کوردستانی وەك گیرفانێك لە نێوان سوریاو ئێران بەکارهێنا، بۆ فشارخستنە سەر ئەو دوو دەوڵەتە بە تایبەت لە پرسی (پ.ك.ك)دا.

کاریگەریی ئەم پرۆسە سەربازیانەی تورکیا بە هاریکاری ئیسرائیل، لە ساڵی ١٩٩٧، رۆڵێکی گرنگی بینی لە ساغکردنەوەی ململانێکان بە قازانجی تورکیاو ئیسرائیل. سوریاو ئێران هەر زوو درکیان بە کاریگەریی ئەو لەشکرکێشیانە کرد بە تایبەتی لەشکرکێشی ١٩٩٧. عەلی ئەکبەر ویلایەتی بۆ ئەم مەبەستە سەردانی دیمەشقی کرد لە ٧ی مایۆی ١٩٩٧لە دیمەشقەوە ئامانجی سەردانەکەی راگەیاند، کە لەپێناو هەماهەنگی‌و یەکخستنی کاری نێوان هەردوو دەوڵەتە لە دژی ئەو لەشکرکێشیە، کە وەك فشار لە دژی سوریاو ئێران

---

[1] احمد حسين: المصدر السابق، ص١٩٧-١٩٨.

[2] بروانە خشتەی ژمارە ( ١)

بەکار دێت. لەگەڵێدا خدام بە پێشێلکاریو داگیرکردنی خاکی عەرەبی ناویبردو ئەمەی بە هەرەشەیەکی تورکی ئیسرائیلی بۆ سەر دەوڵەتە عەرەبییەکان لەقەڵەم دا[1]. وەزیری دەرەوەی ئێران کەمال خەرازی سەبارەت بە پشتێنەی ئاسایش وتی: ئێران ناتوانێت ئەوە پەسەند بکاتو ئەمە پێشێلکردنی یەکێتی خاکی عێراقەو ئێران دژی دابەشبوونی ئەم دەوڵەتەیە[2].

هەموو ئەمانە ڕێژەی مەترسیو دوودڵی ئێرانو سوریا لە پرۆسە سەربازییەکانی ساڵی ۱۹۹۷دا دەردەخەن، بەلام ئەنجامی ئەم پرۆسە سەربازییە نزیکەی ۷ هەزار گەریلای (پ.ک.ک) چونە خاکی ئێرانەوە[3]. بەمەش گرنگترین کارتی لە دەستی سوریا دەرهێنا، ئەویش کارتی (پ.ک.ک) بوو، کە وایکرد سوریای خستە ناو نیمچە بازنەیەکی سەربازی تۆکمە کە بواری جوڵەکردنی بە تەواوی سستو لاواز کرد. بۆیە ڕاستەوخۆ دوابەدوای ئەم ئەنجامە سەربازیانەی تورکیا لە هەرێمی کوردستان، تورکیا سوپای لە ئۆکتۆبەری۱۹۹۸ لە سەر سنورەکانی لەگەڵ سوریادا مۆڵ کرد ، سوریای تۆمەتبار کرد بەپشتگیریکردنی تیرۆر دژی تورکیاو داڵدەدانی ئۆجالانو فەراهەمهێنانی سەربازگەی مەشق بۆ (پ.ک.ک). لەمبارەیەوە تەنگژەیەکی سیاسی ئاڵۆز لەنێوانیان پەیدا بوو. دیمریل ڕایگەیاند، کە تۆڵە لە سوریا دەکاتەوە. سەرەك ئەرکانی سوپا وتی: "تورکیا لەباری شەڕێکی ڕانەگەیەندراو دایە لەگەڵ سوریا"و مۆڵەتی (٤٥) ڕۆژی بەسوریادا بۆ بەدەستەوەدانی ئۆجالان، لە بەرامبەردا سوریا درکی بە بەهێزی سوپای تورکیاو هاوپەیمانە ئیسرائیلیەکەی کرد. سەرئەنجام ڕێکەوتننامەی ئەدەنەی لە۲۱ی ئۆکتۆبەری۱۹۹۸ لەگەڵ تورکیا واژۆکرد. بەو پێیە سوریا بەڵێنی دا تەواوی سەربازگەی (پ.ک.ک) لەخاکەکەی دابخاتو ڕێگەی نەدات خاکەکەی بەکاربهێنرێت بۆ هێرشکردنە سەر تورکیا، زیاتر لەوە سەرکردەکانی دەربکات، لەم بارەوە هاریکاری ئاسایشی لەگەڵ تورکیا دەکات، تورکیا لای خۆیەوە جەختی لەسەرئەوە کردەوە

---

[1] عايدة علي سري الدين: دول المثلث بين فكي الكماشة التركية الاسرائيلية، ص ص ٢٥١، ٢٥٤.

[2] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد(٧٥٩)، ٢٧/ ١٩٩٧/١٠

[3] BAYRAM SİNKAYA :op. cit: p81

ڕێگا بەهیچ چالاکیەك دژی سوریا لە ناوخۆی دەوڵەتەکەی نەدات[1]، هەر لەم ڕێکەوتنە سوریا (پ.ك.ك)ی وەك ڕێکخراوێکی "تیرۆریستی" ناشەرعی سەلماند[2]، لەکۆتایی ئەم ڕێکەوتنە گەورەترین کاریگەریی لەسەر هەرێمی کوردستان، لاوازبوونو کپبوونی چالاکیەکانی (پ.ك.ك) بوو هەروەها نزیك بوونەوەی وادەی دەستگیر کردنی ئۆجالان بوو، کە دوای ئەوەی سوریا دەسبەرداری بوو، پەنایبردە بەر ڕوسیاو ئیتالیا، یۆنان، دواجار لە ١٥ی فەبرایری١٩٩٩ لەکینیا دەسگیرکراو درایە دەست تورکیا[3].

لە دوای سوریا، هەرەشەکانی تورکیا ڕووەو ئێرانن ئاراستە کرانو ئۆپەراسیۆنی سەربازی تورکی لە سەر سنوری ئێران لە دژی (پ.ك.ك) ئەنجام درا. لەم بارەیەو ئێران نوێنەری تورکیای لە تاران بانگهێشت کردو پێیراگەیاند کە فرۆکەکانی تورکیا سنوریان بەزاندووەو لەو سەروبەندەدا ٧ ئێرانی سیڤیل کوژراون[4]. لە وەلآمدا سەرۆك وەزیرانی تورکیا بولەند ئەجەڤید لە یۆلیۆی ١٩٩٩ وتی" ئێمە چەند داوایەکمان لە دژی ئێران هەیە، (پ.ك.ك) لە سوریا بەرەو نەمان دەچێت، بەلآم پێدەچێت ئێران جیگای سوریا بگرێتەوە. ئێران (پ.ك.ك) حەشار ئەدات. ئەم هەڵوێستە گونجاو نییە لە پەیوەندی باشو هاوڕێەتیمان". ئەندامی لیژنەی کاروباری بەرگری لە پەرلەمانی ئێران بەهمەن ئاقایان وتی " ئەم هێرشانەی تورکیا ستراتیجێکی نوێی تورکیایەو سیناریۆکەی لە لایەن ڕۆژئاواوە داڕێژراوە"[5].

---

[1] خليل على مراد: دوافع التحالف التركي – الصهيوني، ص٧١.

[2] هدى درويش: العلاقات التركية اليهودية وأثرها على البلاد العربية، الجزء الثاني، دار القلم، دمشق، ص٢٠٤.

[3] للمزيد من المعلومات: انظر: خليل على مراد: العلاقات السورية–التركية في ضوء أزمة أوج ألان، تشرين الاول، أوكتوبر، ١٩٩٨، مجلة (أوراق تركية) معاصرة، مركز الدراسات التركية – جامعة الموصل، عدد ١٦، ٢٠٠١، ص ٧٢.

[4] الانصات المركزى، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (١٢٢٥)، ١٤/٥/١٩٩٩

[5] BAYRAM SİNKAYA :op. cit: p81

لە ئۆگستۆسی ١٩٩٩ لیژنەی بالای ئاسایشی تورکیا- ئێران لە ئەنکەرە پێکهات. ڕێکەوتن لەسەر دالدەدانی (پ.ك.ك)و (ر.م.خ). هەروەها پاراستنی سنورە ناوچەییەکان[1]، وەك توێژەرێکی تورك دەڵێت لەسەر دانەمەزراندنی دەوڵەتی کوردی ڕێکەوتوون[2].

لێرەوە دەگەینە ئەو باوەرەی، کە ڕێکەوتنی تورکیاو ئیسرائیل گەلێك لە ئامانجەکانی خۆی پێکا، کە لە گرنگ ترینیی بە لای تورکیاوە، بریتی بوو ڕێگرتنی سوریا لە دەوڵەتانی ناوچەیی بۆ پشگیریکردنی (پ.ك.ك). لە لایەکی تر ڕێکەوتنی ئەدەنە لە ساڵی ١٩٩٨ سەرکەوتنی هاوپەیمانی ئیسرائیلی-تورکی بوو، چونکە سەرکەوتنی بەسەر رکەبەری سوریو ئێرانی بەدستهێنا بە بێ ئەوی ئەوان بتوانن هاوپەیمانی سەربازی دژی تورکیاو ئیسرائیل ڕێکبخەن[3]. وێرای ئەمە دەرکەوت ئەو دەوڵەتانەی، کە پشگیری (پ.ك.ك)یان دەکرد تەنها وەك فشارێك لە پەیوەندییەکانی خۆیان بەرامبەر تورکیا بە کاریان دەهێنا. حکومەتی ئیسرائیل لەم نێوەندەدا توشی ڕەخنەی ناوخۆیی بووەوە. بە تایبەت دوای ئەوەی کە شێوازو پلانی دەسگیرکردنی ئۆجالان ئەوەی دەرخست، کە ئیسرائیل ڕۆڵی گرنگی لە گرتنی ئۆجالاندا بینیوەو (پ.ك.ك) هەرەشەی هێرشیان بۆ سەر ئیسرائیل کرد. ڕۆژنامەی جیروزلیم پۆست "Jerusalem Post" لە ١ی مارسی ١٩٩٩، ئەم ڕێکەوتنەی بە شکست بۆ ئیسرائیل ناوبرد، چونکە خۆی خستۆتە کێشەیەکەوە لە دژی کورد کە پێشتر کێشەی ئەو نەبووە. بەهۆی ئەم کێشەیەوە بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل لە جیهان کەوتۆتە بەر مەترسی هەرەشەکانی (پ.ك.ك)[4]. سەرەنجامو بە تێپەربونی کات دەرکەوت، کە (پ.ك.ك) بە لەدەستدانی پشگیرییە ناوچەیەکان، ئەگەر بۆ ماوەیەك لاواز بوو بێت، بەلام

[1] لیونر مارتن: المصدر السابق، ١٨-١٩

[2] BAYRAM SİNKAYA :op. cit: p81

[3] أوفرا بنجيو و جنسر أوزكان: المصدر السابق، ص ٤٩-٥٠.

[4] Bulent Aras: op. cit.

لەناو نەچوو، چونکە سیاسەتی نابەجێی تورکیا بەرامبەر بە کورد، ماکینەی بەرهەمهێنانی (پ.ك.ك) بوو، نەك دەوڵەتانی دراوسێ.

# تەوەری دووەم
# سیاسەتی هاوبەشی ناوچەیی بەرامبەر هەرێمی کوردستان

هەرێمی کوردستان لە لایەن دەوڵەتە دراوسێکانەوە، سێ جار هەڵوێستی هاوبەشی لە بەرامبەری گیراوەتە بەر. یەکەم جار لە کاتی کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١دا بوو. دووەمین هەڵوێست لە کاتی راگەیاندنی سیستەمی فدراڵی لە ساڵی ١٩٩٢دا بوو، سێیەمین و دواهەمین هەڵوێست لە سەروبەندی هێرشی ئەمریکا بوو بۆ سەر عێراق لە ٢٠٠٣دا.

دەتوانین بڵێین یەکەمین هەڵوێستی ئەرێنی دەوڵەتە دراوسێکان بەرامبەر بە کێشەی کورد لە کاتی کۆرەوەکەی ساڵی ١٩٩١دا بوو. بە پێی ئەو هەڵوێستە تورکیاو ئێران داوای چارەسەرکردنی کێشەی ئاوارە کوردەکانیان کرد، دژایەتیی خۆشیان بۆ سیاسەتی عێراقی دەربری. ئەوەیان خستە روو، کە چارەسەرکردنی کێشەی ئاوارەکان ئاسایش و سەقامگیری ناوچەکە دەپارێزێت. لەسەر ئەو بنەمایە بریاری ٦٨٨ی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە لە ٥ی ئەپریلی ١٩٩١ دەرچوو. بە واتایەکی تر کێشەی کورد وەك پرسێك کە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە سەقامگیری و ئاسایشی ناوچەیی دەخستە بەر هەرەشە، بە پێچەوانەی ئەم مێژووە، لە ساڵی ١٩٩١دا چارەسەرکردنی کێشەی ئاوارەکانی کورد، ئاشتی و سەقامگیری لە ناوچەکەدا بەدیهێنا[1].

---

[1] هێرش عەبدوڵڵا حەمە کەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٣-٩٤.

بریاری ٦٨٨ لە جێبەجێکردندا گەشە سەندنی زۆری بەخۆوە بینی. لەو بریارەدا بە هیچ شێوەیەك باسی دەستوەردانی سەربازی نەکردبوو، بەڵام ئەمریکا بە پشتبەستن بەو چەمکە یاسایەی تیایدا هاتبوو،" گێڕانەوەی ئاشتی جیهانیو ئاسایش"، هەروەها لەسەر بنەمای داواکاری ئێرانو تورکیا، ئەو کارەی کرد. بە مانایەکی تر ئامانجی بڕیارەکە بریتی نەبوو لە پاشەکشە پێکردنی دەسەڵاتی سەدام لە هەرێمەکە، بەڵکو بریتی بوو لەوەی، کە هەرێمی کوردستان نەبێتە بنکەیەك بۆ تێکچونی، ئاسایشو سەقامگیری ناوچەکە. لە ١٧ی ئەپریلی ١٩٩١ لە سەر بانگێشتی تورکیا هێزی هاوپەیمانان بە ناوی (OPC) لەسەر سنورەکان دامەزران. ئەم هێزە کاری ئەوە بوو، یارمەتییە مرۆییەکان بگەیەنێتە دەستی ئاوارەکانو نەهێڵێت عێراق بەرامبەریان ستەمو زۆرداری ئەنجام بدات. هەرچەندە تورکیا ڕێگای کارکردنی بەو هێزە دا، کە لە خاکی تورکیاوە هەرێمەکە بپارێزن، بەڵام بە بەردەوامی لە بەکارهێنانی ئەم هێزی هاوپەیمانان لە بوارێکی ترو بۆ مەبەستێکی تر دوو دڵ بوو. بۆ نموونە ترسی ئەوەی هەبوو کە ئاراستەی کارکردنی ئەم هێزە لە پاراستنی کوردی عێراق بۆ پاراستنی کوردی دەوڵەتێکی تری رۆژهەڵاتی ناوەراست بگۆردرێت بە تورکیاشەوە. لە لایەکی تر بە گومان بوو لەوە کە ئەم هێزە کارو چالاکیەکانی لەژێر دەسەڵاتی تەواوەتی تورکیادا نەبێت. راپۆرتە تورکیەکان باسیان لەوە دەکرد، کە ئەم هێزە پەیوەندی دروستکردووە لەگەڵ هێزە کوردییەکان لە دەرەوەی سنووری کاری خۆی. بۆ نموونە یارمەتییە مرۆییەکان لەو ناوچانە فرێدەداتە خوارێ، کە لە بن دەستی (پ.ك.ك)دان[1].

بە هەمان شێوە ترسی ئێران لە ئەرکو کاری ئەو هێزە رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبوو، بەتایبەت لەوەی، کە ئیسرائیلو ئەمریکا ئەو هێزە بۆ زیانگەیاندن بە ئێران بەکار بهێنن. سوریا بەهۆی کەمی سنوری لەگەڵ هەرێمی کوردستان شەپۆلی ئاوارەبوون رووی تێنەکرد، بەڵام نیگەران بوو لە پاراستنی کورد لە لایەن هاوپەیمانەکان. لەم سۆنگەیەوە ترسو گومانێکی ناوچەیی لە لایەن دەوڵەتانی دراوسێوە سەری هەڵدا بەرامبەر بە ئەرکو پرۆژەی (OPC) لە هەرێمی کوردستاندا. پەرەسەندنە ناوخۆییەکانی هەرێمی کوردستان لەوکاتەدا مایەی

---

[1] Ýdris DEMÝR: op. cit.

سەرنجدانی دەوڵەتە دراوسێکان بوو. بەغداد گرەوێکی دۆڕاوی لەسەر هەڵوێستی دەوڵەتە ناوچەییەکان کرد، سەبارەت بە هەرێمی کوردستان. سەدام حسین لە یادی ١٧ ساڵەی بەیاننامەی ١١ی ئازاری رایگەیاند، کە "سەرکردە کوردەکان کەسانی لێوەشاوە نین بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکە. رۆژئاوا ئەگەر دەوڵەت بە کوردستان ببەخشێت، ئەوا بڕیاری بەشکردنی ئێران و تورکیا ئەدات چونکە ئەگەر لە کوردستانی عێراق دەوڵەت پێکبێت، ئەوا رەنگدانەوەی لەسەر ئێران و تورکیاش دەبێت"[1]. لەم روانگەیەوە بەغداد دەسەڵاتی سەربازیو کارگێری کێشایەوەو بەو ئامانجەی، کە دەوڵەتە ناوچەییەکان رێگر دەبن لەبەردەم دەسەڵاتی خۆبەخۆی کوردی لە هەرێمەکە. بەڵام زنجیرە رووداوەکانی هەرێم ئەوەی سەپاند، کە هەرێمی کوردستان پرسی ناوخۆیی عێراق تێپەڕاندو خۆی کردە پرسێکی ناوچەیی، بە جۆرێك دەوڵەتە ناوچەییەکانی دەستبەست کرد لە روو بەروو بونەووەیدا. کە گرنگترینیان روداوەکانی مانگی سێپتەمبەرو ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ بوو. لە مانگی سێپتەمبەردا هێزی پێشمەرگە لە خۆئامادەکردندا بوو بۆ جەنگ لە دژی (پ.ك.ك)، هاوکات (٢٣٤) کەسایەتی عێراقی لەهاوینەهەواری (سەلاحەدین)ی سەر بە پارێزگای هەولێر لە هەرێمەکە، دوای کۆبونەوەیەکی دوو رۆژی سەبارەت بە ئایندەی عێراق، لە ٢٧ی سێپتەمبەر١٩٩٢دا (ك.ن.ع) پێکهێنا، کە ئامانجی گۆڕینی رژێمی بەغدادو دامەزراندنەوەی سیستەمێکی نوێ بوو بۆ عێراقی دوای سەدام حسین[2]، دواتر لە ٤ی ئۆکتۆبەری١٩٩٢ پەرلەمانی کوردستان جاڕنامەی فیدراڵی وەك سیستەمێك بۆ داڕشتنی پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستان و دەسەڵاتی ناوەندیی عێراق ڕاگەیاند[3].

ئەگەر روداوەکان ساڵ و نیوی هەرێمی کوردستان کۆبکەینەوە لەراپەرینی مارسی ١٩٩١ دەسپێدەکات و بەداوی خۆیدا کۆرەوی مانگی ئەپریل، بڕیاری ٦٨٨ لە هەمان مانگدا، دەستپێکردنی لەشکرکێشی تورکیا لە ئۆگستۆسی ١٩٩١، دانوستانی بەغدادو هەولێر لە

[1] جريدة الجمهورية، العدد(٨١٤٠)، ١٩٩٢/٣/١٢.

[2] علي الشمراني: صراع الاضداد، ص ص٢٥٨– ٢٦٣ .

[3] ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق: پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی سێیەم، ل٢٠٢.

ئـەپریل تـا مارسـی ١٩٩٢، هەلبژاردنـەکانی هـەرێم لـە مـایۆی هـەمان سـاڵ، کـۆنگرەی بەرهەڵسـتکارانی عێراقـی لـە سـێپتەمەبری ١٩٩٢، جارنامـەی فـدراڵی لـە لایـەن هـەرێمی کوردستان. هەموو ئەم رووداوانەی هـەرێم لـەم مـاوە کورتـەدا، زۆر نـاوازەو دەگمـەن بـوو لـە مێژووی ٧٠ ساڵەی عێراق‌و دەوڵەتانی دراوسێ‌و کێشەی کورددا. هەموو ئەمانە هۆکار بوون بۆ سەرهەڵدانی بیرۆکەی هەماهـەنگی ناوچـەیی بـە دەسپێشـخەری تورکیـا. ئـەوە بـوو سـەرۆك وەزیرانی تورکیا، دیمریل لـە ٢٦ی ئۆکتۆبـەری١٩٩٢ سـەردانی ئێرانـی کـرد بـۆ کۆبوونـەوەو رێکەوتن لە سـەر شـێوازی گونجـاو سـەبارەت بـەرێگرتن لـە سـەربەخۆبوونی کـوردو پاشـان دۆزینەوەی رێگە چارەیەك بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەسەلاتی کوردیدا، کە بەردەوام دەوڵەتانی ناوچەیی توشی شۆك دەکرد. بۆ ئەم مەبەستە دوور لەهـەموو جیـاوازی‌و نـاکۆکی نێوانیان، کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی تورکیاو ئێران‌و سوریا بە ناوی کۆبوونـەوەی سـێ قۆڵی لە ١٤و١٥ی نۆڤەمبەری ١٩٩٢ لە ئەنکەرە بەسـترا. ئـەم کۆبونەوەیـە سـەرەتا بـوو بـۆ کۆبوونەوەکانی تر، کە هەر شەش مانگ جاریك‌و هەر جارەی لە پایتەختی دەوڵەتێك ئـەنجام دەدرا. ویلایەتی‌و فاروق ئەلشـەرع، وەك وەزیرانـی دەرەوەی ئێـران‌و سـوریا بـە هەمیشـەیی بەشدار بوون، حیکمـەت چـەتین لـە یەکـەمین‌و دووەمـین کۆبونـەوەداو مومتـاز سوسـیال لـە سێیەم تا پێنجـەم کۆبونـەوە، وەك وەزیرانـی دەرەوەی تورکیـا بەشـداریان کـرد. دووەمـین کۆنگرە لە دیمەشق بوو لە ١٠ی فەبایری ١٩٩٣. کۆنگرەی سێیەم لە ئۆگستۆسی ١٩٩٣ بـوو لە تاران‌و چوارەمین لـە فـەبرایری ١٩٩٤ بـوو لـە ئەنکـەرەو دوا وێسـتگەی کۆبونـەوەکان لـە دیمەشق بوو لە ٢٣ی ئۆگستۆسی ١٩٩٤[١].

ئـەم دەوڵەتانـە لـە یەکـەم کۆبونـەوەدا لەسـەر چـەند خاڵێـك رێکـەوتن، کـە لەسـەرجەم کۆبونەوەکانی تردا جەختی لەسەر دەکرایەوە. ئەو خاڵانەش بریتی بوون لە:

---

[1]Anoushiravan Ehteshami and Raymond A.Hinnebusch: op. cit, p193, 207.

تطورات المسألة الكردية في العراق والتركيا، مجلة (الشؤن تركية)، اعداد: محمد نورالدين، عدد(٣)، ١٩٩٢، ل٢٣.

أ. بەرهەڵستیکردنی دابەشبوونی عێراق‌و پاراستنی یەکیەتی‌و سەروەری ئەو دەوڵەتەو ڕەتکردنەوەی فیدڕاڵی.

ب. هەر هەوڵێك لەپێناو دابەشبوونی عێراقدا بێت، ئەنجامی ترسناکی لەسەر ئاشتی‌و سەقامگیربوونی ناوچەکە پەیدا دەکات.

ت. داهاتووی عێراق، گەلی عێراق بڕیاری لەسەر دەداتو (ك.ن.ع) نوێنەری تەواوی گەلی عێراق نییە[1].

هەرچەندە ئەمە بڕیارە ئاشکراکانی ئەو کۆبونەوەیە بوو، بەلاّم لە پشت ئەم بڕیارانەوە ئامانجی ئەم کۆنگرەیە وەك ڕۆژنامەی میللییەت نوسی بوو، بریتییە لە ناردنی نامەیەك بۆ ڕۆژئاواو بۆ کورد، کە " ئێمە وەك هێزی ڕەسەنی ناوچەکە، ڕێگا بە سەرهەڵدانی هیچ کیانێك لە ناوچەکە بەبێ ڕەزامەندی ئێمە یان لە دەرەوەی ئیرادەی ئێمە، نادەین ". لە لایەکی تر ئامانجی ئەم کۆبونەوانە بریتی بوون لە :

- هەرێمی کوردستان وەك کارتی فشار لە پەیوەندیی نێوان هەرسێ دەوڵەتەکە بەکارنەهێنرێت.
- کۆنترۆڵکردنی پەرەسەندنی سیاسی‌و سەروەری لە هەرێمی کوردستان.
- نزیککردنەوەی پرسی کوردی لە سیاسەتی ناوچەیی‌و دوورخستنەوەی لە سیاسەتی نێودەوڵەتی.
- هەماهەنگی بۆ ئیحتوا کردنی (پ.ك.ك).
- ڕەتکردنەوەی تەواوەتی بۆ گۆڕینی سنوورە ناوچەییەکان بە هۆی بابەتی کورد یان هەر خواستێکی جوداخوازی تر[2].

تاڵەبانیش ئامانجی یەکەم کۆنگرەی کورت کردەوەو وتی: " من وای بۆ دەچم ترسی ئەوان لە دیموکراسیەت‌و فدرالییە"[1]، وەك ئاماژەیەك بۆ عێراقی دیموکراسی‌و هەرێمی کوردستانی فدراڵی.

---

[1] تطورات المسألة الكردية في العراق والتركية، ص ٢٣.

[2] عقيل سعيد محفوض: المصدر السابق، ص ص ٢٨٢-٢٨٣

لە بریارەکان‌و لە ئامانجەکانیشەوە ئەوە دەرکەوت، کە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەو دەوڵەتانە بریتی بوو لە رەتکردنەوەی دەوڵەتی کوردی لە هەرێمی کوردستان، کە ئەم پرسە هۆکاری نزیکبونەوەی ئەو دەوڵەتانە بوو لەو کاتەدا. رۆژنامە تورکییەکان سەبارەت نزیکبونەوەو رێکەوتنی سوریاو تورکیا لەسەر پرسی کورد بە گشتی‌و هەرێمی کوردستان بە تایبەتی لەو کۆبونەوانەدا، بە سەرهەڵدانی سەردەمێکی نوێ لە پەیوەندییەکانی سوریاو تورکیا ناویان برد[2]. وێرای ئامادەیی ئەم پرسە لە کۆبونەوە سێ قۆڵیەکاندا، لە کۆبونەوە دووقۆڵیەکانی نێوانیاندا دەوڵەتی کوردی جەختی لەسەر دەکرایەوە. بۆ نموونە لە میانەی سەردانی سەرۆك وەزیرانی تورکیا، دیمیریل بۆ سوریا لە ساڵی دا۱۹۹۳، رۆژنامەی (البعث) لە مانشێتدا نوسی، کە ئەسەدو دیمیریل گفتوگۆیان لە بارەی هەرەشەی پارچەبونی عێراق لەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرد. لەم بارەیەوە دیمیریل لە چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی وتی: پرسی کوردەکانی عێراق تەوەرێکی سەرەکی چاوپێکەوتنمان بوو لەگەڵ ئەسەدو لایخۆیەوە ئەسەد هۆشداریدا، کە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەبێتە کێشە بۆ سوریاو تورکیاو عێراق[3]. هاوشێوەی ئەم سەردانە، کاتێك دیمیریل وەك سەرۆك کۆمار چوو بۆ ئێران لە ١٥–٢٧ی یۆلیۆی ١٩٩٤، سەرەکیترین تەوەری گفتوگۆکانی لەگەڵ رەفسەنجانی، پرسی دەوڵەتی کوردی بوو لە هەرێمی کوردستان[4]. هاوکات چوونی خەددام بۆ تاران‌و گەیاندنی نامەی ئەسەد بە رەفسەنجانی، لە ٢ی سێپتەمبەری ١٩٩٥ سەبارەت بە سەرهەڵدانی پلانی ئەمریکی–(ك.ن.ع)[5] و پرۆژەی فدراڵی ئەردەن بوو بەرامبەر هەرێمی کوردستان‌و عێراق[1].

---

[1] صلاح بروارى: المصدر السابق، ص ص٣٤٠–٣٤١

[2] İdris DEMİR : op. cit.

[3] جريدة البعث. ٢٢/ ١٩٩٣/١. نقلا عن، دار البعث. ١٨٤٣٥

[4] İdris DEMİR: op. cit.

[5] ئەم پلانە بریتی بوو لە رێکخستنی کودەتایەکی سەربازی لە ناو بەغداد بە بەشداری لیوا وەفیق سامەرائی. لە هەرێمی کوردستانیش (ی.ن.ك) هێرش بکاتە سەر کەرکوکو (پ.د.ك) هێرش بکاتە سەر موسل. رێکخەری ئەم پلانە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بوو بەسەرپەرشتی دەستگای هەواڵگری ئەمریکا. ئەم پلانە لە مارتی ١٩٩٥ چووە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، چونکە لەناو بەغداد

کاردانەوەی هەرێمی کوردستان لە رێگای پەرلەمانی کوردستانەوە بوو، کە نامەیەکی بۆ ولاّتانی تورکیاو ئێران و سوریا نارد، ناوەڕۆکەکەی ئەم خالاّنەی لەخۆگرتبوو:

- هەڵبژاردنی پەرلەمان، لە ئەنجامی کشانەوەی دەزگا کارگێڕییەکانی ڕژێمی عێراق بوو.
- حکومەتی کوردستان دەستناخاتە کاروباری ولاّتانی دراوسێ، پێی باشە کێشەکانی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا بە رێگای ئاشتی چارەسەر بکات.
- فیدراڵی کوردستان عێراق پارچەپارچە ناکات، بەڵکو پاراستنی یەکێتیی عێراق دەپارێزێت[٢].

دەتوانین بڵێین ئەو کۆبونەوانە ئەو ئامانجەی پێکا کە رێگری لە گەشەسەندنی سیستەمی سیاسی هەرێمی کوردستان گرت. هەروەها توانی بە زنجیرە رێوشوێنێکی ئابووری و دیپلۆماسی گەمارۆی هەرێم بدات، دواجاریش وەك دەسەلاّتێکی شەرعی و سیاسی مامەڵە لەگەڵ هەرێمەکەدا نەکرد. بەلاّم ئەو ئامانجەی نەپێکا، کە فەراهەمهێنانی ئاسایش و سەقامگیری بوو لە ناوچەکەدا، چونکە سەرباری رێکەوتنی هەرسێ لایەن لەسەر پاراستنی یەکێتیی خاکی عێراق، بەلاّم ئەو دەوڵەتانە بە تایبەت تورکیاو ئێران، هیچیان متمانەیان بە سیاسەتی ئەوی تر نەبوو لە هەرێمەکەدا، ئەمەش وایکردبوو ئەو دوو دەوڵەتە لە رکەبەریدا بن. ئێران ترسی لە زیاد بونی کاریگەریی تورکیا هەبوو لە هەرێمەکەدا کە بەسەر دوو تەرزدا دابەش بوو. تەرزی یەکەم بەهۆی پەیوەندی بەتینی تورکیا لەگەڵ ئەمریکاو ئیسرائیل، لەوە دەترسا سیخورو هەواڵگریەکانی ئەوان چالاکی لە هەرێمی کوردستان دژی ئێران بکەن. تەرزی دووەم، ئەوە بوو کە ئەگەر تورکیا دەست بەسەر ناوچە نەوتییەکانی هەرێمی کوردستان بە موسڵ و کەرکوکەوە بگرێت، ئەوا تەرازوی هێز بە قازانجی تورکیا لە ناوچەکە دەگۆڕێت. بە هەمان شێوە تورکیا لە کاریگەریی ئێران بەسەر سەرکردە عێراقیەکان بە

---

پلانەکە ئاشکرا بوو. هاوکات لە دەرەوەش (پ.د.ك) لە دوا ساتەکان بەشداری نەکرد، چونکە سووربونێکی تەواوەتی ئەمریکای بەو پلانەوە نەبینی. اندرو کوکبورن و باتریك کوکبورن: المصدر السابق، ص ٣١١-٣١٨.

[1] Anoushiravan Ehteshami and Raymond A.Hinnebusch : op. cit, P 220

[٢] ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان: پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی پێنجەم، ل١٧٢.

گشتیو سەرکردایەتی کورد بە تایبەتی دەترسا. هەروەها دوودڵ بوو لە بونی (پ.ك.ك) لە سنووری هەژمونی ئێرانی لە هەرێمەکەدا، هەروەها لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی کوردی لە هەرێمەکە بە پشتیوانی ئێران دەترسا کە لە باشورەوە دەوری تورکیا بدات[١].

بۆیە یەکێك لەو هۆکارانەی وایکرد تورکیا لەو کۆبونەوانە پاشەکشە بکاتو لە ئیسرائیل نزیك بێتەوە، ئەویش بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێکانی بوو لەگەڵ دەوڵەتانی ئێرانو سوریا لە هەرێمی کوردستان لە رێگای لەشکر کێشییەکانییەوە. لەم بارەیەوە، وەزیری دەرەوی سوریا محەمەد سەلمان وتی: "کۆبونەوەی سێ قۆڵی، کە تایبەت بوو بە هەرێمی کوردستان، لە ساڵی ١٩٩٥ بەدواوە کۆتایی هات، کە بەهۆی لەشکرکێشی تورکیاو رێکەوتنی سەربازی تورکیاو ئیسرائیل بوو"[٢].

بە رای ئێمە هۆکارێکی تری سەرنەکەوتنی ئەم کۆبوونەوانە ئەو گەمارۆ ئابوریو دپلۆماسسیە بوو، کە بەسەر دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە سەپێنرا. بەمەش مامەڵەی ئەو دەوڵەتانە لەگەڵ دەسەڵاتی حکومەتو پەرلەمانی کوردستان نەبوو، بەڵکو پەیوەندی سیاسیان لەگەڵ پارتە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان دامەزراند بە تایبەت (پ.د.ك)و (ی.ن.ك). ئەمە وایکرد هەر پارتەو لە دەرەوی دەسەلاتی حکومەتو پەرلەمان، پەیوەندیی سەربەخۆ لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکانی پەیدا بکات، بە جۆرێك لە کاتی سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆ لە مایۆی ١٩٩٤دا، زۆر بە خێرایی تێکەڵی ململانێ ناوچەییەکان بوونو هەر پارتەو بریکاری سیاسیو سەربازی دەوڵەتێکی ناوچەیی بوو لە هەرێمەکەدا. ئەمەش هۆکارێکی گرنگی قوڵبونەوەی کێشە ناوخۆییەکانی هەرێمی کوردستان بوو کە ئەنجامەکەی بووبە هۆی تێکچونی سەقامگیریو ئاسایشی ناوچەیی. بە واتایەکی تر کاردانەوی سیاسەتی ناوچەیی لە هەرێمی کوردستان، هۆکاری سەرەکی تێکچونی پەیوەندییە ناوچەییەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو بە جۆرێك بە دەسپێکردنی شەری ناوخۆ لە هەرێمی کوردستان، دەسوەردانو لەشکرکێشی لە هەرێمەکەدا سەری هەڵدا، کە بوو بە

---

[1] BAYRAM SİNKAYA :op. cit: p 38, P73

[٢] الانصات المركزي، نشرة خبرية معلوماتية يومية ، العدد (٧٥٩) ٢٧/ ١٩٩٧/١٠.

هۆی بەریەککەوتنی بەرژەوەندییە ناوچەییەکان لە هەرێمی کوردستان، کە رێگای بۆ گواستنەوەی ململانێی نێوان ئەو دەوڵەتانە خۆش کرد.

سێیەمین هەڵوێستی هاوبەشی دەوڵەتانی ناوچەکە بەرامبەر هەرێمی کوردستان لە سەروبەندی جەنگی ئەمریکا لە دژی عێراق دەرکەوت. سەرەتاکانی ئەو جەنگە دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٩٨، کە کۆنگرێسی ئەمریکا بریاری گۆرینی رژێمی عێراقی دا. پاش هێرشی رێکخراوی ئەلقاعدە بۆ سەر تاوەرە بازرگانیەکانی ئەمریکا لە ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، گومانی ئەمریکی بەرەو ئەو باوەرە برد، کە پەیوەندییەك هەیە لە نێوان ئەو رێکخراوەو دەوڵەتی عێراق. ئەمە وایکرد لە دوای هێرشی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان و رووخانی رژێمی تالیبان– ئەلقاعدە لەو دەوڵەتە، هەوڵی ئەمریکا بۆ کۆدەنگی نێودەوڵەتی بۆ رووخانی رژێمی عێراقی دەستی پێکرد. سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆشی کور لە ٢٢ی یۆلیۆی ٢٠٠٢ رایگەیاند، کە پێویستە رژێمی عێراقی بگۆرێت و ئەمریکا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هەموو رێگایەك دەگرێتەبەر[١]. ئەو بوو لەم پێودەنگەدا ئەمریکا دەستی کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ تورکیا بۆ کردنەوەی بەرەی جەنگ لە باکورەوە لە دژی عێراق.

ئەم هەوڵانەی ئەمریکا کاتێکدا بوو، کە عێراق پەیوەندیە ناوچەییەکانی بە تایبەت لەگەڵ ئێران و تورکیاو سوریا لە پەرەسەندن و پێشکەوتندا بوو. نەوتی عێراق بە شێوەی فەرمی و نافەرمی دەگەیشتە هەر سێ دەوڵەتەکە. لە لایەکی تر ئەم دەوڵەتانە بە تێپەربونی نەوەدەکان، کەوتبوونە باری خۆگونجانەوە لە گەڵ عێراقداو هەر لە سەرەتاوە پشگیری هەوڵەکانی ئەمریکایان نەدەکرد. ئەوەش دەگەرایەوە بۆ ترسی ئەو دەوڵەتانە لە ئایندەی عێراق. هەریەك لە تورکیاو سوریاو ئێران لە میانی جەنگەکەدا هەڵوێستی تایبەتی خۆیان هەبوو.

سەرەتای هەڵوێستەکان لە تورکیاوە دەست پێدەکات. ئەمریکا خواستی بەشداریکردنی تورکیای لەو جەنگەدا هەبوو، وەك هاوبەشێکی مێژوویی و ستراتیجی خۆی لە ناوچەکە.

---

[1] Alfred B. Prados: Iraq: Former and Recent Military Confrontations With the United States, Issue Brief for Congress Received September 6, 2002, P13.

یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا پۆڵ ولفۆیتز[1]، لە سەردەمی حکومەتی ئەجەڤید سەردانی ئەنکەری کرد لە کۆتایی یۆلیۆی ٢٠٠٢، دواتر هەمان سەردانی دوبارە کردەوە لە کاتێکدا پارتی دادو گەشە پێدانAdalet ve Kalkinma Partisi (AKP) لە ٢ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢ هاتە سەر دەسەلاّت. داواکاری ئەمریکا بەکارهێنانی خاکی تورکیا بوو بۆ کردنەوەی بەرەی باکوری جەنگەکە لە دژی عێراق. لە بەرامبەردا تورکیای دڵنیا کردەوە کە ناهێڵێت عێراق دابەش بێت، دەوڵەتی کوردی دامەزرێت، تورکمان مافی لە عێراقی داهاتودا پارێزراو بێت، ئەمریکا پشگیری تورکیا لە ئەگەری سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری بەهۆی شەرەکەوە دەکات، لە ئاستی دەرەکیشدا پشگیری تورکیا لە یارمەتیە بەردەوامەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتیInternational Monetary Fund ( IFM) دەکاتەوە[2]. پرسی تورکیا بەرامبەر شەری عێراق سێ مەرجی ئابوری‌و سەربازی‌و سیاسی بوو ئەویش قەرەبوکردنەوی تورکیا بوو لە بەرامبەر هاریکاریکردنی ئەمریکا. دووەم، نەخشەی سوپای تورکیا بۆ ناردنی هێزی سەربازی بۆ عێراق. سێیەم ئەو مەرجانەی تورکیا لە عێراقی داهاتودا چین، کە ئەنکەرە والێدەکات بەکارهێنانی زەوی تورکی بۆ هاوپەیمان بە رەوا ببینێت[3].

ئەمریکاو تورکیا گرفتی ئابوریان تێپەراندو لەسەر ٢٤ ملیار دۆلار قەرزی ئەمریکی‌و ٦ ملیار دۆلار وەك دیاری ئەمریکا بۆ تورکیا رێکەوتن. پرسی سەربازی، کە تێکەڵەیەك لە مەرجی سوپاو حکومەت بوو بۆ بەشداریکردن لەو جەنگە. لە یۆنیۆی ٢٠٠٢دا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا لە کۆبونەوەیەکدا باسی رێوشوێنی چونەو ناوەوەی سوپای

---

[1] لەدایکبوی ساڵی ١٩٤٣یە لە نیویۆرك، هەڵگری بروانامەی دکتۆرایە لە زانستی سیاسیدا. چەندین پۆستی لە حکومەتی ئەمریکیدا وەرگرتووە کە دیارترینیان جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکا بوو لە سالانی (٢٠٠١-٢٠٠٥) ئێستا مامۆستاو راگرە لە زانکۆی جونز هوبکینز. http://www.moqatel.com

[2] محمد نورالدین: ترکیا الصیغة والدور، ریاض الریس للکتب والنشر،٢٠٠٨، ص ٢٤٠.

[3] Bill Park: STRATEGIC LOCATION, POLITICAL DISLOCATION:

